لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری عێراق

«دەستەی کورد»



# هەندێک
# داوەری ی بەناوبانگ

## یاخود

## (محاکمات)ی مەزن لەمێژوودا

پاڕێزەر

جمال بابان

چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق

بغداد - ١٩٨١

مطبوعات المجمع العلمي العراقي
الهيئة الكردية

# المحاكمات الكبرى
# في
# التاريخ

المحامي
جمال بابان

مطبعة المجمع العلمي العراقي
بغداد ــ ١٩٨١

له چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری عێراق
«دەستەی کورد»

# هەندێک داوەری ی بەناوبانگ

## یاخود

## (محاکمات)ی مەزن لەمێژوودا

جمال بابان

چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق
بغـداد ـ ١٩٨١

# پێشەکی

تاوانو دەستدرێژیی لەبەرەبەیانی مێژووەوە پەیدابوونو لەگەڵ ژیاندا پەروەردەبوون.جانەوەرو ئاژەڵ...یەك یەك ئەخۆنو ئەچەوسێننەوە، مرۆ یەکتر ئەکوژن ، ئازارو سزای یەك ئەدەن ، ماڵی یەکتر ئەخۆن ، مافی یەك ئەکەن بەژێر لێوەوە.... ئەمانە هەموو تاوانو دەست درێژین ، (ئاوی زۆردار سەربەرەوژوور ئەروات)و بێدەسەڵاتیش ئەڵێت (بەریشی مەردانەت قەسەم) . ئەم هەراو بەزمەی ستەمکاریو زۆرەملێو دەستدرێژییەش هەربووەو هەر ئەبێت، تا بەربەرەکانی ژیانو ئارەزووی مانەوەو چاولەدوییو حەز لەدەست بەسەرداگرتن لەناخی مرۆدا بمێنێت ... کە ئەمەش وەنەبێت تەنها هەر لەبەینی منو تۆدا یاخود ئەمو ئەودا بێتو بەس ، بەڵکو لە تێو گشت ئەندامانی کۆمەڵو لەناو (ئەم کۆمەڵو ئەو کۆمەڵ)و لەبەینی (کۆمەڵو دەوڵەت)و لەتێو (دەوڵەتان)یشدا هەیە .

جا ، بۆ ئەوەی شیرازەی ناو کۆمەڵ تێك نەچێتو پەتی ئاسایش نەپچڕێت ، نەبێت بەئاشوبو پاشا گەردانیی . هەر کەسە دەست درێژی نەکاتە سەر یەکێکی ترو ماڵو منداڵی ، یا تۆڵەی خۆی ، بەو جۆرەی خۆی ئەیەوێتو بەدەستی خۆی نەیسێنێت ، بۆ ئەوەی دەوڵەت لەسەر ڕێو شوێنێکی ڕێكو پێكو پردادو بێلایەنگیریی بڕواتو حوکمی میللەت بکات ، هەر کۆمەڵە بۆ خۆیو لە ئەنجامی تاقیکردنەوەیەکی دورو درێژدا ڕژێمێکی بۆ ڕێڕەوی خۆی دیاری کردوەو (یاسا)ی جۆر بەجۆریشی داناوە بۆ پەیڕەوی کردنو دیاریکردنی مافو ئەرکی سەرشانی هەر یەکێك لە

ئەندامەکانی کۆمەل ، کە ئەگەر لەو رێیە لایدا ، ئەوە بەگوناهبار دائەنرێت •

ئەو دەزگایەی کە راستو چەوت ، حەقو ناحەق ، مافو تاوان ••• لەیەك جیادەکاتەوە (دادگا)یەو ئەوانەی کە لە تاوان ئەپرسنەوە (دادگای سزا) یان پێ ئەلێن ، کە حاکمەکانی لە هەر شوێنە جۆرێکن ، زوربەیان لە رۆژئاوا ، ئێستا ، (سوێندخۆران یان پێ دەلێن بەرامبەر بە (دادگەر)ی ولاتانی ترو خۆمان • جگە لەوەی یاساو دادگاش هەن کە پەیوەندی ناو دەولەتانیش رێك ئەخەن [1] •

یاساو دامو دەزگای ماف پرسینەوەش دیسانەوە کۆنو دەمێکە هەن، بەلام هەریەکە لە شوێنی خۆیدا ، بەگوێرەی کاتو بارو شوێنو ••• گەلیك شتی تری ئەو کۆمەلە پێك هاتوونو وردە وردە گۆرراونو پەرەیان سەندوە ، بەلام ئەمەش هەرگیز ئەو راستیە ون ناکات کە گەلێك جار ، تاقمێك یاخود چینێك لە کۆمەلدا یاسایان کردوە بە کوتەك بەدەستی خۆیانەوە ، بۆ پاراستنی بەرژەوەندی خۆیانو لێدانی تاقم یاچینێکی تر•••

ئەم باسانەی لێرەدا پیشکەشمان کردون ، بریتین لە رووداوی گەورە کە بەدرێژایی مێژوو قەماون ، هەندێکیان بە تاوان دراونەتە قەلەم ،

---

(١) ئەمرۆ (دادگای دادی دەولەتان)ی پێ ئەلێن، شوێنەکەی ( لاهای )یە ، ناکۆکی ناو دەولەتان سەیر ئەکات لەزۆر ولاتیشدا دادگا هەیە ، ناکۆکی بەینی ئەندامانی کۆمەلو دەولەت سەیر ئەکات ، ئەو دادگایانەش بۆ رێکخستنی پەیوەندی ناو ئەندامانی هەر کۆمەلێك دائەنرێن ئەبن بە دو بەشەوە : (دادگای مەدەنی)کە سەیری مامەلەی رۆژانەی خەلكو (موادی شخصی) ئەکەن وەك کرینو فروشتنو کرێو ••• ژنهێنانو تەلاق •••و (دادگای سزا) کە ئەمیش گەلێك جۆرە بەتایبەتی لایخۆمان وەك (دادگای گەورە ــ محکمة اجنایات) و دادگای گوناح ( محاکم الجنح ) و داوەری (تحقیق) ، جگە لە هەندێك دادگای سزای تایبەتی هەن وەك دادگای عورفیو دادگای سوپاییو دادگای شۆرش•••

هەندێکیشیان لە خۆیاندا تاوانن، خاوەنەکانیان لەبەر دەمی دادگادا راگیراون بۆ داوەریو تۆڵەسەندن •

هیچ گومانم نی‌یە کە خۆینەری بەرێز دوای خوێندنەوەی هەریەکێك لەم کارەساتانە (را)یەك بەرامبەر بە (داد)و (دادگەری)یەکانی پەیدا ئەکاتو یەك لەگەڵ یەکدا بەراوردیان ئەکات ، ئەوسا ئەویش فەرمانی خۆی ئەدا • جا هەرچەندە شتێك لە رقو بەزەییو هەستی خۆشی تێکەڵ ئەکات (بیەوێت یا نەیەوێت) ، بەڵام لە ئەنجامدا کەم یازۆر کۆلتوورێکی (یاسا)یی پەیـدا ئەکات ، کە ئەمە مەبەسی من لە پێشکەش‌کردنی ئەم داوەریانە ئەهێنێتەدیو ئەو پەڕی ئاواتمە ، چونکە هەر کەسێك کە جۆرە شارەزاییەکی لەیاسـادا پەیدا کرد ، ئەوە ئومیدی جیاکردنەوەی حەق لە ناحەقو راست لە خوارو پاك لە پیس ••• ی لێ ئەکرێت ، لام‌وایە ئەم شارەزاییەش گەلێك لەبگرەو بەردەکانی ناو کۆمەڵ کەم ئەکاتەوەو جۆرە ژیانێکی پڕ ئاسودەیی بێ‌شەرو هەراو لێك زیزبوون ئەرەخسێنێت •

زۆری ئەم دادپرسیانە رامیاری واتـا سیـاسین ، گوناهبـارەکانیش زوربەیان کاربەدەستی گەورە بوون ، کە ئەمە زیاتر بابـەتی باسەکەمـان گرنگ ئەکات •

منیش وەك (یاسا) ناسێك لە کۆتایی هەر باسێك‌دا سەرنجیکم لـە روداوەکەو دادپرسی‌یەکە داوەو (را)ی خۆمم دەربریوە ، جا رەنگە هەیـە لە هەندیك شوێندا پێکابێتمو لە هەندێکی تردا بەهەڵە چووبم ، ئەوسا ئەو هەڵەو نەپێکانە ئەبن بە (اجتهاد)ێکی یاسایی •

خۆزگە ئەو کەسەی ئەم کتێبە ئەخوێنێتەوە ، ئەویش بـیری خـۆی ئەخستە کار ، بەتایبەتی یاسا شوناسەکان تاکو حەق لە ناحەق جیا بکەنەوە•

لە کۆتایی کتێبەکەدا فەرهەنگۆکێکی نیمچە یاسایبم پێشکەش کردوە

ئومید ئەکەم کەڵکی هەبێت ، بەڵام لە زۆر شوێندا ناچـار بوم هەندیـك زاراوەی عەرەبی بەکار بهێنمو زوزو دوپـاتی بکەمـەوە (هـەر چەنـدە کوردیەکەیشیم نوسیوە) ، ئەوەیش چونکە ئەو زاراوەیە زۆر باوو بڵاوە وەك (محکمە)و (محاکمە) ...کە ئەمرۆ ئەمە باوترە لە دادگاو داوەریی.

ئیتر تکام ئەوەیە لە کەمو کووڕری ببەخشرێم چونکە هەر ئەوەندەم پێ‌کراوەو لە تواناملدا بوە ، ئومید ئەکەم بەمە ، قاپیەکم خستبێتە سەرپشت بۆ لێ هاتوەکان ، کە ئەوان زیاتر پەرە بەم لایەنە گرنگە لەژیانی رۆژبـە رۆژماندا بدەن کە ئەویش لایەنی (یاسا) ناسینو حەق شوناسی‌یە .

دوا ووشەم سوپاسی کاکە حەمـەی مەلاکەریمـە کـە لـە چـاو پیاخشاندنەوەی ئەم کتێبەدا یارمەتی دام .

**پارێزەر : جەمال بابان**
بەغدا ، حوزەیرانی ١٩٧٨

# موحـاکەمەی سوقرات

ئێستاکە واین لە گەشاوەترین شاری یونانا شاری (ئەسینا)و سـال سـالّی (٤١٣ی پێـش زایینـە) کـە چەرخێـك لەوەبـەر یونـانەکان بەسەر فارسەکانا سەرکەوتبـون ••• ئەسـتیرەی هونـەرو سیاسـەتوو زانینو هەلبەستی کوررانی ئەغریق لەدرەوشانەوەدایە ، شەمالّی عـەتراوی بەهار لەهەردو گردەکانەوە جەژنە پیرۆزەی زەمین ئەبات بۆ (باخوس)ی خوای مەیو بەزمو خوشی •

هەر لەگەڵ هەلهاتنی رۆژ لەهەمەرەنگە خەلك خۆیان ئەکوتابۆ شانۆ گەورەکەی (ئەسینا) تا جیگایەکی باشیان دەسـتکەوێ بۆ سـەیرکردنی چیرۆکی لاسایی (هەور) کەهەتا ئەمرۆش ئەم چیرۆکە بە بەرزترین چیرۆکی گالتەپێکردنو پێکەنینی تەوس ئەژمیررێ کە ڕێکخەرەکەی شای شاعیران (ئەریستوفان)ی بەرزبو • هەرکە نواندن دەستیپێئەکردو سەیرکەرەکـان سەرنجیان ئەدایە قارەمانی چیرۆکەکە ••• دەس بەجێ ئەیانزانی کەمەبەست لـەم گالتەپێکردنـە کێیـە •• ئەوەنـدەی پێ نەئەچـو هەمـو بـە جارێك هاواریان ئەکردو ئەیان ووت : سوکرات •• سو •••کرات ••• سوکرات • چونکە مەبەست لە پالەوانی ئەو چیرۆکی لاساییە کەس نەبوو (سوکرات) نەبێ ، کە لەو کاتەدا بە پیاوێکی هەرە تێگەیشتوو راستی پەرستی (ئەسینا)و بەناوبانگترین مامۆستای شارەکە دائەنرا •

ئەریستۆفان ئەیزانی چی ئەکات • نەئەکرا یەکسەر دەستەو یەخـە

پەلاماری بدا ، کەوابوو چی بکات ؟ •• با بەچـیرۆکی لاسـایی سوکڕات بشکێنێ • لە شانۆگەری (هەور)دا ، ئەریستوفان سوکڕاتی وا دەرئەخست، کە مژدەی ئاینێکی نوێ بەدانیشتوانی شاری ئەسینا ئەدات• خوایـەکی جیاوازی پیشان ئەدان کە لەخوای پیشوی یونانیەکانی نە ئەکرد ، مەبەستی سوکڕاتیش لەم بانگ راهێشتنە گوایە ئەوەبوە ، کە یونانیەکان لە ئایینی باوو باپیرانیان لابداو لاوەکانی ئەسیناش لە کەس‌و کاریان هەڵ بگێڕێتەوە، خۆشی سامانێکی زۆر وەدەست بێنێ •

سەیر ئەوەبوو کە سوکڕات خۆی یەکێـك بوو لـە سـەیرکەرانی شانۆگەریەکەو لەوێ دانیشتبو ، ئەمە زیاتر بۆرە پیاوانی وا لێکرد دەنـگ زیاتر هەلبڕن‌و پلاری تیژتر بهاون • بەتایبەتی کە لاسایی کردنەوەکە تەواوبوو کە زۆریان لاخۆش بوو ، گاڵتەو گەپ‌و ڕێك‌و پێکیەکەی مەستی کردبوون، چوون ئەریستوفانیان خستە سەر شانیان‌و بەوناوە ئەیانگـێڕاو هاواریـان ئەکرد :

— بژی ئەریستۆفانی بەرز ، بژی بوێژی بەهرەدار •

سەیرتر ئەوەبو پاش تەواو بوونی شانۆگەریە کە سوکـڕات خـۆی‌و هاورێ‌و شاگردەکانی هەموو لە ئەریستوفان چوونە پێشەوە کە هێشتا هەر بەسەرشانی خەڵکەکەوە بوو ئەیان گێرا ، سوکڕات دەسکێـك گـوڵی گەورەو رازاوەی بەدەستەوەبوو چوە پێشەوە کە پێشکەشی ئەریستوفانی بکات ، کە ئەمەش پێزانین‌و بەرزهەڵدانـە بۆ هونـەرەکەو نووسـەری شانۆگەریەکە ، هەرچەندە لاساییەکە هەموی دژی خۆی بوو • بەڵام چی بوو ؟ سوکڕات کە دەسکە گوڵەکەی پێشکەش بە ئەریستوفان کرد ، بەو جۆرەی پێشکەش نەکرد کە پێویستە ، یاخود وەك خەڵکی‌ی کە لەم جۆرە ئاهەنگانەدا گوڵ پێشکەش ئەکەن ، بەڵکو لە ئەریستوفان نزیـك بوەوە ،

دەسکە گوڵەکەی بەتوندی ، دا بە سەروچاوپا ، دڕکی گوڵەکان لـەدەمو چاوی ئەریستوفان چەقین‌و بریندارپان‌کرد ، ئەویش هەرچەندە سەرکەوتنی چیرۆکەکەو لاسایییەکە مەستی کردبوو ، بەڵام بەدەنگیکی بەرزەوە هاواری کــرد :

— خوا بتگریٚ سوکراط ، چیت کرد ، دڕکی گوڵەکانت ئازاریان دام • پیری تیٚگەیشتوو مەزنیش پیٚکەنی ووتی :—

— ئەریستوفان نابیٚ تۆ من بکەیت بە نموونە لە چیرۆکەکەتدا ، هەرچــی من بووم لەبەر جوانی‌و بۆن‌خۆشی هونەرەکەت بــەرگەی ئــازارو ئیٚشی درکەکانتم گرت‌و دەنگم نەکرد ، تۆ بۆچی بەرگەی ئــازارو ئیٚشی درکی گوڵەکانی من ناگریت ، خۆ گوڵەکانی منیش جوانن‌و بۆنیان خۆشە ، کەوابوو تۆیش لەپیاوە زۆردارەکانیت ؟ •

ئەوانەی لەویدابوون‌و گویٚیان لەم ووردە گلەییانە بوو ، دەستیان کرد بەپیٚکەنین ، بەڵام بەکیٚ ؟ بەو ئەریستوفانەی کە پیٚش تۆزیٚك هیٚنابونیە پیٚکەنین‌و گاڵتەکردن بە سوکراط •

بەم جۆرە پیری داناو تیٚگەیشتوو ، نەبهیٚشت ، ئەو روداوە ، هــەروا بەئاسانی تیٚپەریٚ ، زرنگی‌ی‌و زانایی خۆی پیشاندا •

باشە کەوابوو ، ئەبیٚ ئەم پیاوە دانایە کیٚ بیٚت ، کە هەمو دانیشتوانی شاری (ئەسینا) بیناسن‌و لەهەمان کاتــدا هەڵبــگریٚ کە یەکیٚــکی وەك ئەریستوفانی شای شاعیران بیکات بەبابەتی چیرۆکیك لە چیرۆکە هــەرە بەرزە پڕهونەرەکانی ؟ تۆ بلیٚی ئەم پیاوە راستی پەرستە مامۆستایەك بیٚت‌و بەکریٚ دەرس بلیٚتەوە ؟ یاخود یەکیٚك بیٚت لە دەولەمەندان یان پشتیوان کە ووتار دانیان کردوە بەپیشە بۆ خۆیان ، یاخود تۆ بلیٚی ئەم پیاوە یەکیٚك

بوویێت لەوانەی بەدرۆ خۆیان بە خواناس ئەدەنە قەڵەمو بـەدرۆ رێـی ئایینداری ئەگرن ، هەر وەك چیرۆکەکەی ئەریستوفان پیشانی ئەدا ؟

نەخێر (سوکرات) هیچ یەکێك لەوانە نەبوو ، سوکرات یەکێك بوو لە رۆڵەکانی ئەسینا ، باوکی پەیکەرتاش بوو ، دایکیشی مامان بوو • ئەویش لەسەرەتادا لەسەر پیشەکەی باوکی دەستی دایە پەیکەرتاشین ، بەڵام لـە دوایی تەمەنیا چوەوە سەر پیشەکەی دایکیو مامانیی ئەکرد •

بەڵام چ جۆرە مامانیەك ؟

بەڵێ ، ئەو مامانیەی کەراستیی لە مێشکی خەڵکیی ئەهێنایە دەرەوە هەروەك دایکیکە منالی لە منداڵدانی ئافرەتان ئەهێنایە دەر •

سوکرات لەزوربەی (گریك ــ یونان)یەکانی نەئەکرد ، سەرو سەکوتی جوان نەبوو ، بەڵکوو زەلامێکی ناشیرینو ناقۆلا بوو ، لوتێکی زل دو چاوی بەقوولاچوو ، لەشێکی نارێك ، بەڵام هێزو توانایەکی سەیری هەبوو، قسەی خۆشبوو ، راستگۆبوو ، هەرکەئەکەوتە قسە ، قسەکانی ئەوەندە رێكو پێكو لەجێ بوون ، گاڵتەو گەپی وا زیرەکانەی تێکەڵاو ئەکردنو جارجار توانجی ئەهاویشت ، گوێگرەکانی هەموو بەجارێك رائەکێشـاو ئێسکەقورسەکەی نە ئەماو خواخوایان بوو هەر قسەیان بۆ بکات •

هەر لەم کاتەدا بوو کە یونانیەکان بەسەر فارسەکاندا سەر کەوتبوون، باری هونەرو ئابووریو ••• لە گەشانەوەدابـوو ، پـارە زۆر بوبـوو ، دەوڵەمەندانی شەر پەیدا بوبوون ، لەناو ئەو چینەشـدا داویـن پیسیو بەدخوییو بەرەڵڵایی پەرەی سەندبوو ، سنووری بەینی چاکەو خراپە جیـا نەئەکرایەوە ، رەوشتو کردەوەی پەسەند رووی لە کزیبوو ، لە ئەنجامی ئەمەدا هەندێك کەس پەیدا بوبوون ، بە درۆ خۆیان وا دەرئەخست کـە راستیپەرستو تێگەیشتوون ، ئەمانە (سەفسەتائیەکان) بوون ، خۆیـان

کردبو بە مامۆستاو دەولەمەندەکانو منالەکانیان فێری توێکلی فەلسەفــەو راستی ئەکرد • ئەیان ووت :

لەجیهاندا هیچ راستیەك نیە ، ئەوە نەبێت کە دێتــە پێــش چــاوی هەرکەسێك واتا راستیو دروستیی بەپێی مرۆڤ ئەگۆررێن • بە پێی ئارەزوو هەوەسو باریان لەجهاندا ئەگۆررینو هیچ شتێك لە خۆش رابواردن باشتر نیە • چونکە هەموو کەسێك سەربەستە لە داواکردنی کامەرانیدا ، ئازادە لە خواستنی چاکەدا ، تەنها بەوەندەوە بەندە کە خۆشی بە ئەندامەکانی لەشی خۆی بگەیەنێتو ئالۆشی لەشی خۆی دامرکێنێتەوە •

ئا بەم جۆرە ئەوانە خوو رەوشتی کۆرانی ئەغریقیان تێــك ئــەداو ریگای خوارو چەوتیان ئەنایە بەریان •

سوکرات لەم ریبازە تۆقی بوو ئەنجامی رەشی ئەم کردەوانەی لەبەر چاو بوو ، لەبەر ئەوە دەستی کرد بە بەرهەلستیی • خەلکی کۆ ئەکردەوە قسەی بۆ ئەکردن ، خۆی ئەکوتایە ناو کوبونــەوەکانی ئــەو مامۆســتا درۆزنانەوە ، پرسیاری لێ ئەکردنو ئەبوو بە دەمەقالییان ، تەنگەتــاوی ئەکردنو وای لێ ئەکردن ، وەلامیان پێ نەدرێتەوە ، یاخــود قسەیــەکی ئەوتۆ بکەن کە گوێگرەکان بهێننە پێکەنین بەخۆیان ، بــەوەدا نــاشیەتیو نەزانینیان بۆ خەلکەکە روون ئەبوەوە • بەمە زۆر لەرۆلەکانی ئەسینا دوای سوکرات ئەکەوتن ، بۆ هەر کوێیــەك بچوایــە لێی جیا نەئەبونــەوە ، گوێیان لەقسەکانی ئەگرتو لە تێهەلچونــو وردکردنەوەیــدا لەگــەل سەفسەتائیەکاندا ، ئەیویست بناغەی خوو رەوشتی پاكو بەرز لە گیانی خەلکیدا دابمەزرێو روونی ئەکردەوە ، کەوا دەروون لەپاش فەوتانی لەش ئەمینێتەوەو نامرێ بیرو باوەری چاکەکردنو کردەوەی پاك بلنــدترن لــە رابواردنی خۆشو ئالۆشی لەش دامرکاندنەوە •

سوكرات بەرامبەر بەم قسەو فێركردنەی خەڵك ، پارەی وەرنەئەگرت ، بەڵكو ئەیووت : كەوا خۆی پیاوێكی راستیی پەرستو تیگەیشتوو نیە ، بەڵكو شاگردێكە بەدوای راستیپەرستیو تێگەیشتوویی‌دا ئەگەرێ ، تاكو فێریان بێ ، جا لەبەر ئەوەی خۆشی بە نەزانو ناشی دائەنێ ، بۆیە هیچ شتیكیش نازانێ ئەوە نەبێ كە خۆی ناشیو نەزانەو ئەیەوێ فێری راستی بێ ، لە رێگای دوزینەوەی راستیی دەروونی خۆیەوە ، واتا ئەیەوێ خۆی بناسێ ، بۆیە داوای لە كەسانی تریش ئەكرد كە ئەوانیش هەوڵ بدەن خۆیان بناسنو لە خۆیان بگەن •

ئەم كردەوانەی سوكرات دڵی نەزانو سەفسەتائیەكانی لە خۆی یەشانو رقی هەڵساندن • ئەمێك بەدوای راستی‌دا بگەرێو بەخۆرایی خەڵك فیری خۆناسینو زانیاری بكات ، بەرامبەر بەتاقمێك كە نەزانو بازرگان بوون ، بە پارەو مزێكی زۆر خەڵكیان فێری شتی هیچو پووچ ئەكرد ، بێ‌گومان لە بەینیاندا هەر ئەتەقیتەوە •

ئەوەی شایانی باسە هەرگیز سوقرات خۆی بە دانا یاخود زانا دانەئەنا، بەڵكو هەر وێڵی دوای زانیاری بوو ، هەر ئەیووتو ئەیووتەوە كەوا : من زەلامێكم بەدەمی خۆم هاوار ئەكەم كە هیچ نازانم بەلاّم بەوەی باشە ئەزانم كە هیچ نازانم ••• بەلاّم نەزانەكانی تر وانین ، ئەوانە نەزانن بەلاّم خۆیان بەزانا ئەزانن •

هەر ئەمەش‌بوو وای لە سوكرات ئەكرد كە هانی ئەوانە بدا كە ئەیانویست لەسەردەستی ئەوا راستی فێر بینو هەمیشە پێیان بڵێ : خۆتان بناسن •

هەر ئەمەش بوو كە بووبە هۆی تێك چوونی لەگەڵ سەفسەتائیەكاندا نەی ئەهێشت خەوەكانیان بێتەدی •• لەبەرئەوە ئەوانەی كە بەپارە

خوێندیان فێری خەلك ئەكرد هەمو ڕقیـان لێ هەلگرت چونـكە پـەكی بازرگانیەكەی خستن‌و بیرو باوەڕەكانیان ڕەوایەوە •

چەند سالێك ڕابورد بەسـەر چیرۆكەكەی ئەریستوفـاندا كەبـۆ نزم‌كردنەوەی بەرزێتی سوقراتی دانابوو هەتا زۆر كەس لە ئەسینا ڕقـی لەم پیاوە بلندە بیرتیژە ڕۆح سوكە هەلگرت تا ئەهات لەو سالانەدا دوشمنی زۆرتر ئەبوو ••ئەو دوشمنانەی كە چاوەڕوانی هەلێك بوون پێوەی‌بدەن• بەلام بەناوی چیەوە ؟ دزە ؟ نەء ، بەلكو پەریەكە لە شێوەی ئینسانـا ، بەدنمەكە بەرامبەربە نیشتمان‌و ، لەگەل دوشمنا ڕێكە ؟ نەء بەلكو ئازایەتی‌و نەبەردی لە دوشەڕی پێشودا شایەتی بۆئەدەن ، ئەی ئەو نەبو سـەرەڕای ئەو پیریەش بێ‌ئەوەی گوێ‌بداتە سەرماو گەرماو برسیەتی چەندەها شەوو ڕۆژ جێگەی پاسەوانی خۆی بەجێ نەئەهیشت • ئەی ئەو نەبوو (سیباد)ی سەركردەی لە شەڕی (بوتیدیـە)دا بەكۆل لـە مردن ڕزگاركـرد ؟ ئیـتر دوشمنەكانی هەر ئەوەیان بۆ مایەوە كە بەناوی ئاین‌و لەڕێگای كۆمەلایەتیەوە لەبیرو باوەڕو فەلسەفەكەی بدەن •

جا كە بەمە گوناهباری بكەن ئایا بیدەن بە چ دادگایەك ؟ دادگـای تایبەتی باشە ؟ كە چەند دادپرسیكی هەیە ناتوانن لەو یاسایانە لا بـدەن كە بۆیان دانراوە ••• لەبابەت ڕووداوی شكاتەكەوە نەبێ ناتوانن هیچی‌كە بلێن ••• كەوابوو ئەم دادگایە ناتوانێ سوقرات گوناهبار بكات‌و فەرمانی بەسەردا بدات ، كەواتە ئەبێ ئەم زانا (ڕۆح‌بەرزە ئەقل پـڕرە ) بـدرێ‌بە دادگای گشتی‌ی كەپێیان ئەووت (مەحكەمەی میللەت) یا (مەحكەمـەی شەقام) • ئەم مەحكەمەیە چونە ؟ و حاكمەكانی كێن ؟ ئەمانە بەهیچ مانایەك حاكم نین ، ئەندامەكانیشی تەنها ئەوەیان بەسە هاو نیشتمـانیكی ئـازادی ئەسینا بن‌و بەهرەی شارستانیان هەبێ‌و لەسەر پشك‌ڕاكێشان دا ئەنران ، بەم جۆرە هەرچی نەفام‌بوو لە چـەرچی‌و دەلال‌و قەسـاب‌و كۆل‌گـێڕو

سوخوورِ ئەبوون بە دادپرس لەم دادگایەدا [1] •

ئاوا بەم جۆرە دوشمنەکانی سـوقرات دەسـەلاتی فەرمانـدەرانی ئەسینایان هانداـ کە لە بەر دەمی ئەم (مەحکەمەی میللەت)ەدا سـوقرات رابوەستێنن ••• ئەویش پاریزگاریی ژیانی بەنرخی خـۆی بکات لـەم جێگە جوانەدا کەلە (٥٦٥) حاکم پێك‌هاتبوو •

لاپەرەی شکاتەکە :ـ

لە بەهاری سالّی ٣٩٩ی پێش زایینda ئەسینایيەکان ئەم پەیامەیان لـە سەرای دەولەتا خویندەوە :ـ

ملیتۆسی ئەسینایی سوقراتی کورِی سفرِونسکی هەیـکەل تـاش بەوە گوناهبار ئەکات کە دەستدرێژی کردۆتە سەر دادگەرییی کە تێکیبدا چونـکە :ـ

یەکەم :ـ باوەرِی بە خوای کۆماری ئەسینا نییە •

دوەم :ـ داوای دوزینەوەی خوایەکی کە ئەکات •

سێیەم :ـ پیاوێکی لە خشتەبەرە ناتەواویی ئەخاتە ناو گەنجەکانەوە•

« تۆلەی ئەم گوناهانەش کوشتنە » •

ئەم شکاتە هەرچەند بە ئاشکرا بە نـاوی ملیتوسـەوە بوو بـەلاّم لەژێرەوە شکاتی ئەوانە بوو کە خاوەنی بیرو باوەرێکی پرِو پوچو خـوو رەوشتیکی ئەوتۆ بوون کە سوقرات دوشمنی بوو •

هەر لەو گەورانەی لەم شکاتەدا بوون (ئەنیتوس) بوو کە لەگەورە ترین پیاوانی دەولەت بوو ••• ئەو لاپەرەی شکاتەکەی نوسیی •• بۆیـە بوبوو بە دوشمنی سوقراتیش چونکە کورِەکەی قوتابی بوە لای •• کـە

---

(١) بێ‌گومان لێرەدا مەبەست نەفامەکانی ئەم چینەن .

بیرو باوەری سوقراتی چوە بە میشکا وازی لە بازرگانیو ئیشەکەی بـاوکی هێناوەو هونەری زانیـاری داوە بەسـەر دەولەمـەندیو پـارەدا •
بیجگەلەوەش (لیقۆن)ی سەفسـەتائی وتاریـکی ڕێـكخستبو •• بـۆ (لیلیتوسی) وتاربێژ کە لەدادگادا بیخوێنێتەوە •

بەرگریی سوقرات :ـ

کە ڕۆژی محاکمە نزیكبوەوە (هوموجین) کە قوتابی سوقرات بـوو پێیوت : مامۆستا پێویستە بەرگریەکەت ئامادە بکەیت ••• مامۆستاش خۆی لێ هەلەکرد پرسی ـ ئەی بەدرێژایی ژیانم چیم کردوە ؟ وابزانـم هیچم نەکردوە ریكخستنی ئەو بەرگرییە نەبێ ، بۆیە لەدادو بێدادیو چاکەو خراپەم کۆلیوەتەوە تا لە زۆرداریو شـەرر بـە دووربم و لایەنی چاکەو راستی بگرم ••• جا ئەمەش بەرز ترین بەرگرییەکە ئەی هاوریم •

(لیسیاس) کە گەورەترین بۆیژو پشتیوانی ئەو دەمە بوو وتـاریکی تەواو ڕێکیبۆ ئامادەکردبوو دایە کە لە بەری بکاتو لە محکمەی میللیدا بیخوێنێتەوە •• کە سوقرات سەیری کرد دوای ئەوەی زۆر پەسەنـدی کرد •• پێیوت ـ ئەمە جوانە ••• بەلام وەکو جوتێ قۆندەرەی چـاکی ژنانە وەهایە کە بە دیاری بۆت هێنابم ، هەرچەندە پڕ بە پێشم بێـت ••• بەلام چۆنت لێ وەر ئەگرم ؟ •• کاکە نابێ بیرم بچێتەوە کە من پیاوم دیاری پیاوانە نەبێ وەری ناگرم •

بەمەدا بۆمان دەر ئەکەوێ کە سوقرات لەوەپیش بەرگریەکەی ئامادە نەکردبوو ، بەلکو یەکسەر لە محکمەدا بەپێی چۆینەتی محاکەمەکە ڕێکی خستوە •• جا ئەگەر سەیری ئەو بەرگریە بکەین ئەکرێت بە سێ بەشەوە :ـ

لەپێشدا دەس ئەکات بە لابـردنو دوورخستنـەوەی بوختانـەکەو تێكدانی ••• لەدواییدا دەری ئەخات کە داواکردنی حەقو چاکە بە بـاش

ئەزانیٖ‌و ئەم هیواو ئاواتەبە بەرز دائەنی کە ئەمەش مایەی نزم کردنـەوەی ئەو بوختانەیە .. لەدواییدا ئاگاداری حاکمەکان ئەکات کەچـۆن ئەبێـت دوور ئەندیش بن لەم کارەیاندا .. و لەباتی ئەوەی وەکو خەڵکی ئەو دەمە لە مەحکەمە بپاڕێنەوە ئەبینین کە لووتی بەرزی حاکمەکان ئەروشێنێت ، کاتیٖ بۆیان دەرئەخا کە لە پاشەڕۆژا نە دەس‌بەسەری‌و نەبەندەیەتی نـاویٖ .. بەڵکو کە بەڕەڵاکرا سوورتر ئەبیٖ لەسەر بیروباوەرەکەی پێشوی خۆی : ئەڵیٖ : ئەی ئەسینابیەکان : ژیانێکی مەردانە ژیاوم .. لە کۆڕی شەڕیشدا لەترسی مردن جێگای خۆمم چۆڵ نەکردوە .. هەرچیش لەو شەڕەدا بوویێت ئەمەی لەبیرە .. ئەمرۆش کە پیر بووم دیسانەوە ناتوانم لەو مەردایـەتی‌و ئازایەتیە لا بدەم .. ناتوانم واز لەو فرمانە بێنم کە ئاسمان بۆی ناردومەتـە خواریٖ بەزمانی پیغەمبەری (وحی) لە پەرستگای (دلف)دا کە ئەمرم پـیٖ ئەکات خەڵـك خۆیـان بەخویـان بناسێنم .. جا ئەگەر ئەم خۆناسینە بە خراپ‌کردنی گەنجانی ئەسینا دائەنێن .. ئەبیٖ بزانن ئەی حاکمەکان ئەگەر ئێستاش بەرم‌بدەن ئەکەومەوە گەڕان بەدوای فێربوونی زانیاریدا بیٖ ئەوەی گویٖ بدەمە چی لەدەس‌هاتنی ئیوە .. لێرەدا بۆڵەبۆڵێك لە گەلە حاکـم بەرزبوەوەو بۆڵانیان :ــ گوناهبار بە چ زمانیٖ‌و چەنـد بەبەرزیەوە قسـە ئەکا ؟ بەڵام سوقرات بیٖ ئەوەی گویٖیان بداتیٖ بە زەردەخەنەیەکەوە لـە سەرخۆ وتی :ــ ئەی ئەسینابیەکان .. ئەگەر بەم وتەیەم توڕە ئەبن ئـەبیٖ دڵنیابن لەوەی ئەگەر فرمانی مردنم بدەن بەمە خراپە لەگەڵ خۆتانا ئەکەن.. لەگەڵ منیا ناکەن .. چونکە شەڕ لەدواییـدا هەر داوێـنی خاوەنـەکەی ئەگرێتەوە ، جاریـکی‌تریش بۆڵەبـۆڵ پەیـدا بوەوە بـەڵام سـوقرات لەسووك‌کردن‌و ڕیسواکردنی ئەوان لەقسەی خۆی نـەکەوت وتـی .. « وامەزانن من لەترسی گیانی خۆم لەسـەری ئـەڕۆم بەڵـکو لەتـرسی ئێوەیە .. لەوەش ترسم نیە پیاوێکتان لەکیس بچێت نەبیٖ بێتەوە جیگای

بەحەقی یەزدانی پاك دوای من یەکێك نادۆزنەوە وەك ئەسپی تاو دراوی ناو مەیدان ڕووتان پێ بکاتە خێرو چاکە ، جڵەوتان توند بکاتەوە لە ڕاکردنا بۆ ناو وێڵو هەردو گۆمی پیس » •• لێرەدا بۆڵەی حاکمەکان بڵندتر بۆەوە • سەرۆکی محکمەش ئەیزانی ئەم گەلە حاکمە دەستە ناوبازاریەکن نەقانـون ئەزانن نەڕێگای محاکمە بەلکو بە ئارەزووی خۆیان فەرمـان ئەدەن ، بـە سوقراتی وت :ــ ئەی ســوقرات لەبـاتی ئەم لەخۆبـایی بوونو لـوت بەرزیەت بۆ تۆ باشتر نیە کە بەزەیی محکمە بەخۆتا بهێنیتەوە ؟ •

سوقرات وتی :ــ ئەتەوێ چی بڵێم ئەی سەروك ؟ ئەی دانیشتوانی ئەسینا، ئەتانەوێ بەهەڵنانی درۆ پەسەندتان بکەم یابەگریـانو پـارانەوە فیزتان زل بکەم ؟ ئەتانەوێ منالەکانو ژنـەکەم بهێنمـە بەردەمتـان تـا بەزەییتان پێایانابێتەوە هەتیو بارو بیوەژنیان نەکەن ؟ جا کە من وامکـرد قسەکەی (ملیتوسم) لێ دێتەدی ، ئەنجا ئەگەر من بەمیهرەبانیو بەزەیی ئێوە بەتەفرەبچمو بە ئەقل لەگەڵتانا نەیەمە کایەوە واتای ئەوەیە من فێڵتان لێ ئەکەم یا بەرتیلتان ئەدەمێو رەوشتتان خراپ ئەکەم ، سویندتان خواردوە کە ڕێزوسەنگینیی قانونتان لابێو بەگویرەی ئەو فرمانبدەن ، بـەڵام قانون ئەقڵە نەك بەزەییو ئەگەر ئەو سویندەتان بخەم مانای خراپکردنی ئایینو رەوشتتانە ، جا من ئەم ئیشە ناقۆڵایە چۆن ئەکەم ، بەلکو من بـە دریژی تەمەنم ئیوەم بانگ کردوە بۆ گوێ ڕاگرتن لەخواو جێبەجێ کردنی قانونە حەقەکانی کە لەنەفسا نوسیویتی ئەویش سورەتی ئەقڵە نەك بەزەییو ئارەزوو شتیتر • جا ئەی حاکمەکان فەرمانی خۆتان بدەن ، ئەوەش بزانن نەفسی ئێوە لەتای تەرازودایە نەك نەفسی من ، ئاگاداری حەقبن چونکە ئەو بۆ ئێوە باشترە منیش دڵ خۆشم بەوەی کە ڕێـگەم نیشـاندان ئیـوەش ئاگاداری خۆتانبن بۆلایەنگرتنی داد •

حاکمەکان لەدواییدا کەوتنە لێ کوڵینەوە (••ئەو حاکمانەی دوژمنەکانی

سوقرات کڕی‌بوونیـــان) ـ سوقراتیـــش بەو گازانـــەی کە لە محکمـــەدا لێ‌ی گرتبون بەم خۆفروشتنە سازبوون ، جا ئەو هەرچی‌ویەرچیانەی کـــە دیارە لەبیرو باوەڕی سوقرات ناگەن ئەبێ سواری سەری‌خویـــان بـــبن ، سوقراتیان بەگوناهبار دانا ٠

پاش ئەوەی بڕیاری گوناهباریەتی درا ئەوسا وا باوبـــوو ســـەروکی محکمە لە گوناهبار بپرسیت :ـ چ فرمانێك هەڵ ئەگریت ؟ کە سەروك ئەم پرسیارەی لە سوقرات کرد ٠٠ بەزەردەخەنەیەکەوە وتی :ـ باشترین حوکم کە بدرێم ئەوەیە فرمانم بۆ بدەن تا ماوەی ژیانم دەوڵەت بەخێوم بکا بەنان‌و جلوبەرگەوە ، لەباتی ئەو چاکەیەم بەرامبەر بەئەسیناو دانیشتوانی کـــە چ ئەقل‌و دادیکم فێرکردون ٠

ئەم وەڵامە رەقە یەکجار ڕق‌و قینی حاکمەکانی هەلسان حەزیان ئەکرد زووتر نیشانی بدەن کە چەند دەسیان بەسەریا ئەڕوا لەبەر ئەوە بەزۆری (٢٨١) دەنگ بەرامبەر (٢٢٠) دەنـــگ فرمانی مردنیـــان‌دا ، مردنـــەکەش بەژەهری تواوە بێت لەناو هەنگوین‌دا ٠

بۆ وەڵامی ئەم فرمانە سوقرات هەڵستایەوە بە سەنگینیەوە وتی : ئەی ئەسینابیەکان ٠٠ تکایەکم هەیە ٠٠ ئەگەر دوای من دیتان مناڵەکانم لەریگای خێرو دادپەرستی لایان دایـــە ڕێگای خۆشـــەویستی‌و لـــەزەتی جهـــان ، ئاموژگاریان بکەن‌و بەتوندی لەگەڵیانا بجولێنەوە هەر وەکو خۆم چـــۆن هەمیشـــە دەنوکم لەسەر ئیوە بوو ٠٠ ئەگەر ئەمەتـــان بۆکردم ئـــەوا ئـــەو چاکەیەم ئەدەنەوە کە بە درێژی‌ی ژیانم لەگەڵما کردوون ٠٠ ئیتر ئـــەی کۆمەل ئێستا کاتی جیابوونەوەیە هەر کەسە بۆ شوینی خۆی ٠٠ من بەلای مردنا ئیوەش بەلای ژیانا ، ئەممـــا چ لایەکمـــان بەختیـــارترە ئەوە خـــوا ئەیزانی ٠

بەبەندیخانەدا :ــ

بەم جۆرە پیس‌ترین دادگا لەمێژوودا دەســـگاو دوکانی پێچــایەوە ، فەرمانی ئازادیی بیرو باوەر لە محکمە هاتە دەرەوە لەسەرخۆتر لە جاران چوە ژوریی بەندیخانەوە ئەمجا لەگەڵ قوتابیەکانیدا لەبابەت فەلسەفــەو نەمردنی گیانــەوە دەسیپێ‌کرد ، دلخــوشی ئەدانــەوەو گالتــەی بــەو فەرمانە ئەکرد بەسەری دێنن •

بەجێ‌هێنانی فەرمانەکە نەختێ دواکەوت لەبەر ئەوەی هیشتا کەژاوەی حاجیەکان نەگەرابوەوە • چونکە ماوەی لەوێ نەبوونی کەژاوەی حاجیەکان بەمانگی نەشیاو دائەنرا لەبابەت فەرمانی مردنەوە •• نەئەبو بەجێ‌بهێزیت• هەر شەبەقی کە پەردەی کەژاوەی حاجی لە ئاسۆوە دەرکەوت (کریتون)ی قوتابی گەیشتە لای سوقراتو پــێ‌ی‌وت کــەوا کــەژاوەکە لەئــاسووە دەرکەوت •• بەڵام سوقرات گوێی نەدایە ئەمجار کریتون بەچرپە پێ‌ی ووت: ــ هەموو شتیکمان ئامادە کردوە بۆ دەربــازبونت بەرتیلمــان داوە بەپاسەوانەکانو کەشتیو پارەو جیگەمان لە (تسالیا) جێ‌بــەجێ کردوە •• دەی ئەی مامۆستای مەزنم بابڕوین بەرەو ئازادیی ••• سوقرات پێ‌ی‌وت: نەخێر (کریتون) لە دەس مردن راناکەم• کریتون وتی : چون ؟•• ئایا ئەمە راستە ئە ئاوا بە ئاسانیو سووکی ببی بە نێچیری ئەو نەفامە زۆردارانــە ، لەکاتیکا کە ئەتوانی خۆت رزگار کەیت لەدواییدا منالەکانت ؟

ــ نەخێر ئەی (کریتون) من واز لەو باوەرە ناهێنم کە درێژەی ژیــانم تیا بەخت کردوە هەر لەبەر ئەوەی کە بەڵایەکم لێوە نزیکە بەلــکو ئــەو باوەرە بەنرخەی کە هەتا ئەمرۆ بەخێوم‌کردوە پربەپێستی ئەو نرخەیە کــە ئەمرۆ ئەیدەم ، من وام خەڵك فێرکردوە کە نابێ بەشەرەوە بەرامبەری شەر بوەستن ، نابێ لەرێگای داد لابدەن چونکە ئەمو ئەو لایان داوە ، هەمــو

هاونیشتمانێك ئەبێ گوێ رایەڵی فەرمانی قانون بێ با زۆرداریش بێت ، جا ئەگەر قانون بووبە پیاویك‌و لەبەر دەرگای بەندیخانەکەما وەستاو لەکاتیکا رائەکەم ووتی :ـ ئەی سوقرات بۆکوێ ؟ ئایا ئەم کردەوەیەت دروستیی دەولەت تێك‌نادا ؟ • ئەبێ من وەڵامم چیبێ ؟ ژیان شتێکی ئەوتۆ نیە کە ئەیبینی واز لەم باسە بێنە (کریتون) وەرە بەو ریگەیەدا برۆین کەوا خوا بۆی دروست کردوین ، ئەوەش بزانە حەز ئەکەم گیانم لەبەندەیەتی لەش رزگاری بێ تا لەوە دنیا چاکەو دادو جوانی بەئاسانی ببینێ ، پەست مەبە ئەی (کریتون) •• دڵنیابە کەلەش فەوتا •• گیان نامرێ •• چونکە خەڵاتی خوایە •

کە پاسەوانەکە ژەهرەکەی بۆهینا سوقرات پرسی چۆنی بخۆمەوە؟•• ئەویش وتی •• گەورەم •• ژەهرەکە ئەخۆیتەوە دوای کەمیك گەڕان •• کە زانیت قاچەکانت بێ هێزبوون دریژئەبیت •

پیرەمێردی زانا پەرداخەکەی لێ وەرگرت وەك ئاوێکی شیرین بخواتەوە چۆڕبڕی کرد •• برادەرەکانی کە لە لایبوون خۆیان پێ نەگیرا هەموو دەستیان کرد بەگریان •

سوقرات بە پێکەنینەوە پێی وتن •• ئەم گریانە چیە ؟ بۆیە ژن لەم بەندیخانەیە دوور خراوەتەوە تا گوێمان لەگریان نەبێت •• بینە پیاو وەکو پیاوان ئیش بکەن • دوای ئەوە بێ‌هێزبوو کەوت قاچەکانی دریژکرد ••• چاوەکانی لەجیگای خۆی بەسەریەکدا نوساو گیانی دا بەدەستەوە •• بەڵام سوقرات هەر زیندوەو نەمرە لە مێشکی مرۆڤایەتیدا •• سوقرات چۆن لەبیر ئەچێتەوە ؟ [1] •

---

(۱) ساڵی ۱۹٥٤ ئەم دادپرسی‌یەم لە عەرەبیەوە کردوە بەکوردی ، بە داخەوە سەرچاوەکەم نەنوسیوەو هەرچەند ئەکەم ناچمەوە سەری بەڵام بێ‌گومان (ترجمە) یەکی بێ دەستکاریە . هەروەها ئەوانی تریش .

ی دوایێکی کورت )

ێـگومان بەربەرەکانی لە بەینی خێرو شەر (هورمزدو ئەهریمەن) لـە ەرەبەینی مێژووەوە دەستی پێکردوەو هەر هەیەو بەر دەوامیش ئەبێت تـا چەو ئەدویی‌و تەماع‌و حەز لەشت‌کردن‌و ئارەزوی دەست بەسەراگرتن ... و ە ژیان بمێنێت .. بەلام لە ئەنجامدا ژیان‌و نەمری هەر بۆ ئەوانەیە کە ڕێـگەی عەقل‌و حەق‌و راستی‌یان گرتوە . کردگار چەندەهـا کاروانـی میسەتان‌و نەتەوەو مرۆی هێناوەتە سەر ئەم رووی زەمینەو رایی‌کردوون ، ئەوانەش چەندەها شەڕو شۆرو کوشتارو ناخۆشی لە ناویاندا رووی داوە ، یەك دەستی ناوەتە بینی ئەوی ترو ورگی دریوە ... ئەوەی لەم هـەراو بگرە رزگاری بووە ئەوانە بوون کە لایەنی عەقلیان گرتوەو دوای خەیاڵ‌و خەو نەکەوتون ، پەیرەوی خیرو چاکەو بەربەرەکانی شەرو خراپەیان کردوە. هەر بەم جۆرەش رۆلەی هەر میلەتێك لەناو خۆیاندا لە بەربەرەکانی دان ... خێرخواو فامیدەو حەق پەرست‌و زاناو دانا ... لە لایـەك ، دەست‌درێژو چاوچنۆك‌و خۆپەرست‌و جەردەو پیاوکوژ ... لەلایەکی تر . جا ئـەگەر لەماوەیەکدا لەم ژیانە دورو درێژەی سەر زەمیندا ، تاقمی دوهەم بەینێـك با زۆریش بێت سەرکەوت‌و جلەو بگرنە دەس‌و بە ئارەزوی خۆیان لێ‌خورن، ئەمە هیچ ئەوە ناگەیەنێت‌و هەرگیز ئەو راستیەوون ناکات کەوا لە ئەنجامدا هەر ئەبێ حەق لەسەرەوە بێت ، عەقل سەرپشك بێت ، زانیاری دروشـم بێت ، راستی‌و پاکی‌و ئازایی ... ڕێـگای هەمو کەس بن ، کـە ئەمـانەن پوختەی ئامانجی یاسا .

سوقراتی فەیلەسوف لە کاتیکدا هینراوەتـە بەر دەمی دادگا ، کـە ئەستێرەی گەشی زانیاری‌و هونەری ئەغریقەکان لەگەشانەوە دابوو ، بەلام سەردەمێکیش بوو تازە شەر بەسەرکەوتنی ئەغریق بەسەر فارسدا کۆتایی هاتبوو . چینێك لە دەولەمەندایی شەرو خۆپەرستەکان‌و راکردوەکان بـە

دوای خۆشی لەشدا هەڵتۆقیبون ، هەموو شتێـکیان لـە چوارچێـوەی بەرژەوەندی‌و دەست‌کەوتی خۆیاندا لێك ئەدایەوەو بەربـەرەکانی ئـەو کەسانەیان ئەکرد کە لەو سنووره بەدەرن‌و بیروڕای هەرزان بەهـاو ئابڕو بەریان لەناو کورگەلی ئەغریقدا بڵاو ئەکردەوە ، بە تایبەتی سەفسەتائیەکان کە تەواو پێ‌یان لێ هەڵبڕیبوو ••• جا ئایا پیـاوێکی راسـت‌و دلسـوزو حەق‌پەرست‌و خۆنەویستی ئازای وەك سوقراتیان چۆن لێ‌راست نابێتەوەو بەرەنگاریان نابێت ، ئەوانیش چۆن واز لەم ئەهێنن هەمو رۆژێك کورەکانیان‌و کەسوکاریان‌و خەڵکی ئەسینا کۆبکاتەوە ، میشکیان بەو قسەو ئامۆژگاریانە بئاخنێت کە بەرەو ئاسۆیەکی روون‌و گەشاوە پڕر لە ژیری‌و دانایی‌و حەق ، دوور لە زۆرداری‌و دەست‌درێژی‌یان بەرێت ؟

گوناهو گوناهبارکردنیش هەر لە زووەوە لە چەند قاڵبێکی سەرەکیدا دارێژراون‌و لە هەر سەدەو سەردەمێکدا دوپات ئەبنەوە ، وەك (دژ وەستانی دین ، لە ئایین لادان)و (دژ وەستانی یاساو بەرژەوەندی‌ی گشتی‌ی)و (دژ وەستانی ئازادی‌ی‌و سەربەستی‌ی ) و (خیانەت‌و داوین‌پیسی‌ی) ••• کـە هەمـو رۆژ ئەم تۆمـانجانە بە چـاوی خۆمـان ئەبینن ، لـە رۆژنـامەو کتێبدا ئەیان خوێنینەوەو لەرادیوو تەلەفزیوندا ئەیان‌بیسین •

ئنجا ئەگەر لەبەر تیشکی ئەم روون‌کردنەوەیەو بە گوێرەی یاسـای ئەمرۆ ، دادپرسیەکەی سوقرات شی‌ی بکەینەوە ، سـەیر ئـەکەین لـەو سەردەمەشدا کە بیستوچوار سەدە پێش ئیستایە ، دوو جۆرە رێگا گیراوە لە بارەی دادپرسی‌یەوە کە ئەتوانم بڵێم ئەمرۆش هەر ئەوەیە •

یەکەم : پەیرەوی‌ی کردنی هەندێك پیویستی‌ی رواڵەت (شکلی) ، کە یاسای (مرافعات)ی ئەمرۆ ئەو رواڵەتانە رێك ئەخات • ئەم یاسایەش دوو جۆرە • یاسای (مرافعاتی مدنی) کە لە دادگای (مدنی)و ئیـش پێکردنی

یاسای مدنیدا بەکار ئەهێنرێت • یاسای (مرافعاتی) سزا کە لە دادگای سزاو نە کاتی ئیش پێکردنی یاسای سزادا بەکار ئەهێنریت •

دووهەم : بە کارهێنانی یاسای سزا کە ئەمیش ئەو تۆمانجەی تیدایە کە ئەدرێتە پاڵ گوناهبار ، هەروەها سزاکەیشی تیدایە کە ئەمەیش ئەمرۆ یاسای (موضوع)ی پێ ئەلێن •

جا ئەگەر ئیمە لەڕووی رواڵەتەوە سەیری دادپرسیەکەی سوقراتمان کرد ، ئەم شتانەمان دێتە پێش چاو :

أ ــ ئەبوایە سوقرات بەگوێرەی ئەو (تومەتە)ی درابوە پاڵی لە بەردەمی یاسایەکی تایبەتیدا رابگیرێت کە دادپرسەکانی هەر چۆنێك بونایە لە سوقرات زیاتر ئەگەیشتنو نەیان ئەتوانی لەو سنوورە لابدەن کە یاسا بۆی دانابوون ، بەڵام ئەمە نەکرا ، بۆ ئەوەی دوژمنەکانی سوقرات زەفەری پیبەرن ، ئەوەبوو درا بە دادگایەك کە دادپرســەکانی لەسەر پشك دائەنرانو برتیبوون لە ئەندامە نزمەکانی دەلاڵو سووخۆرو چەورەو چەرچیی کە ئەمانە نەك هەر لەو پیاوە نەگەیشتوون ، بەڵکو فەرمانەکەشیان لە ئەنجامی (عاطفە)و خۆفرۆشتندا بووە •

ب ــ ئەندامانی دادگا (٥٨١) کەسبوون ، کە ئەمانە لەراستیدا وشــەی گەلە حاکمیان بەسەردا ئەسەپێت ، ئەمانە دادپرسێکیان لەگەڵدابــوو کە سەرۆکیان بوو • ئەمانە هەموو پێش ئیشکردن سوێند دراون کە بەراستیو بەگوێرەی حەق بجولێنەوە • کە ئەمــەش بەلای منــەوە رێگایەکی زۆر بەجێبوە کە چوار سەدە پیش زایین بەکارهێنرا بێت ، بەڵام زوربەیان لە حەق لایانداوەو خۆیان فرۆشتوە ، ئەوە شتێــکی ترە • سەرۆك کاروباری گێڕاوەو لەدواییدا دەنگەکانی کۆ کردوتەوە••

ج ــ شکاتەکە بەناوی یەکێکەوە پێشکەش کراوە کە (ملیتوس) بووە واتا شکاتکەر یاخود داواکەر هەبوە •

د ــ شکاتەکە لەسەرای دەوڵەتدا لەبەهاری ٣٩٩ پ•ز• دا خوێنراوەتەوە، کە ئەمەش ئەمڕۆ لە (گوناهبارکردنی گوناهبار ئەکات لە لایەن داواکەری گشتیەوە) ، بەڵام بومان روون نەبوەوە ، کە ئایا دادپرسینەوەکەش هەر لەویدابوە ، یا لەشانۆی ئەسینادا بووە •

هـ ــ هەر چونێك بوبێت چەند شایەتیکیش ئامادە کراون • بۆ نموونـــە (لیلیتوس) ئەو وتارەی دژی سوقرات خوێندبوەوە کە (لیقون) بۆی رێكخستبوو •

و ــ (لیسیاس) وەك پارێزەرێك هاتۆتەپێشەوە ، بۆ پارێـــزگاریی لـــە سوقرات ، بەڵام سوقرات خۆی ئەوەی قبوڵ نەکردو خۆیپارێز گاری خۆی کرد •

ز ــ دادپرسینەوە کە لە هەر شوێنێکدا بووبێت ، وا دیارە خەڵکێکـــی زۆری لێکۆبۆتەوە کە ئەمەش (علانیە)تی دادگا واتا ئاشکراییەکـــەی ئەگەیەنێت •

خ ــ هینانەدیی فرمانـــەکەی دادگا کە کوشـــتنی ســـوقرات بـــوو ، بەخواردنەوەی ژەهربوو کە ئەمەش خنکاندنو دەسترێـــژ یاخـــود کورسی کارەبایی ئەمڕۆ ئەگرێتەوە •

ئنجا ئەگەر لەرووی ناوەرۆك واتا (موضـــوع)یشـــەوە ســـەیری دادپرسیەکەمان کرد ، ئەم خاڵانەی ترمان دینە بەردەم :

أ ــ ئەو گوناهەی درایە پاڵ سوقرات ئەمەبوو : (بێباوەریی بەخـــوای کۆماری ئەسیناو داواکردنی دۆزینـــەوەی خوایـــەکی تـــر )و (لـــە خشتەبردنی گەنجەکان) •

ب ـ سزای ئەو گوناهەش ئەگەر ساغ بوەوەو بووبە تاوان (لە ناوبردن یاخود کوشتنە) •

ج ـ سەرۆکی دادگا لەوە ئەکات پیاوێکی راستو (واقعی) بوویێت ، بەوەدا کە داوای لە سوقرات کردوە کە بەگویرەی (فامو ژیری) ئەندامەکانی دادگا بجولێتەوەو قسە بکات ، چونکە زانیویەتی کە ئەوانە چینو چۆن پرر کراون • بەلاّم سوقرات چۆن لەراستی ئەوانەدا سەر شۆر ئەکات وچاو دائەخات ؟

د ـ رێگا بەتەواوەتیی دراوە بە سوقرات کە بەرگریی لەخۆی بکات دژی ئەو گوناهەی دراوەتە پالّی ، ئەویش ئەو بەرگریە بەنرخە پررەی پێشکەش کرد کە زادی تاقیکردنەوەی درێژاییی ژیانی بوو •

ﻫ ـ دوای تەواوبوونی دادپرسیەکە ، لە سوقرات پرسراوە کە ئایا چ فەرمانیك هەلّئەگری بەسەریا بدرێت • ئەمە لەو پرسیارە ئەکات کە ئێستا پێش دەستپیکردنی دادپرسینەوە ، لەگوناهبار ئەپرسرێت ئایا تاوانبارە یاننا ؟ •

بەم جۆرە موحاکەمەی سوقرات کوتایی هات ، کە بەلای منەوە کارێك بوە زۆر لەو پێویستیانەی یاسای ئەمرۆ دایناون ، لەو سەردەمەدا پەیرەوی کراوە ، کە ئەمەش بەراستی وەك لەپێشەکی باسەکەدا هەیە ، گەشانەوەی زانیاریو هونەری ئەو سەردەمەی کۆرانی ئەغریق ئەخاتە روو• بەلاّم ناحەقی کراوەو بە خۆرایی فەیلەسوفێکی مەزنی وەك سوقرات دەرمان خوارد کراوە ئەوە شتێکی ترەو بە جۆریك سوقرات خۆی داوای پەیرەوی کردنی یاسای کردوە با زۆرداریشیی تێدا بێت بەو بروایەی رۆژیك لەرۆژان ئەو کەمو کورریەی تیدا نامێنێتو پرر لەدادو حەق ئەبێت• ئەو بروایەی کە بەخۆیو تیوریەکانی بوە زۆریان هەر ئەوسا هاتونەتە دیی

بەوەدا کە هەرچەندە حاکمەکان بەوجۆرەش بوون کە باسمان‌کردن بەلام ئنجا (٢٢٠) یان لەگەڵ سوقراتدا بوون‌و دژی بریاری کوشتنی ، کە ئەمـەش ژمارەیەکی زۆرە بەرامبەر بە (٢٨٠) کە فرمانەکەیان مـۆرکردو مـۆری خۆفرۆشتنیان دا بە ناوچەوانی خۆیانەوە •

## موحـاکەمەی ئـان ـبۆلین
## قەراڵیچەی ئینگلتەرە

شاژنە (ئان) ژنی هەنری هەشتەم شای ئینگلتەرە بوو ، ئەو هەنری یەی لە ژنو ژن هینان تێر نەئەبوو هەرچەندە ئایینی دیان ریّی تەلاّق‌دانی ژن نادا ، بەلاّم هنری گوێی نەداوەتێ نزیکەی شەش ژنی هێناوە یەك لـە دوای یەك ، هەر کەسێك لەم رووەوە بەربەرەکانی لەگەڵ بکردایە ( هـەر کەسێك بوایە ) بە ئاگری رق‌و کینەی ئەی سوتان‌و پەتی قەنـارەی بۆ هەڵ ئەخست‌و ملی پیا ئەکرد، تاکو لەسەر ئەمە چوو بەگژ (پاپا)داو بەرەنگاری بوو چونکە سازکار نەبوو ژنە پێشوەکەی کە شاژنە (کاترین ئۆف برجوای) بوو بەرەلاّ بکاو (ئان بۆلین) بهێنێ ، لەسەر ئەوە ناوو دەسەلاّتی پاپای لـە هەموو ئینگلتەرەدا نەهێشت‌و خۆی لەباتی ئەو ناونا(پشتیوانی ئایینداری‌ی)٠

لەو کاتەدا ئافرەتێکی لە خواترس کە بە (کچە پاکەکەی کنت) نـاوی دەرکردبوو لەسەر ئەم ژن واز لێ‌هینان‌و ژن هاوردنەی شا هەڵی دایە ٠ شا ئەمەی بیستەوە هەرچی نەشێ ئەوەی کرد بەخۆی‌و هاوپەیمانەکانی ٠ خۆ لەسەر نارێکیەکەی لەگەڵ پاپادا هـەر وازی نەهێنـا دەستوریـکی بـە ئەنجومەنی نوینەرانی ئینگلترە دانا کە شا خۆی پشتیوانی ئایین‌و سەرۆکی کلێسایە ، هەر کەسیش دان بەمەدا نەنێت‌ئەوە گوناهبارو بەدنمەکە ٠

ئەو دوو کەسەی لایان ستەم‌بوو ئەمەی بەدرۆ بۆ مۆر بکەن قەشەی (رۆشستر)و (سێر تۆماس مور) [1] بوون ٠ شـا لەسـەر ئەمـە قەشـەی

(١) سیر توماس مور بیر بلندێکی بەرزو نوسەرێکی مەزنی ئینگلیز بۆ .

رۆشستری دا به دادگا ، کاتێ بەخۆی زانــی فەرمــانی خنکانــدنی بــۆ دەرکراو ملی کرا بە پەتا ، تا نیوە مردوو بوو ئەنجا داگیراو ســەری بــە شمشێر لە لەشی جیا کرایەوە •

سێر توماس موریش پیاویکی زۆر خوشەویستو مــەزن بوو لای میللەتی ئینگلیز بگرە لە هەمو وولاتی ئەوروپادا ، شــا فەرمــانی دا ملــی ئەویشیان پەراندو لاشەکەیان فرێدایە روباری تایمسەوە •

ئەمانەی هەموو بۆ ئەوە کرد رێگای بۆ پاك بێتەوە هەر ساتێــك ویستی ژنەکەی واز لێ بێنێ یا یەکێــکی کە بهێــنێ کەس رەخــنەی لــێ نەگرێــت •••

دوای ئەم هەموو بەزمانە ئان بۆلینی هێنا نزیکەی سێ سالّی لەگەڵدا رابوارد ، تاکو تاقەتی لەویش چوو ، ئەنجا ئارەزوی ئافرەتێــکی کەی کرد ناوی (جێن ــ سیمور) بوو بەلاّم وەکو وتمان ئــایینی دیــان رێی هیــچ دیانێك نادا دوو ژنی پیکەوە ببێتو رێ نادا هیچ کەسـیك لــە ژنــەکەی جیابێتەوە تا گوناهیك نەکا لەسەر ئەوە وازی لێ بهێنیت •

کەوابوو شا ئەبێ چۆن خۆی لە ئان بۆلینیش رزگار بکا ؟ هێنای بــە داوینپیسیی ئەو ئافرەتە پاکەی گوناهبار کرد ، دوو سێیەك لە کەنیزەکی کۆشکی شاهانەی لێ راستکردەوە کەوا بیستویانە شاژن لەگەڵ چەنــد کەسێکا داوینپیسیو دەستی تیکەڵ کردوە • ئەو چەنــد کەســەش لەو کەسانەی کۆشکی شاهانە هەڵبژێرران کە شا خۆی رقی لێیانبوو ئەوانیش (نوریس ، ویستون ، بربریتونو کەمانچەژەنی بارەگای شاهــانە مــارك سمیتون) بوون کە ئاگایان لە هیچ شتێك نەبوو ، تا ئەو کاتەی راپێچ کران بۆ بەندیخانەو دەس‌کرا بە تێهەڵدانو لێدانیــان کە ئەبێ شتێــك هــەر بدرکێننو بڵێن کەتنێکیان بە شاژن کردوە ، ئەوساکە رزگاریان ئەبێــت ،

سیانیان به ناپیاوی‌یان زانی‌ی له‌خویانه‌وه بوختان بکه‌ن ، ئه‌هیان کرد له‌ ملیشیان بده‌ن ئه‌م بوختانه نه‌که‌ن ، به‌لاّم کابرای چواره‌م (که‌مانچه ژه‌ن) خۆی پیّ نه‌گیرا له‌ترسا بوختانه‌که‌ی کرد بۆ ئه‌وه‌ی رزگاری ببیّت •

شا ژنی هه‌ژار ئاگای له‌هیچ نه‌بو تا له‌ناکاو گرتیان به‌ره‌و به‌ندیخانه‌ی (قه‌لای له‌نده‌ن) بردیانو کردیانه ژوره‌وه ، له‌پیّشدا دادی ئه‌و چوار که‌سه پرسرا که گوایه داوین‌پیسی‌یان له‌گه‌ڵ شاژندا کردبوو ، دادگا فه‌رمانی مل‌په‌راندنی سیانه‌که‌ی پیّشوو که بوختانه‌که‌یان نه‌کردبو دا ، ئنجا فه‌رمانی به‌خنکاندنی کابرای که‌مانچه ژه‌ن‌دا که بوختانه‌که‌شی فریای نه‌که‌وت •

دوای ئه‌وه‌ی ئه‌وان له‌ناوبران ئنجا دادپرسینی شاژنه ئان ده‌ستی پیّ‌کرد ، به ئاره‌زوو خستیانه دوای دادپرسینی ئه‌و زه‌لامانه بۆ ئه‌وه‌ی له‌دادگادا به‌ره‌و رووی یه‌کتر نه‌بنه‌وه ،نه‌ك بوختانه‌که سه‌ر نه‌گریّت •

رۆژ رۆژی ١٥ی مانگی مایسی (١٥٣٦) بوو له مه‌یدانی (ویستمنستر) له‌به‌ر ده‌می (٢٩) ئه‌ندام له‌پیاو ماقولان شاژنه ئان راگیرا بۆ محاکه‌مه‌و نازانیّ بلیّ چی ، بۆچی محاکه‌مه ئه‌کریّ ؟ چی بلیّ باشه ؟ ته‌نانه‌ت نه‌یان هیّشت که‌سیش پشتیوانی‌ی بکا سه‌رۆکی دادگا لیّی‌ی پرسی :

ـ ناوت چیه ؟

•• ئان بولینم ناوه •

ـ له چ‌ته‌مه نیکایت ؟

•• بیستو شه‌ش سالانم •

ـ ئیشو کارت ؟

•• ژنی شای ئینگلتره‌م •

ـ سویندبخۆ که هه‌رچی راسته ئه‌وه ئه‌لیم‌و درۆناکه‌م •

•• هه‌رچی راست نه‌بیّ نایلیّم •

تو گوناهباریت بەداوین‌پیسی‌ی لەگەڵ فلان •• وفلان •• و •• و سوێندبخۆو دەستی راستت بەرز کەرەوە ، ئایە گوناهباری یانەء ؟

بە هەر سویندیکتان بروایە لەشیر پاك ترم •

بێ‌گومان ئەم ئافرەتە بەستەزمانە بۆ ئەوە هینراوە کە بە ناحەق توش بکرێ ئیتر بێ‌گوناە بێت یان نەء چ سوودیکی هەیە ؟ جارێ شایەتیك نەبوو شایەتی لێبدا ، جگە لەوە کەسێك نەبوو ئەوەندەی نووکی دەرزیەك خراپە یا داوین‌پیسیەکی لەم ئافرەتە دی‌بێت ، پاڕانەوەو لالانـەوەشی ئەبـێ چ سودیکی ببێ ؟ دادگا فەرمانی دا بە سوتاندنی بەئاگر •

رۆژی ١٧ی مانکی مایس (دوو رۆژ دوای دادپرسینەکە)یان دانا بـۆ سوتاندنی ، بەڵام شای مێردی لای خۆی دلسـوزی تلیسـایەوە بـۆی ، فەرمانەکەی گۆرری‌و کردی بەمل پەراندن لە باتی سوتاندن •

کاتێ ئەم پەیامەیان دا بە شاژن کەوا شا پیاوەتیەکی تریشی لـەگەڵ کردوەو ناردویەتی لە شاری (کالیە)وە لەفەرنسە مل پەرینەرێکی هێناوە بە یەکەم لێدان ملی لە لەشی جیا ئەکاتەوە ، هیچی بۆ نەمایەوە وتی : مـلی من لەموو باریك‌ترە بە هەمو کەسیك ئەپەرێ ••• هەرواش دەرچوو کابرا بە یەك جار لیدان ملی پەراند :

( سەرنجێك لەم داوەریە ) :

لە راستیدا هەرچی واتای (داد)و (دادگەری) بێت لەم دادپرسی‌یەدا نیە ، ئەوە نەبێت کە کابرایەکی کەللەشەقی ئافرەت‌باز ، دوای ئـارەزووی (جنسی‌ی) کەوتوەو لەو ریگایەدا ملی چەندەها کەسی پەراندوە ، ئەمـە وادیارە لەکاتێکدابوە کە دەسەلاتی شا بەسـەر دادگاکانـی ئینگلـتەرەو دادپرسەکاندا بە جۆرێك بووە کە هەرچیەکی ویستبێت پـێ‌ی کردوون ، کە ئەمەش بە پەڵەیەکی گەورە ئەژمێرریت لـە مـێژووی دادگـەری‌ی ئینگلتەرەدا •

# موحـاكەمەی شـارل
# شـای ئینگلتەرە

رۆژ رۆژی ٢٠ی ینایری ساڵی ١٦٤٩ یە شارلی یەکەمی شای ئینگلترە لە ویستمنستر لەبەر دەمی ئەو دادگا تایبەتیەدا وەستاوە کە بـۆی پێـك هینراوەو گوناهبارکراوە بە بەدنمـەکیو پیـلان گـێران بەرانبـەر بـە ئازادیخواهانو دەستدرێژکردنە سەر سەربەستیی گەل ، بەڵام لەپیش دادپرسینیدا میللەت قسەو باسیکی زۆری کردبوو دەربارەی دوایی‌هینانیو پاشە رۆژی ، دەنگی گشتیش بڕوای وابوو کە تا شا زیندوو بێـت ئـەم رژیمە نوێیە هەنگاوێك پێش ناکەوێ بەرەو ئامانجـی گەل ، هەندێـکی تریش بڕوایان وابوو ئەگەر بێتوو شا بکوژرێت هەرایەکی گەورە ئەقەومێت کەواتە با بە نەهینیی دەرمانخوارد بکرێ ، هەندیکی تریش وایان بـە باش ئەزانی لە ریکەوتێکدا بە گوللەیەك سارد بکرێتـەوە ، لە ئەنجامـدا ئەنجومەنی گشتیی لە ٢٧ی کانونی یەکەمی سـالی ١٦٤٨دا بریاری بـە دامەزراندنی لیژنەیەکی تایبەتیدا کە بەگوێرەی دەستوورو یاسایەکی تایبەتی شا بدات بە دادگا .

بەڵام لە پێش ئەوەی باسی چونیەتی ئەم محاکەمەیە بکەین پیویستە ئەوە بگێرینەوە کە بۆچی شا گەیشتە ئەم رادەیەو چۆن رۆژی بەم رۆژە گەیشت ؟

دەستەی پیاو خراپان :ـ

شارل بچکولەترینو خوشەویست ترین کورری مەلیك جەیمسی یەکەم

بوو ، له ساڵی ١٦١٢دا كه (هنری) كاكی مرد شارل بوویه جێنشینی باوكیو به (پرنس ئۆف ویلز) ناوبرا ، كه گەورە بوو گەیشته تەمەنی گەنجیــەتی ، دەستەی كۆشكی شاهانه ویستیان بیكەن به زاواى خێزانی شــاهانــەی ئیسپانیا ، شارل راوێژكەریكی پیاو خراپی بوو ئەویش (دۆقی پەكینگهام) بوو ، ئەم كابرایه هانی ئەدا كه گوێ نەداته چاولێكەریی باوو باپیر ، بــا خۆی بچیت بۆ ئیسپانیا لەوێ ناسیاوی لەگەڵ میركچدا پەیــدا بــكات • شارل بەقسەی كردو چوو بەڵام له (مەدرید) گەلێ كردەوەی ناقۆڵای نواند، یەكێك لەوانه ئەوه بوو ویستی به دزیەوه خۆی بگەیەنیته میركچ چونــكه چاولێكەری وڵاتی ئەسپانیا رێی دوو شازادەی نه ئەدا به ئاشكرا پێكەوه رابوێرن ، كه بەمه زانرا هەر بەجاریك شەرمەزاریان كرد ، لەمەش زیــاتر ئەم خۆشەویستیەی وای لێكردبوو هەر بۆ ئەوەی دڵی میركچو میللەتەكەی راكێشێ ، كاتیك بارەگای شاهانەی ئەسپانیا كومەڵه ئاینیه ئینگلیزیەكــەی له خاكی ئەسپانیا كردە دەرەوە چاوی لێ نوقاند ، هەروەها هەموو داواو نیازو پێویستێكی كاربەدەستانی ئەسپانیای له ئینگلتره ئەبردە ســەر لــه كاتیكا كه هێشتا نەش هاتبوه سەر تەخــت ، ئەو یاسایــانەی ئینگلــیزه پرۆتستانەكان دایان نابوو دەربارەی ئەسپانیه كاسولیــكەكان شارل ئــەو یاسایانەشی هەلگرت ، ئنجا دوای ئەم هەموو لێخورینو سەر پێ شۆركردنه شلپێكی تەریان پیاداو روویان لێ وەرگێرا ، نه میركچیان دایەو نه گەنــده كچ • ئه ئاوا بەریتانیا بەم شەقە زللەیه ڕوومەتی سوور بوەوه •

دوای دوساڵی كه راوێژكەری پیاوخراپ (دۆقی پەكینگهام) بــۆی تێكەوتەوه لەگەڵ (هنریتا ماریا)ی خوشكی شای فەرەنسەدا ، بەڵام ئــەم جارەیان دەسگیران بووبه زاوا •

له مانگی مارتی ساڵی ١٦٢٥دا جیمسی باوكی سەری نایەوه ، شــارلی كوڕی هاته سەرتەخت ، بەڵام میللەت هیچ چاوەروانی چاكەیان لێ نەئەكرد

چونکه لەسەر تەختی پروتستانتی دانیشتوە بەڵام بوە بەزاوای فەرانسزە کاسۆلیکەکان •

کاتێك کە (مۆنتاگۆ)ی قەشە بە ئاشکرا دەستی‌کرد بە بلاوکردنەوەی بوەری (هەقی خوای[1] شاهانە) پەرلەمانی ئینگلیز لەسەر ئەمە بریاری بەندیەتیان‌دا ، هەروەها پەرلەمان لەسەر ئەوە سووربو کە شا بێ پەرلەمان ناتوانێ باجو مەکاتی گومرگی‌ی دابنێ ، لەسەر ئەمە شارل لەسەر ئاموژگاری‌ی پەکینگهامی پیاو خراپ پەرلەمانی داخست، سەرەڕای ئەوەش مونتاگۆی کرد بە قەشەی تایبەتی کۆشکی شاهانە • ئیتر شا بووبە دەس‌کەلای پەکینگهامی چاو لەدووی شەررانی ، ووڵاتەکەی کرد بەتوش زنجیرە شۆرشیکی ناوخووە کە ئەنجامیان هەموو ژێرکەوتن بوو ، پیاوانی (فیلوی) دەریا هەلگەرانەوە لەگەڵ (هیگونوت)دا شەڕیان نەکرد ، هێرشەکەی بەریتانیا بۆسەر (قادش) شکا ، شا بەتەواوی کەوتە سەر ساجی عەلی ، بۆ خەرجی شەر ناچار بوو گەوهەرەکانی تاج بدا بە بارمتەو لەگەڵ ئەوەشا زۆرکەمی چنگ کەوت ، ناچار بوو کە پەرلەمان کۆ بکاتەوە تا چارەسەریکی پارەی بۆ بکەن، بەڵام خۆ وەنەبێ ئەم پەرلەمانە تازەیەش لەوی پێشوو شل‌تر بوبێت ، یەکەم ئیشی ئەنجومەنی لوردەکانی ئەوەبوو (ئیرل بریستول)ی کۆنە نوێنەری ئینگلترە لە ئەسپانیا کە بە فەرمانی شاهانە گیرابوو (لەسەر ئەوەی لەوەپێش رەخنەی لە شاو پەکینگهام گرتبوو) بەرەڵا کرد •

ئەنجومەنی گشتیش لەولاوە پەکینگهامی بەهەشت خراپە گوناهبار کردو داوای لێ‌کرد کە وەڵام بداتەوە ، بەڵام لەجیاتی ئەو شا خۆی وەڵامی پەرلەمانی دایەوە وتی : پەکینگهام بەبێ فەرمانی من نەجوڵاوەتەوەو ( سێر

---

(١) نظرية حق الملوك الالهية .

جون ئیلیوت)یش که دانەری ئەو پرسیارانە بوو راپێچی بەندیخانەی کرد ، بۆ جاری دووهەم پەرلەمانی داخست • بەڵام ئەی خەرجی شەر لەکوێ پەیدا بکا ؟ بۆ ئەمەش هێنای گەلی باجی گرانی نارەوای خستە سەرشانی میللەت ، هەر لەم تەنگو چەڵەمەیەدا شەڕێکی کەی کرد بەتووش وڵاتەوە ، بەسەرکردەی لەشکرێکەوە هێرشی بردە سەر فەرەنسە ، لەوسەرەوە بەروو زەردی گەڕایەوە ، شا ناچار بوەوە لە ساڵی ١٦٢٨دا بۆ جاری سێیەم پەرلەمانی کۆکردەوە بۆ چارەسەرێك ، ئەم پەرلەمانەش هەر لە هەقی خۆی‌و میللەت نەهاتە خوارەوە بەڵکو داوای لە شا کرد کە (باجی نارەوا نابێ دانرێت‌و لە کاتی ئاسایشدا فەرمانی عورفی نابێ بێ بێ با سەرباز لە جێگاکانی خۆیاندا جێیان نەبێتەوە نابێ بخرێنە ماڵانەوە ) ، بەمە ئەڵێن (سکاڵای ماف) کە لە ئەنجامدا شا بە نابەدڵ مۆری کرد •

دوای ئەمە گەلی کارەساتی‌کە قەوما ، سەرکردەیەکی شۆرش‌گێر بەخەنجەر پەکینگهامی یاوەری شای کوشت ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا شارل نەهاتەوە سەرخۆی‌و سیاسەتی نەگۆری ، بۆ جاری سێهەم پەرلەمانی داخستەوەو جەزایەکی قورسی نایە مل کاربەدەسەکانی بە تایبەتی (ئیلیوت) ، لەبەر ئەوەی ئیلیوت توانای بژاردنی ئەو جەزایەی نەبوو کردیە بەندیخانەی (قەڵای لندن)ەوە ئەویش گەلێك لە شا پاڕایەوە کە بەری‌بدا، تا لەنەخوشیەکەی چاك ئەبێتەوە ، بەڵام شا گوێی نەدایە تا لە بەندیخانەدا مرد دوای ئەمە شا دوانزە ساڵ (لە ساڵی ١٦٢٩وە تا ساڵی ١٦٤٠) بەبێ پەرلەمان حوکمی وڵاتی کرد ، لە مماوەیەدا یاساغی کرد لادێی بێتە ناو شاری لەندەنەوە ، فەرمانی دا بەداخستنی دوکانی بازرگانەکان لە گەڕەکی (چیبساید) لە لەندەن ، هەرکەسێ خانویەکی تازەی بکردایە لە پای‌تەختا ، تا باجی نەدایە ریگای نەئەدا ، پارە بوبوو بەهێوای بەرودوای ، رێ نەما نەیگرێ بۆ پەیداکردنی ، ئەمانەو سەدەها حوکمی ناڕەوای تریش •

شارل له زۆر گوناهی کەدا خەتا باربوو، ئەوە بوو کە (ئیرل سترافورد)ی
ەندا بە ئاگرو ئاسن (ئیرلەندە) حوکم بکات ، ناکۆکی خستە بەینیانــەوە
؛ زۆریان لە یەکتری کەلەپاچە کرد ، هەر ئەمبوو کە لەسەر شتی پروپوچ
ـی خەلکی دەس بەسەر ئەکردو سزای پروتستانیەکانی ئەدا ، دوای ئەمە
بەدکاریەکی گەورەی تری کرد ، کاتێ کە سکوتلندەییەکانی ناچار کرد ببن
بە کاسۆلیك ، ئەمانیش بەمە دل بریندارو زاماربوون ، بەیداخی شــەڕیان
ێ هەڵکرد ، بەلەشکرەوە هێرشیان هێنایــە سەری (ئەوســا سکۆتلنــدە
دەوڵەتیکی نیوە جیاواز بوو لە ئینگلتەرە) ، لەم شەڕەدا لەشکری شــارل
شکا ، ناچار بوو بۆجاری چوارەم پەرلەمانی کۆکردەوە بۆ پارە پەیداکردنو
بۆ لەشکریکی گەورە پێكهێنان تا لەسەر شەرر برۆن ، بەلاّم پەرلەمــان
گورج دەسیکرد بە لێپرسینەوەی شا لەهەر نارەواییەك کە کردبوی‌ی ،
شارلیش گورج وەکو ئەوانی‌تر ئەمیشی داخستەوە ، بەلاّم لەپاش چەنــد
مانگێك کە لەشکری سکۆتلندە داوای بژاردنی ئەو زیانــەی لێکــرد کە
لەشەردا داویانە ، ناچاربوو بۆ جاری‌پینجەم پەرلەمانی کۆکردەوە • ئــەم
پەرلەمانە تازەیە بەسەرکردەی‌ی (بایم)ی جەسوری قارەمانی میللی بوو ،
یەکەم دەس کە وەشاندی ئەوەبوو (ئیرل سترافورد)ی پیــاوی شــا کــە
نیشانەی پیاو خراپی بوو محاکمە کردو خنکاندیان ، هەرچەندە شا لەپێشدا
ویستی باڵ بکیشێ بەسەریا بەلاّم لەدواییدا سوودی نەبوو ناچار وازی
لێ هێنا ، هەر وەها ناچار بوو کە ئەو بڕیارەش مۆربکات کەبەبێ ئاگاداری‌ی
کۆمەلی نوێنەران پەرلەمان دانەخات •

ئا بەم جۆرە ئەو چەکە بەهێزە لە شا سەنرایەوە ، ئەمجار پەرلەمــان
هێرشێکی گەورەی برد بۆ ئەو زۆرو زورداریەی شا لە وولاتا کردبوی ،
قەلاّی ناپاکی‌ی یەك لە دوای یەك رووخاند ، بەرامبەر بەم کارەساتە شــاو
هاورێکانی هیچیان بۆ نەمایەوە تەنها ئەوە نەبێ کە هەر چۆنێك بێت (بایم)

لەناو بەرن ، لە قاقەزێکا میکرۆبی تاعونیان بۆنارد ، بەڵام ژێر دەسەکەی (بایم) زەرفەکەی کردبوەوەو خۆی رزگاری بوبوو جارێکی تریش لە کلێسای ویستمنستردا زەلامێکیان دایە بەر خەنجەر وایان زانی‌بوو ئەوە ، لەگەڵ ئەمەشدا (بایم)و هاورێکانی ئەوەندەی موویەك لە رێگەی خۆیان لایان نەدا ، رۆژبەرۆژ ئاگری ناکۆکی بەینی پەرلەمانو شا خۆشتر ئەبوو ، ئەوەی زیاتر بڵێسەی بەم ئاگرە ئەدا ئەوە بوو شا فەرمانی دا بەپیاوەکانی کە (خۆپیشاندەرەکان) تیر باران بکەنو تائەتوانن لێیان بکوژن • (بایم) کاتێ نەیویست خۆی بفروشێ بە شاو ببێ بە سەرەك وەزیران شا هەر ئەوەی بۆمایەوە کە جارێ شەرربدا لەگەڵ پەرلەمانا ، ویستی بەناوی بەدکاریەوە (بایم)و چوار لەهاوریکانی بگرێ ، بە لەشکرەوە هەڵی کوتایە سەر پەرلەمان ، داوای ئەو پێنج کەسەی کرد ، کە پەرلەمان نەیدان بەدەسەوە شا ناچار بەهەرەشەو گورەشەوە پاشەو پاش‌گەرایە دواوە •

لە هەمو شتێ جوانتر وەڵامی میللەت بوو بەرامبەر بەم کارەساتە ناقۆڵایانەی شا ، بازرگانەکانی لەندەن هەموو دوکانیان داخست ، بۆ دوەم رۆژ کە شا بەناو شارا تیپەری درایەبەر هەرەشەو گورەشە ، خوێن لە دەمارا جوولا ، پەرلەمان لەترسی شا جیگای کۆبونەوەی گواستەوە ، لەهەمو کونو قوژبنی ولاتا کۆمەڵەی خاوەن چەك دروست بوو ، لادێیەکان بەچەکەوە خۆیان کرد بەپای‌تەختا ها ئێستا شەری میللی هەڵگیرسێ ها ساتێکی تر • لیرەدا شا گەرایە دواوە ، خۆی خزانە یەکێك لە کۆشکەکانی دەرەوەی پای‌تەخت ، ئەمجار پینج سەروکەکەی پەرلەمان سەریان دەرهێنایەوە ، بەناو هەڵهەلەکێشانی میللەتا بەسەرکەوتویی چونەوە پەرلەمان •

زۆرانبازی ئەم دوو کاربەدەستانە بۆ ئەوە کز ئەبوەوە کەبە هێز تربێت‌و بۆ ئەوە ئەوەستا کە دەس پێ‌بکاتەوە ، کاتێ پەرلەمان (سکالای

ۆزده داوا)ی دا به شا بۆ راست کردنەوەی دەستورو سەندنەوەی هەموو بەڕیوەبردنی کاروبارێکی ولات ، شا هەمیسانەوە پەنای بردەوە بەر هێز ، لەشکرەکەی کردەوە سەر ئەو کەسانەی کە لایەنی پەرلەمانیان ئەگـرت ، پەرلەمانیش لەشکریکی بۆخۆی لە دەهەزار کەس پیکەوەنا ، بەم جـۆرە شەر لەبەینی هەردو لەشکرا دەسی پێ‌کرد ، شایش بۆ خۆی لە (ئوکسفۆرد) لە بارەگای خۆی پەرلەمانیکی (ئازادی) پیکەوەنا ، دوسالْ ئەم دوو لەشکرە یەکتریان هیناو برد ، لەم ماوەیەدا زیانێکی زۆریان لەیەکتردا ، لە سـالْی سێهەمدا سالْی ١٦٤٥ تای تەرازوی لەشکری ئازادی‌ی نیشت لەشەرێکدا بەسەرکردەی (کرۆموێل) ئالاّی سەرکەوتنیان بەرز کردەوەو دەستیان‌کرد بە رێگابەستنەوە لە شا ،لەکاتی پشکنینی کتێبخانـەکانی شـا دا چەنـد کـاغەزێکیان دۆزیەوە کە شا داوا لەدەولەتە بێگانەکان ئەکا بەلەشکرەوە بێنە سەر ئینگلترە • کە ئەم دەنگوباسە بلاّوبوەوە شا لە سـالْی ١٦٤٦دا رای‌کردو خۆی دا بەدەس ئسکۆتلندەییەکانەوە کە سەردەمیك بوو دوژمنی بوون • هێچ سالْێکی پێ نەچوو سکۆتلندەییەکان بەپـارە فرۆشتیانـەوە بەپەرلەمانی ئینگلیزی ، پاش شەش مانگ پەرلەمان دای بـە لەشـکرکە هێنایانە کۆشکی (هامبتون کورث)و بە هەمو پیاوەتیەکەوە لەگەلْیا جولانەوە، ئەمجار کرۆموێل‌و هاوریکانی دوانیـان لەبابەت ئاسـایشیکی بـەدادەوە بۆهەردوولاو گەلێ داوا کاری‌ی کەشیان لێ‌ویست ، کەچی پەندی لـەم هەموو کارەساتانە وەرنەگرتبو هەتا کەرەتیك بە کەللە رەقی‌و تورەییەوە داواکانی لەشکری پەرچ‌دایەوەو هەر ئەمرۆو سبـەی پێ‌ئـەکردن بـەو هیوایەی گوایە سکوتلندەییەکان فریای ئەکەون ، لەم کاتەوە هەمو بۆیان دەرکەوت کە رێك‌کەوتن لەگەلْیا مەحالە ، ئەئاوا قسەی ئەوانە هـاتەدی‌ی کە ئەیان‌ووت بۆ بەرزی نیشتمان وا باشە لێ‌خوش‌بوون لەم کابرایە نەبێت • ئەمجا شارل لەخۆی ترسا ، هەستی بەو گێژانە کرد کە دەورو خـولی دوا رۆژی‌ئەدا •

لەژێر باڵی تاریکیدا لەکۆشکەکەیەوە رای کرد بۆ دوورگەی ( وایت ) لەگەڵ سکوتلندەییەکان کەوتە گفتو گۆو پەیمـانی لێوەرگرتـن کـە لەشکرێکی یارمەتی دەری بۆ رێك بخەن و بچن بەگژ کرۆمۆیلدا بەڵام لەپیش ئەوەدا ئەم خەوەی بێتەدی جاریکیتر کەوتەوە دەس پەرلەمان ، کە جاریکی تریش ویستیان لەگەلیا رێك بکەون بەجوریکیتر ، بەڵام چونکە شا سواری سەری خۆی بوبوو ، پشتی بە سکۆتلندەییەکان ئەبەسـت بە تـورەیی و قینەوە وەڵامی پەرلەمانی دایەوە •

ئیتر لەوزەی پیاوانی لەشکرا نەما خۆیان راگرن ، گرتیانە ژێر دەستی خویان ، لە دواییدا لەدورگەوە هینایانەوە لەکوشکی (سان جیمس) دانـرا تا رۆژی محاکمە •

محاکمەی شارل :ـ

کە بریاری محاکمە کردنیان دا هەندێك لە ئەندامـەکانی ئەنجومـەنی گشتی دوو دڵ بوون بۆ ئەم کارەساتە ، کرۆمۆیل ئەمانەی دەرکرد ، هـەر ئەوانەی هێشتەوە کە سازکاربون لەسەر محاکمە کردنی ، دادگایـان بـۆ پێك هێنا لە ئەندامەکانی پەرلەمان بەسەر کردەیی (مستر جون برادشو)و ئەندامیەتی زۆر لە سوێندخـوارانو سـەرکردەکانی لەشـکر ، لەپێـش هەمویانەوە (اولیڤر کروموێل)ی سەرکردە •

رۆژ رۆژی ٢٠ی ینایری ساڵی ١٦٤٩یە • ئێستاکە واین لەهەیوانـە گەورەکەی کۆشکی ویستمنستر ، ئەوە سەرۆکی دادگاو ئەندامەکانیەتی لەلای ژورووەوە دانیشتون ، لەبـەر دەمیانـا مێزێـك هەیـە شیرێـك و سەوڵەجاتێکی لەسەر دانراوە کە نیشانـەی دادن ئەوەش شایە بەجۆریکی ناریك لەدادگادا دانیشتوەو شەبقەکەی هەر لەسەرایە ، ئەوەش قاپی دادگادا خراوەتە سەرپشت بۆهەمو سەیرکەریك •

ئەوا محکمە دەستی پێکرد ، وا سەرۆك هەلساو رووی دەمی کـردە شـارل ستیوارت شای ئینگلتەرە وتی : ئەنجومـەنی نوینـەرانی گشـتی زۆرباش هەستیان بەو نەگبەتیانە کردوە کەهات بەسەر شـانی میللەتـا ، ئەمەش لەتۆ ئەناسیت ، لەبەر ئەوە بریاریدا بە محاکمەکردنـت • ئەنجـا گوناهەکانی خوینرایەوە ، شا هەر گوێشی نەدایـە لەدوا دێـرا نەیێـت کەنوسرابوو (لەبەر ئەمانە شارل ستیوارت بەزۆردارو پیاوکوژ گوناهبار ئەکەین ) لیرەدا بەتەوسەوە پێکەنینێکی بەرزی دەربری ، ئەمجار سەروك رووی تێکردو ووتی گەورەم وەلآمت چیە ؟ •

وتی (من لەپیشا ئەمەوی بزانم کە بە چ دەسەلآتیك بانگتان کردومەتە ئیرە ؟ ئەوسا وەلآمتان ئەدەمەوە ) •

ــ بەناوی میللەتی ئینگلترەوە پرسیارت لێ ئەکەین کە تۆی هەلبژاردوە بە شای خوی •

ــ چ رۆژیك ئینگلترە شای هەلبژاردوە ؟ وەلآمم بدەنەوە •

ــ گەورەم وا دەرئەکەویت تۆ پرسیار لە محکمـە ئەکەیـت ئەمـەش پێچەوانەیە ، ئەگەر وەلآم نەدەیتەوە محکمە فەرمانی خۆی ئەزانیو ئەوانی هیناویتیان ئەت بەنەوە • دوای ئەوە شایان بـردە دەرەوە ، لەریگای بەندیخانەکەش هەندیك هاواریان ئەکرد (خوا ئاگای لە شا بێت) بەلآم زۆریتر هاواریان ئەکرد (بژی داد)• دوای دوو رۆژیتر دوەم دانیشتنی محکمە بوو ، شا هەر قسەکەی جارانی کردەوە •

سەرۆك : گوناهبار حەقی ئەوەی نیە کە لە محکمە بکۆلیتەوە •

شـا : من بۆرە گوناهباریك نیم ، ئایا کەی ئەنجومەنی گشتیی بوە بـە (مەحکەمەیەکی قضائی) ؟

سەرۆك : پۆلیس بیبەنە دەرەوە •

دانیشتنەکەیان خستەوە رۆژی ئایندە ، لەسێهەم رۆژا دادخوازی گشتی هەڵساو بە محکمەی ووت : شا گاڵتە بە محکمە ئەکات لەپاشا رووی دەمی کردە شاو وتی : پێویستە لەسەرت بەتەواوی وەڵامێکی ئاشکرای محکمە بدەیتەوە ، داد گوێ ناداتە سەنگینی ئەمو ئەو ، ئایا ئەو خراپانەی پێی گوناهبار کراویت کردوتە یان نا ؟ • هەر چەند محکمە لە شای گەیاند ئەگەر بێتو وەڵام نەداتەوە لەسەر ئەوە فەرمانی بۆ ئەدرێ ، کەچی شا لە کەلیشەیتان نەهاتە خوارەوەو هەر ئەیووت (ئیوە بە چ دەسەلاتیك پرسیار لەمن ئەکەن) • لەسەر ئەمە دانیشتن خرایەوە روژی ئاییندە •

لە رۆژی ٢٥ی ئەو مانگەدا بەنهێنی گوێ لەشایەتی شایەتەکان گیرا، کە زۆریان سەربازی لەشکری کرومۆیل بوون شایەتیان دا کە بە چاوی خۆیان شایان دیوە لەناو لەشکرەکەیا شەڕی لەگەڵ لەشکری پەرلەمانا کردوە ، واتا گوناهی کوشتنی میللەتو ژێردەسەکەی خۆی کەوتە ئەستوی •

بۆ رۆژی شەمەی ٢٧ی مانگ دوا رۆژی دانیشتنی محکمە بوو کاتیك شایان هێنا میللەت لەدەرەوە هاواری ئەکرد (خنکاندن ــ داد ــ خنکاندن)•• ئەمجار سەرۆك هەڵساو دوانیکی دریژی خوێندەوە ئۆبالی هەمو گوناهەکانی خستە ئەستوی شا ، شا ویستی قسەکەی پێ ببرێ ، سەرۆك وتی قسەکەم پێمەبرە ، تازە بەسەرچوو هەتا لێ بوەوە ، دوای ئەوە بریاری محکمە خوێندرایەوە ، کە بریاری ملپەڕاندنی شارل بوو ، لێرەدا شا هاواری کرد گەورەم رێی یەك قسەم بدەن ، سەرۆك وەڵامیدایەوە : گەورەم دوای خویندنەوەی فەرمان حەقی قسەتان نەما ، ئا دەی نوبەچی بیبەنە دەرەوە •

رۆژێك لە رۆژانی کانونی دوهەمی ساڵی ١٦٤٩ بە یەکەم لیدان سەری شارل لە لەشی جیاکرایەوە ، لاشەکەشی لە کڵێسەی (سان جورج)ی شاهانە لە کۆشکی (وندسەر) نێژرا ...

سەرنجێك لەم روداوە :

دوای خویندنەوەی پیشەکیەکەو ئنجا دادپرسیەکەی شارل ، پیاو لەرێوە ئەوەی بۆ روون ئەبێتەوە ، کە بەربەرەکانیەکی بەردەوام لەبەینی میللەتی ئینگلیز (کە نوینەرەکانی ئەندامانی پەرلەمان بوون)و لەبەینی (شارل)ی شا یاخود (مەلیك)یاندا ، هەبوە کە تاهاتوە پەرەی سەندوە شا ویستویەتی بەئارەزووی خۆی ، چیئەویت بیکاتو کوتەك بوەشێنێت . میللەتی ئینگلیزیش لەو کاتەدا لەخەوی دوای سەدەکانی بەرو ، چاوی هەڵهێنابوو تۆزی زۆرداریی لەشانی خۆی ئەتەکاندو دەستی بەتیوری (دەسەلاتی شا لەخواوەیەوە) ئەنا کەبڕواو نەگەرێتە دواوە. ئەیویست خۆی لەرێی پەرلەمانەوە حوکمی خۆی بکاتو قەیناکات با (شا)ش هەربمینێ کە ئەمە وەرچەرخانێکی گرنگ‌بوو لەژیانی ئەو میللەتەدا .

جا ئەگەر ئیمە وازمان لەلایەنی میژویین هیناو دانیشمان بەوەدا نا کە ئەم‌کارە زیاتر کارەساتیکی رامیاری‌یە ، دوای ئەوە ئەگەر ئاورێکمان لەو تیوریەی تر دایەوەکە ئەڵێت (گەل سەرچاوەی هەمو دەسەلاتێکە) ئەوسا ئەتوانین روداوە سەرەکیەکەی ئەم کارەساتە بسەلمێنن کە محاکەمەی (شا)ی ئینگلتەرەیە .

دیارە شارل کابرایەکی کەللەشەق‌و سەرەرۆبوە ، هەرگیز ئەوەی بەپیرا نەهاتوە کە رۆژێك لەرۆژان یەکێك بتوانێت بەرامبەری بوەستێ ، بەتایبەتی کە ئاوڕی لەشاکانی پیش خۆی‌و ئەوانەی دەرودراوسێی‌و شاکانی تری ئەوروپا داوەتەوە کە هەمو هەرخۆیان حساب‌بوون‌و هیشتا

شۆرشە مەزنەکەی فەرەنسەش بەرپا نەبوبوو کە ئەوروپـای بەتایبـەتی‌و جهانی‌بەگشتی‌ی وریا کردەوە ...

دوای ئەو هەموو سەرکیشی‌و شەروشۆرو پەرلەمـان داخستنـەی کەشارل دەستی‌دایە ، لەئەنجامدا هەر پەرلەمان (واتا هێزی گەل) سەرکەوت، ماددەی دەستوور گۆررا ، یاسایەکی تایبەتی بۆ محاکەمەی (شا) دانـرا . ئەوانـەی محـاکەمەی ( شـا )یـان کـرد ( سویـنـد خـۆرەکـان ) بوون بەسەرۆکایەتی دادپرسێکی ناوداری ئەوروژەو ئەندامیەتی زۆر کەس یەکێك لەوانە (کرومویل)ی پێشەوای سوپای گەل بوو .

ئەو دادگایەی بۆ ئەم پیاوە پێك‌هات بەدادگایەکی (شۆرش) دائەنرێت، بەلاّ بەکارەساتی دادپرسی‌یەکەدا دیارە ، ئەوپەری رێزی شاگیراوەو بـەو خوێن‌ساردیەی کە ئینگلیز ناویان پی دەرکردوە لەگەلّـیدا جولاونەتەوەو مافی بەرگری‌ی تەواوی پێ‌بەخشراوە ، بەجۆرێك سەرۆکی دادگاش لـە ( گەورەم )ی کەمـتر پێ نەوتوە . بەپێچەوانەشەوە . گوناهبـار رێزی نادگای نەگرتوەو گالّتەی بەسەرۆك‌و ئەندامانی‌کردوە ، وەلاّمی پرسیارەکانی نەداوەتەوە . بێ‌گومان دوای ئەمانە دادگا ناچار ئەبێت (دوای ئەوەی بەلـگەی تەواوەتی وەدەست ئەهێنێت ) فەرمان دەرکات ، ئەوەبوو فەرمانی مل‌پەراندنی شارلی‌دا ، ئەوسا کە بریارەکەیان بۆخوێندەوەو هەستی بەخۆی‌کرد کـەوا پەتەکە گەیشتە ملی ، ئەوسا هاوار هاواری پی‌کەوت‌و داوای قسەی ئەکرد، بەلاّم دوای ئەوەی بریار دەرچوو ، کار لەکار ترازا .

بەکورتی ئەوەنـدەی روداوی ئـەم دادپرسـی‌یـە دەری‌ئەخـات ، کەموکوریەکی یاسایی تێدا بەدی ناکرێت ، بەتایبەتی (مافی بەرگری لەخۆ) کە بە تەواوەتی بەگوناهبار بەخشراوبوو .

# موحاكەمەی لویسی شانزەهەم
# شـای فەرەنسە

لویسی شانزەهەم دوا پاشای فەرنسە ، ئەگەر بهاتایەو بەقسەی میللەتی فەرەنسەی بکردایەو گوێی لەقسەی نوینەرەکانی بگرتایە ، هەوڵی لابردنی ئەو پوخلەواتەی بدایە کە لە پاشاکانی پێش خۆی ـ یەکجار لویسی پانزەهەم ـ بەجێمابوو ، بێ گومان میللەت لایەن گیریان ئـەکردو رۆژی بـەورۆژە نەئەگەیی ، بەڵام هەر کەسە خۆیو بەختی • رێگای کەوتە کۆشکێکی شاهانەی پیسی ئەوتـۆوە هەر کەسێـکی تیـابوو خەریـکی تێرکردنـی ئارەزووی خۆی بوو ، جگەلەوە یەکێکی دڵسۆزی ژیریش نەبوو رێگایەکی خێری پیشان بدا ، کابرا خۆشی زۆرکەم تێگەیشتنی هەبـوو بەدەگمـەن هەستی بەشتی ورد ئەکرد ، بێجگە لەمانەش ، خوا تووشی کردبو بەتووشی ئافرەتێکی بێلیکدانەوەی کەللەشەقی منالەوە (ماری ئەنتوانیت)ی ژنـی کە لەهەمو ئیشوکارێکی دەوڵەتا هەڵی ئەدایەو خۆی تێهەڵ ئەقورتان ، ئەمەش ئەبوو بەهۆی ئەوەی میللەت زیاتر رق لەخۆیو شای مێردی بکێشێ ، تـا وای لێهات جێگا بەشا تەواو لێژکا ، هیچی بۆنەمایەوە ، بریاری راکردنیدا، بەڵام بۆینەچوە سەر ، نەیتوانی لەهیچ لایەکەوە خـۆیو مـاڵو منـالی دەربازکا ، تا سەر خەتی سنووریش رویشتن لەکاتی شۆرشـدا ، بـەڵام جمهوریەکانی ئەوناوە پێیانزانین ، بە دیلی گەرانیانەوە دواوە ، ئەمە بووبە هۆی ئەوەی جمهوری خوازەکان زیاتر تەقەلای لابردنی بدەن ، هەرچەندە یەکەمجار ئەمانیش بۆیان نەچوە سەر بەڵام دوای ئەوە شاو خێزانەکەی زۆر

بەسووکی تەماشا ئەکران ، تا وای لێهات میللەتی رق ئەستور لەشا ، هێرشیان بردەسەر کۆشکی (تۆیلەری) ، شا ناچاربوو خۆی هاویشتە ژێر سێبەری (پەرلەمان) کە لەوێشدا میللەت نەی‌هێشت ماندوی بحەسێتەوە تاکو لە بەندیخانەی (تامبل)یان لەرۆژی ١٣ی مانگی ئابی ١٧٩٢دا توندکرد .

دوای کوشتارەکەی مانگی ئەیلولی ١٧٩٢ هێزی جمهوریەکان تەواو پەرەی‌سەند ، تاکو رۆژی ٢١ی ئەومانگە کە کۆمەڵی میللی کۆبوەوە بریاری لابردنی لویسیان لەسەر تەختی شاهانەداو جمهوریەتیان دامەزراند ... ئەو دەمەی شا لەبەندیخانەدا بوو ، هەندێك ئەیانویست دووری‌خەنەوە بۆ جێگایەکی چوڵو هەندیکی‌تر وایان بەباش ئەزانی هەر لەبەندیخانەدا بمێنێتەوە ، بەڵام ئەمانە هیچیان پەسەند نەکران لەترسی ئەوەی نەك لەولاتەکانی ئەوروپاوە ، یا هەر لەناوخۆدا هەولی دەربازبوونی بدرێت .

ئەوانەی زۆر داخ لەدلبوون لێی ، ئەیان ووت کوشتنی پێویستە ، هەر لەبەر ئەوەبوو لەئەنجامدا بریاری محاکمەکردنی درا .

لەبارەی محاکمەشیەوە دوو باسیان هینایە کایەوە ، یەکێکیان ئەڵێت دەستوری ساڵی ١٧٩١ کە لەئەنجامی شورشی گەورەدا دانرا بریاری داوە کە شا پێویستە بپارێزرێ‌و ئەگەرگوناهێکی بوو لەسەر تەخت لاببرێت .

ئەوی کەیان ئەڵێت هەمو دەستورێك لەلایەن میللەتەوە دائەنرێ‌و میللەت هەرخۆی حسابە ، شایەك لەوانە بێت لەژێرەوە خەریکی خراپەکردن بێت دەربارەی میللەت‌و هەوڵی ئەوە بدات میللەت بشکێنێ ، نابێ تەنها بەلابردنی لەسەر تەخت وازبهێنرێ ، بەلکو پێویستە بەتەواوی جەزای خۆی وەربگرێت .

لەئەنجامدا هەر بریاری محاکمەی لەبەر دەمی کومەلی میللی‌دا دراو

ئەو ئیشە ناپەسندانەی کەکردویەتی بۆی جویَ بکریتەوەو کۆمەڵ بـۆی بخوێنێتەوە ، جگەلەوەش پشتیوانێك بگریَ بۆ پاریزگاری‌ی •

لەرۆژی ١١ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٧٩٢دا لویسیان لەبەر دەمـی کۆمەڵی میللیدا راگرت‌و خراپەکانی کەکردبونی بەرامبەر بە میللەت یـەکە یەکە بۆی خۆیندرانەوە :

١ ـ مۆرنەکردنی دەستورو لاپەڕەی مافی مرۆڤ •

٢ ـ بەرهەڵستی‌ی ئەو ئیشانەی میللەت بریاری دابوون •

٣ ـ بەرهەڵستی‌ی شورشی گەورە بەیارمەتی هەندی لەنوینـەران کـە یەکێکیان (میرابۆ) بوو •

٤ ـ تەقەلادانی راکردن لەبەندیخانەوە بۆ دەرەوە ، بۆ ئـەوەی هێرشی دەولەتانی ئەوروپاو بێگانە بهێنێتە سەر فەرەنسە •

٥ ـ هاندانی هەندیَ لەسەرکردەی ولاتە بێگانەکانی ئەوروپا ، بۆیارەمەتی‌و دەربازبوونی •

٦ ـ ئەو بووبەهۆی کوشتارەکەی ١٠ی کانونی یەکەمی ١٧٩٢ •

٧ـ هەڵکوتانە سەر کۆمەڵی میللی لە رۆژی ٢٣ی حوزەیرانی ساڵی ١٧٨٩ بۆ ئەوەی بەزۆر هەندیَ قانونیان پیَ بریاربدا •

محاکمەی لویس دەستی پیَکرد ،لەکاتی محاکمەدا هەر پرسیاریکیان لەوانە لیَئەکرد ، وەڵامیکی وای نەئەدایەوە کە ئەقل بیبریَ ، بۆ هەنـدیَ لەو کارانە وەزیرەکانی گوناهبار ئەکرد ، بۆ هەندیکی کەشیان شانازی‌ی بەدەستوری یەکەم جارەوە ئەکرد کە ئەو ریَی‌داوە ، لەهەمووی خراپ‌تر هەرچی نوسراوێکی سیاسی کە لەوەپیش لویس لەگەڵ خوێیەکانیـا بـۆ یەکیان ناردبوو هەمووی دەست کۆمەڵی میـللی کەوتبـون ، ئەمـانەش هەموویان بۆی بوبوون بەبەڵا ••

لویس سی‌کەسی لە محامیە هەرە بەناوبانگەکانی ئەودەمـە گـرت (ترونشیە)و (لامانیون رومالزیرب)و (ریمون دوسیز) ، ئەمانە هەرسێکیـان لەبەندیخانە لەگەڵیا کۆبونەوە ، (ریمون دوسیز) پاریزگاریەکی ئـاگرینی بۆنوسیبوو یەکێك لەهاورێـکانی لەترسـا پێی گـۆڕی ، هـەر لـەو کوبونەوەیەدا لویس راسپاردەیەکی زورکاری‌گەری نوسی‌ی بۆ کورەکەی: (•• ئەمەوێ لەکوڕی خۆشەویستی خۆم ، ئەگەر نەگبەتی سەرشانی گرت‌و چوە سەرتەخت ، ژیانی خۆی لەرێگای خۆشی‌و بـەرزی نیشتمانەکەیـدا بەخت‌بکا ، گوێ نەداتە تۆڵەسەندن‌و ڕقو کینە ، لەو کەسانەش خۆش بێ کە خراپەیان لەگەڵ باوکیا کردوە ) •

لە روژی ٢٦ی مانگی ئەیلولی ئەو ساڵەدا کە بەناوبانگ ترین رۆژیکە لە مێژووی شاهانەی فەرەنسەدا ، لویسی شانزەهەم بۆ محاکمە لەبەردەمی نوینەرانی کۆمەلی میـللی‌دا وەستا ، یەکێـك لەپشتیوانـەکان (دوسـیز) بەرگریەکی دورودرێژی ریك‌خستبو کە نزیکەی دوو سەعات هەر لەسەر کاربەدەستی‌ی وەزیران‌و بێ‌تەرەفی شا دوا ، زۆر جار وشەی رەق رەقـی بەرامبەر بەکۆمەڵی میللی بەکار ئەهێنـا بێ‌ئەوەی کەس لێی بێتە جواب ، چونکە گوایە ئەیان‌ویست پاکی‌و بێ‌لایەنی محاکمـەکە رابـگرن ، تـاکو (دوسیز) لەهەندێ جیگادا بەکۆمەڵی میللی‌ی ئەووت ( ئێوە لە حاکم ناکەن، بە ئاشکرا بوون بەدوژمنی شا ) تاکو هەرچیەکی نوسیبوو خویندیـەوە ، ئەمجا وتی پێویستە لەسەرتان فەرمانێکی پاکی راسـت بـدەن ، چونـکە لەپاشەرۆژا ئەم فەرمانەی ئێوە ئەچێتە لاپەرەی مێژووەوە ، مێژوش ئەوساکە فەرمانی خۆی بەسەر ئیوەدا ئـەدا (١) ، ئەمجـا لـە لویسیـان پرسـی چ‌قسەیەکت هەیە بیکە ، ئەویش هەڵساو ووتی : هیچ کاتیك من ئەم‌ویستوە خوێنی گەشی میللەتی فرەنسە برێژم‌و ئێستاکەش ئەڵـێم (رەنـگ هەیـە

---

(١) لەدواییدا لەسەری (مالزیرب) دراو (دوسینر) فرێ‌درایە بەندیخانەوە .

ئەمەش دواقسەم بێ) کەوا من هێچ کاتێك گوناهبار نیم لەم رووەوە قسەی محامیەکانم قسەی منە •

دوای ئەوەی لویس قسەی تەواوبوو بردیانەوە بۆ بەندیخانە ، ئەمجا بوبوو بەهەرا لەناو ئەندامەکانی کۆمەلی میللیدا ، بۆ ئەوەی قسە لەکاتی بریاردانی محاکمەکە بکەن ، هەرا پەیدابوو ، بووبە هۆی ئەوەی ئەندامەکان لەناوخویانا بکەونە پەنگەو باو لەیەك دەرهێنان ، یەکتر بە ناپاكو ناکەس‌بەچە دابنێن •

لە رۆژی ٤ی کانونی دوهەمی سالّی ١٧٩٣دا ئەنجومەنی کۆمەلّی میللی سێ پرسیاری دانا بۆ ئەندامەکانی کەپێویستە لەماوەی دە رۆژا وەلامی بدەنەوە:ــ

١ ــ ئایا لویس گوناهبارە بەنیازی قلب کردنەوەی سەربەستیو ئاسایشی میللەتی فرەنسە ؟

٢ ــ هەر بریارێك درا بەسەر لویسدا لەدوای محاکمە ، ئایا پێویستە میللەتیش ئەو بریارە مۆربکات ؟

٣ ــ لە پاداشی ئەو گوناهانەدا ئەبێ چ تۆلەیەك لە لویس بسێنرێو چ سزایەکی بدرێت ؟

دوای لێدوان قرەو هەرایەکی زۆر پەیدابوەوە لەسەر وەلامی پرسیاری یەکەم ، ئەندامەکان سەیریان‌کرد ، بەگوێرەی زۆرو کەمی دەنگ بریار بدەن لە هەموو شتێك چاکترە ، کە قسەیان لێکرد لە ٧٤٩ کەس ٦٨٣یان دەنگیاندا بەناپاکی لویس ، بۆ پرسیاری دووەم ٤٢٤ ئەندام بریاریاندا کە هەر فەرمانێك بەسەر لویسدا بدرێت ، پێویستی بە مۆرکردنی گەل نیە ، ٢٨٣ ئەندامیش بەپێچەوانەی ئەوان دەنگیاندا ، نزیکەی ٤٠ کەسیشیان بێدەنگ مانەوە •

سییەم : چ فەرمانیك بەسەر لویسدا بدەن بەرامبەر بەو گوناهانـەی کردونی ؟ لەدوای هەراو بگرێکی زۆر بریاردرا کەوا تۆڵەی بەخنکانـدن لێبسێنن ••• ئەمجا ئەوانـەی کەسەر بەشـابوون (جیرۆندیـەکان) زۆر تەقەلایاندا کە خنکاندنەکەی دواخەن بۆ کاتیکیکە ، هەندێـکی تریـان بەپەرۆشەوە ئەیانویست دوای ٢٤ سەعات هەمو شتێك ببڕێتەوە ، لەسەر ئەوەش لەرۆژی ٢٠ی مانگی کانونیدوهەمی ئەو سـاڵەدا ، ئەنـدامەکانی ئەنجومەن کۆبوونەوە، لەوانە ٣١٠یان بریاری دواخستنی خنکاندیاندا،بەڵام ٣٨٠یان بەپیچەوانەی ئەوانەوە ، ویستیان کە بەگورجی هەمـوو شتێـك ببڕێتەوە ، هەر لەو رۆژەدا بوو ئیوارە (جـارا) کە وەزیـری عدلیـە بوو فەرمانەکەی بۆ لویس خوێندەوە •

دوای ئەوەی بەمجۆرە بریاری کوشتنی درا • لویس داوای بینینـی خیزانەکەیو منالەکانو کەسوکاری کرد ، هەموبانیان بۆ برد ، قسەیـەکی زۆری لەگەڵ کردن ، کوڕو کچەکەی گرتە بـاوەش ، تێرتێر ئـەملاولای ماچکردن ، لێرەدا لەبەر گریانی (ماری ئەنتوانیت)ی ژنیو هەنسكو قوڵپی گریانی کورەبچکولەکەی کەس گوێی لەهیچ نەبوو ، نزیك جیابونەوەیان دیسانەوە بەکوڕەکەی وتەوە (راسپاردەکەمت لەبیر نەچێتەوە هەولی تۆڵـە سەندنەوە نەدەی ) ••

دوای رویشتنی ئەوان تا نیوەشەو لەگەڵ ئەو قەشەیەدا رایبوارد کە خۆی داوای کردبوو بۆ ئەوەی قسەو نەهێنی [1] دڵی بۆ بگیرێتەوە ، ئەمجا سەری نایەوەو نوست ، لەهەموی سەیرتر ئەوەبوو کەبەنۆبەچیەکەی ووت بەیانی زوو خەبەرم بکەرەوە ، هەر بەرەبەیان خەبەریان کردەوە ، دیسانەوە لەگەڵ قەشەکەدا یەکیان گرتەوە •

---

(١) ئەمە پێی ئەوتری (اعتراف) کەلەلای دێانەکان باوە .

ئەموستیلە دەزگیرانیەکەیو تالێ لەکاکولی داناو رایسپارد بیدەن بە شاژن ، ئەموستیلەی شاهەنشاهیش کە مۆری خۆی تیدا هەڵکەندرابو بۆ کورەکەی نارد •

بۆ سبەینێ کە رۆژبوەوە خستیانە عەرەبانەیەکەوە بردیان بۆ مەیدانی شۆرش لەوێ قەڵەباڵغیکی یەکجار زۆر کۆبووبوەوە بۆ سەیرکردن ، کە گەیشتە نزیك شوێنی خنکاندن ، سەرکەوتە سەرێ ، چاکەتەکەی بەدەستی خۆی داکەندو دوگمەی یەخەکەی ترازاند ، شەبقەکەی داگرت ، کاکولەکەی کردەوەو لەبەردەمی قەشەدا بەچۆکا هات ، تاکو دەستیان لەپشتەوە بەستەوە ، کە بانگیشیانکرد بەپێی خۆی چووە پیشەوە ، لەوکاتەدا هەراو قاووقیژێکی زۆر ئەهات ، تکای کرد کەهەموو بێدەنگ بن ، کە بێ دەنگبوون ووتی (ئیستاش هەر پاکمو بەناحەق ئەڕوم) دوای ئەوە سەری کردە سەر ئاسنی ملپەڕاندنەکە ، کابرای سەربڕ بەتەورەکەی بەهەموو هێزی خۆی لەگرێی ملیدا ، قیژەیەکی لێوەهاتو ملی لەلەشی جیابوەوە ، ئەمجا کابرای ملپەڕێن سەرە بڕاوەکەی بەکاکولەکانی هەڵگرتو هاویشتیە ناو خەلکەکەوە ، خەلکەکە پەنجەیان لەخوینەکەیەوە ئەداو ئەیان ووت : ئوخەی •

بەکورتی ئەو کەسانەو ئەو کارانەی بوون بەهۆی ملپەراندنی لویس ئەمانەبوون :ـ

یەکەم : ژنە سەرەڕۆ کەللەشەقەکەی ، کەشا خۆی جڵەوەکەی لەدەس دەرچوبوو ، دووەم : ئەو راویژکەرە پیاو خراپانەی کەدەوریان گرتبوو ، سێیەم : ئەو زەمانەی کەتێی کەوتبوو لەگەڵ ئەو ناوچەیەی کە تیا ئەژیا ، چوارەم : ئەو کارە چەوتانەی شا پاشلپیسەکانی پیشخۆی ئەیانکرد وایان بەسەر هێناو رۆژیان گەیاند بەورۆژە •••

**سەرنجێك لەم دادپرسی‌یە :**

شۆرشە مەزنەکەی فەرەنسە بلّقێکی سەرئاو ،یا گروکفێکی لەپرر نەبوو٠٠ بەڵکو شۆرشێك‌بوو لەئەنجامی ئەو روداوانەدا پەرپابوو کە سالەهای سالّ لەسەریەك کەڵەکە ئەبوون • رژێمێکی پاشایەتی کەیل لەزۆرداری ، پرر لە (پیلان)و داوین‌پیسی‌ی‌و بێ‌ئابرویی•••دەرەبەگ‌و بەگەکان‌و پیاوەئاینیەکان، چینەکانی‌تری گەلیان ئەچەوساندەوەو خوینیان ئەمژین ، خەرج‌و باجێــکی زۆر خرابوە سەر میللەت ، شیرازەی داد پچرابوو ، مۆری بێدادی بەهەمو کارێکەوە بوو ، هەر لەسەردەمی لویسی پانزەهەمەوە فەرەنسە شەقــاوی گەورە گەورەی بەرەو شۆرش ئەنا ، زولم‌و زۆری چەندەها سەدەو ســاڵ سەریەك کەوتبوون کە بەرووی لویسی شانزەهەمدا بتەقێتەوە •

ئەوی راستی‌بێ لویس لەلایەن خۆیەوە ئەیویســت شتێك‌بــکات‌و تۆزێك دەست‌بە باری ولاّتدا بهێنێتەوە ، چونکە هەستی بەوەکردبو کەگەل ئەکولێت ••• بەلاّم هیچی بۆنەکرا چونکە هەرگیز نەیئەتوانی لەقسەی ژنە سەرکێشەکەی‌و دەوروپشتە بۆگەنەکەی خۆی دەرچێت یاخود لەژیــانی پرر کەش‌وفشی خۆی کەم‌کاتەوە ، جگە لەوەی لویس هەر لەخۆیدا ئەو توانایەو ئەو لێ‌هاتوییەی نەبوو کە بتوانێ شتێك بە شتێك بکات ••• ئیتر ئەوەبوو میللەت دەست‌پێشکەری خۆی کرد ، کۆمەڵەی نیشتمانی‌ی پێك‌هێنــا •• هێرشی بردەسەر باستیل لەرۆژی ١٤ی تەمووزی سالّی ١٧٨٩دا قاپیەکــەی شکاند ، کەبەوە شۆرشی راستەقینە دەستی پێ‌کرد • دوای ئەوە کۆمەلّی نیشتمانی هەمو کاروبارێکی ولاّتی گرتە ژێردەست خۆی ••• لە ئەنجامدا شاوشاژن (لویس‌و ماری ئەتتوانیت) گیران•رۆژی ٢٠ حوزەیرانی سالّی١٧٩١ لویس لە بەندیخانە بەرەو سنوور رای‌کرد کە لەویوە بەیارمەتی هێــزی بێگانە پەلاماری شۆرشگێرەکان بــدات ، بــەلاّم نەیتــوانی دەرچێــت ، دەست‌بەسەر گیرایانەوەو لەقەلاّی (تامبل) خۆی‌و مالّ‌و مندالّی بەندکران••

بەێی لویس لەژێرەوە لەگەڵ دەولەتەکانی ئەوروپـا بەتـایبەتی ئەلەمانیـاو نەمسە ، دژی شۆرش هەرخەریك بوون ، چونکە ئەوانیش زەنەقیان لـە شۆرشەکەی فەرەنسە چوبوو کە ئەگەر وابروات ، رۆژێك دێـت جێـگا بەوانیش لەق دەبێت ، ئەوەبوو سوپایان ناردو لەسنووری فەرەنسـەش هەتن بەمدیواو کەوتنە شەری دەستەویەخە ، بەلاّم لەئەنجـامدا لەشـکری شۆرش سەرکەوت ، دوایئەوە لویسیان فرێدایە قەلای (تامبل)ەوە لەوی لەگەڵ ماڵو منداڵی بەندکرا تا بریاری محاکمەی دراو جمهوریەکان لـەو رقەدا دەستیان کرد بەکوشتنو سەربرینی دەستەو دایەرەی شا تا لـە ٢١ ئەیلولی ساڵی ١٧٩٢دا کۆنگرەی نیشتمانی بریاری لەسـەر تەخت هێنانـە خوارەوەی لویسو جارری رژێمی کوماریێدا ٠ دوای ئەو محاکمەیـەی کە باسمانکرد ، ئەوەبو بریاری سەرپەراندنیشی دراو لە کەللەیاندا ٠

لەراستیدا لویس خۆی دەستی لەم ئەنجامـەی خۆیـدا بەم شێوەیـە زۆربوو هەرچەندە گوناهی ئەوانەی پێش خۆشی هـەر بەسـەر ئـەودا شکایەوە ، بەلاّم خۆی چونکە کابرایەکی نیمچـە گێلو حولحولی بوو ، لەقسەی ژنەکەی بەهیچ جۆرێك دەرنەئەچوو هەرچەندە حەزی ئەکرد بەهەر شێوەیەك بێت باری فەرەنسە تۆزێکیش بێت بگۆرێت ، بەلاّم تەقەلایەکی بەدڵی نەدا ، بەلکو لەدواییدا دەستی لەگەڵ دوژمندا تیکەڵ کرد کە ئەمـە بووبە بەلگە بەدەستی کومەڵی نیشتمانیەوە کە لەپێشدا لەملی خۆی ئنجـا لەملی ژنەکەشی بدەن ٠

ماری ئەتتوانیت لەرۆژی ١٨ تشرینی یەکەمی ساڵی ١٧٩٣دا راپێچی دادگای گەل کرا ، داواکەری گشتیی بریاری تومەتەکانی بۆ خۆیندەوە ، ئەو بریارەی کە پرربوو لە جینۆو قسەی پیسو سوكو هەرەشە ، کە نەئەبو، بەو جۆرە بەرامبەر بەئافرەتێکی گوناهبار لەقەفەزی ئاسندا وەستاو ئـەو قسە ناشیرینانە بکرێت ، بەلاّم ماری بە لەسـەرخۆییو ئازایانـە وەلاّمـی

تۆمەتەکانو پرسیارەکانی دادگای دایەوە لەدانیشتنیکدا کە نزیکەی حەفدە سەعاتی خایاند،شۆرشگێرەکان پەلەیان بوو ئەیانویست زوو لەکۆڵی کەنەوە، بەڵێ هەرچەندە ئەم ئافرەتە هەرچی نەشێ لەکاتی دەسترۆیشتنیدا کردبوی، بەلام یەکێك کە هێنرایە دادگاوە ، پێویستە هەمو یاسایەکی دادگا پەیرەوی بکرێت بۆیە محاکمەی ماری ئەتنوانیت بەگالتە پێکردنی دادو دادپرسی دائەنرێت ، چونکە هەر لەپێشەوە بریاری سەرپەراندنی ئەو ئافرەتە درابوو، هەرچەندە پارێزەریشیان بۆ هێنابوو بەلام ئەوان بەچاوی خۆیان پارێزەرەکانی لویسیی میردیان دیی چیان بەسەرهات ئیتر چۆن ئەوێرن قسە بکەن ، دەلەگەڵ ئەوەشدا وەك پیاوی قانونو دادشوناس چیان پێکرا کردیان ، بەلام هێشتا محاکمە کوتایی نەهاتبو کە ئەوانیش فرێدرانە ژورەوە .

دوای ئەم خالانەی باسمانکردن ، ئایا بۆمان روون نابێتەوە کە محاکمەی لویسو ماری ئەتنوانیتی ژنی چۆنبوەو چۆننەبوە ، بەتایبەتی ئەگەر بەراوردێکی سەرپێیی ئەم دادپرسیبەمان لەگەڵ ئەوەی شارلی شای ئینگلتەرەدا کرد ، بەڵێ شۆرش شۆرشەو بۆ ئەوە بەرپابوە کە (دروشمی دادو یەکسانیو مافی مرۆ) بچەسپێنێ ، جا ئەگەر لەپێشەوە بەم جۆرە دەست پیبکات پیاو ئەبی دوعا بۆ ئەنجامی بکات ... دەههرواشبوو ئەو بێدادیو توندو تیژیە بێ سەروشوێنە بوو کە لەدواییدا بووبەهۆی سوتاندنی زۆر لەپێشەواکانی شۆرش بەئاگری شۆرش خۆی .

# موحاکەمەی ماری شارلوت کردای
# وکوشتنی مـارا[1]

دوای ئەوەی شۆرشە مەزنەکەی فەرەنسە رژێمی پاشایەتی (مەلەکیەت)ی نەهێشتو جمهوریەتی لەشوینیا سەپاند ، دوای ئەوە رۆڵەکانی شـۆرش ، لەناو خۆیاندا بەربوونە گیانی یەکتری • ناکۆکی ئاو پارتەکانو کۆمەڵەکانیش بە زۆری لەکۆنگرەی نیشتمانیدا ، دەرئەکەوتو دەنگیئەدایەوە ئیـتر هەر پارتە چاڵی بۆ ئەوی‌تر هەڵئەکەندو هەر پێشەوایەك بۆ سەری ناحەزەکـەی ئەگەڕا کە پانی‌کاتەوە •

لەپێش هەموو لایەکدا کاسەکە لەسەری (جیروندی)یەکاندا شکایەوە، کە پارتێکی لەسەرخۆو مام‌ناوەندی بوون لە کونگرەدا ، دوای ئەوان ئاگر داوینی سەرۆکە سەرکێشە توندو تیژەکانیشی گرتەوە ، وەك (داتـون)و (دیمولان)و (لاکروا)و هەندێکی‌تر ، تا گەیشتە (رۆبسبیر) خۆشی ، ئـەو رۆبسپیرەی کە ملی خۆشی هـەر بەو تەورە پـەرری کە مـلی گەلێـك لەدوژمنەکانی خۆی پێ ئەپەراند ••• دوای ئەویش (مارا) کە یەکێك بـوو لەپیشەواکانی شۆرش لەوانەی کە هەمیشە بە لارەشەکەو بەلای خراپـەدا نەبوایە ، شۆڕین کوشتن‌و خۆین رشتن نەبوایە هەرگـیز ئـاوڕی لەچـاکە نەئەدایەوە ••• کەس نەیزانی شۆرشی بیروباوەر لەسەدەی هەژدەهەمـدا

---

(١) بەکورتی لە کتێبی (قضایا التاریخ الکبری او اشهر المحاکمات والجرائم) نووسینی محمد عبدالله عنان المحامی . ادارة الهلال بمصر سنة ١٩٢٥. وەرگیراوە •

ئەم کابرا ئاڵۆزە پڕ گرێ داخراوەی لەکوێوە هینا ، کە لەدواییدا هەر ئــەو توندیو گرێیانە ، بوون بە سەرچاوەی هێزو بڵاوبونەوەی ناوو دەنگی مارا بەناو خەڵكو بەناو کۆمەڵەکاندا •

مارا لەساڵی ١٧٣٤دا هاتۆتە جهانەوە ، باوکی ئەسپانیــە ، هەندێــك ئەڵین خوێندنێکی وای نەخوێندوە ، هەندێکی تریش ئەڵێن گوایە پزیشك یاخود کیمیاگەریکی زۆر شارەزابوەو گەلێك زمانی زانیوە • لە لەش‌ولارا کەم‌و کوڕو لاوازو نابووت‌و تابڵێی توڕەو تڕۆ بوە ، ژیانی لە سەرەتــاوە بە خۆ بردنەپێشەوە دەست‌پێ‌کردوە لە کۆشکی دەوڵەمەندەکاناو هەمــوو جۆرە خزمەتێکی کردوون • کە شۆرشەکەی فەرەنسە بەرپــابوو ، مــارا بەزەمینەیەکی تەخت‌و فراوانی دانا ، بۆ دەستەڵات پەیداکردن‌و گەیشــتن بەئامانج‌و ئاواتی خۆی ، بێ سێ‌و دوو خۆی فڕێدایە ناویانەوەو تیکەڵاویان بوو •• وازی نەهێنا تا خۆی گەیاندە ناو پێشەواکانی ، مێشکی خستەکارو هەمو عەقل‌و فرۆفیڵێکی بەکارهێنا ، ئیتر لەو گێژەڵووکەو بشێویەدا ریگای پێشەوەی بڕی ، تا گەیشتە پلەی سەرەوە ، جڵەوی ئەو کۆمەڵەی گرتەدەست کە رقیان لەهەرکەس بوایە سەریان پان ئەکردەوە • یەکەم جــار بەهــۆی رۆژنامەکەیەوە (هاوڕێی گەل) خۆی بەمیللــەتی پــاریس نــاسی ، ئــەو رۆژنامەیەی کە لەمانگی ئەیلولی ساڵی ١٧٩٠دا دەستی‌کرد بەدەرکردنی • لەراستیشدا مارانوسەریکی قەڵەم رەنگین‌و رۆژنامەچیەکی خاوەن توانا بوو ، بگرە جڵەوو هەستی ئەو جەماوەرەی گرتبوە دەست ، چۆنی بویستایە بەو جۆرە هەڵی ئەسوراندن ، لــەرق هەڵساندنیانــدا ئەیــکردن بەئــاگرو ئارەزووشی بوایە ئاوێکی ئەکرد بەو ئاگــرەدا ، هەموویــانی ئەکــردەوە بەمێوو و رۆن ••• ئیتر بەکورتی مارا کابرایەکی سەیرو پڕ گرێ‌کوێــرەی ئەوتۆ بوو کە کەس تێی نەئەگەیشت • بــەڵام ئەندامــەکانی کۆنــگرە بەتایبەتی (جیروندی)یەکان ، لەسەر ئەو خراپیانەی ••• حەزیان لەچارەی

نەئەکرد ، بەرەنگاریی هیرشەکانیو داوا توندو تیـژەکانی ئەبـوون ...
چونکە ئالآی ویرانکردنو بەقڕدانی خەلکیی بەرز کردبوەوە ، لەهێرش بردنو کوتەك هەلسوراندنو تێکدان زیاتر ، بەلای هیچیتردا نەئەچوو ... بەخۆین نەبوایە تینویەتی نەئەشـکا ... دۆسـتو دوژمنـی وەکیـەك ئەپلیشانەوە ... دیتە ئەو رۆژەش شیرازە تێکچوبوو ، بۆیە قسەکانی ئەو زیاتر پەسەند ئەکرانو پتر خەلك لەدەوری کۆ ئەبوونەوە ... بەجۆرێـك ئەویان هەلبژارد بە نوینەر (نائب)و بە یاسادانەر (مشرع) ... لەولاشەوە هەتا ئەهات بەینی مـاراو جیرۆندیـەکان ناخۆشـتر ئەبـوو بەتایبـەتی لەکۆبونەوەکانی کۆنگرەدا ... هەرلایە بەدوای سەری ئەویترا ئەگـەرا تا جیروندیەکان هەلیان بۆ هەلـکەوت ... رۆژی ٢٦ی شوبـات ١٧٩٣ لەپارسدا کوشتاریکی زۆرکراو دوکانیکی زۆر تالآن کراوخانویەکی زۆر سووتا ... رۆژیك لەوەپیش (هاورێی گەل) خەلکەکەی تیژ کردبوەوە ، بەتالآن کردنی کۆگاکانو خنکاندنی بازرگانەکان بەبیانوی گرانییەوە هانی دابوون ، جیروندیەکان داوایان لەکونگرە کرد ، مارا محاکمە بکرێت ، هەر چۆنێك بوو کاریان لێکرد ، مارا راپێـچکرا ، بـەلآم بۆ دادگایـەك کـە ئەندامەکانی لە ئەنجامی هەولو تەقەلای ( یەعقوبیـەکان ) لـە روبسپـیرو داتنون هەموو لەهاورێی گیانی بەگیانیو هاورای مـارا خۆی بـوون . لەراستیدا محاکەمەکەش گالتە کردنێـك بوو بـە دادو دادگـەریی .

مارا نەك هەر رزگاری بوو بەلکو لەجاران گەلێك بەهێزتر بوو ، جگە لەوەی جیرۆندیەکان بەمە چالیان بۆ خۆیان هەلکەندو یەعقوبیـەکان واتـا (مونتانیار) پەلاماریان دان ، گرتیانو دوای محاکەمە لەملیان دان ... بەمە هەرا لەهەموو فەرەنسەدا پەیدابوو نارەزایی دەربرا ، بەلآم هەموو بەزەبری کوتەك دامرکانەوە ، ئیتر مارا بەوە گەیشتە سەری سەرەوەو ئەوەندەیتـر

دەســەڵاتی پەیــداکردو بووبە سەرۆکی لیژنــەی ( مراقبه ) ئەو لیژنەیەی (کۆمۆنە)ی پاریس پێکی هێناو گەلێك دەسەڵاتی پێبەخشی •

خۆین ڕێژی مارا کێبوو ؟

(ماری ئان شارلوت دی‌کردای) خانمۆڵەیەکی ئەوەندە جوان‌و نەشمیلە بوو لەجوانیا وێنەی نەبوو ، قەدباریك ، سوروسپی ، لەقسەدا دەنگ‌ناسك، خۆی هەرناسك ، ڕەوشتی بەرز ، تا بڵێی لەسەرخۆو بێ‌دەنگ ، لەهەموو سەرێکەوە جوانی‌ی‌و پاکی‌ی لێ ئەباری‌ی •••

لەساڵی ١٧٦٨دا لە دێیەك لە فەرەنسە هاتبوە دونیاوە ، دوای ئەوەی کە دایکی مرد ، لەکاتێکدا کە ئەم لەتەمەنی دوانزە ساڵیــدا بوو ، بــاوکی خستیە (دێر)ێکەوە لەناوچەی (کاین) ، کەلەوێدا بەڕاستی تەربیەیەکی جوان درا جگە لە خوێندێکی پوخت •

بەڵێ شارلوت خویندەوار بوو ••• زۆر حــەزی لــە چــیرۆکەکانی (کوڕنی) بۆیژ ئەکرد کە لە هەمان‌کاتدا باپیرە گەورەی خۆی بوو ، جــگە لەوەی بەزۆری نوسینەکانی بلوتارك‌و ڤولتێرو جان‌جاك ڕۆسۆی ئەخوێندەوە، هەروەها (تێوریە فەلسەفی‌و رامیــاریەکانی) [1] ســەدەی هەژدەهــەم کە لەئەوروپادا بلاوبوبوونەوە ، کاریان تێ کردبــوو چوبوونــە دڵــە پــرر هەستەکەیەوە ، رقی لەرژێمی شاهانەو کۆشك‌و پیسی‌ی ئەبوەوە ، حەزی لەرژیمی جمهوری‌و دیمۆکراتیەت بوو ، لە هەمان کاتدا ژیان لەلای ئــەم کچە بەئابڕوە زۆر لەوە زیاتر بوو کە هەر تەنها کەیف‌و رابواردن بێت ••• لە ساڵی ١٧٩٠دا کە بە فەرمانی (جمعیەتی تشریعی) هەمو دێرەکان داخران ، ئەوسا شارلوتیش گەڕایەوە ناو کەسوکاری‌و تەمەنی لەبیست ساڵان تێپەری نەکردبوو ، بەڵام هەروەك پیشوو سەرنجی روداوی ئەداو بەدوای هەواڵ‌و

---

(١) النظريات الفلسفيه والسياسيه .

باری سیاسی‌دا ئەگەراو وێلی ئەو ڕۆژنامەو بڵاوکراوانەی پاریس بوو کە بە هەمولایەکی ولاتدا بلاو ئەکرانەوە •

شارلوت بەتەمای ئەوەبوو ، فەرەنسە دوای گۆڕکردنی ڕژێمی شاهانەو لابردنی لویسی شانزەهەم‌و دامەزراندنی جمهوریەت ، ئیتر بەرەو گەشانەوەو حەسانەوە بڕوات ••• لەکوشتن‌و بڕین‌و خوێن‌ڕشتن ، زەنتـەقی ئەچوو ، بۆیە جیرۆندیەکانی چوبوو بەدلا ، چونکە پارتێکی لەسەرخۆ (معتدل) بوون، بەرێزو سۆزەوە ئەیڕوانیە پێشەواکانیان وەك (باربارۆ ، لوفیە ، فرجنێو ، بریسۆ ) ، بەلام کە ئەستێرەی ئەوان کەوتـە کزی‌و لـویسی شانزەهـەم خنکێنراو (موتانیار)ە سەرگەرمە خوێن‌ڕێژەکان هاتنە پێشـەوە ، ئـەم لەرق‌و لەترسا ئەلەرزی ، بەزەیی بەولاتەکەیا ئەهاتەوە کە بگاتە ڕادەیەك ، ئەوانەی پەیمانی ئازادی فەرەنسەیان گرتە ئەستۆ ، هەر ئەوانـە ببن بـە خوێن‌ڕێژی خەلکەکەی • زیاتر ڕقیشی لە مارا ئەبوەوەو ئەوی بەسـەری مارەکە دائەنا کە ئەگەر ئەو سەرە پان بکرێتـەوە ، ئەوسـا بـاری ولات ئەگۆڕرێ‌و هەرواناَمێنێ ، تا وردە وردە چاك ئەبێتەوە • ئەمە لەکاتێکدا بوو کە جیرۆندیەکان ، بەتایبەتی ئەوانەی کە سەری خۆیان دەرکرد ، خۆیـان گەیاندە شاری (کاین) لەوێ خەلکێکی زۆریان لێ کۆئەبوەوە ، ئەوانیش ، لەپێش هەمویانەوە (باربارۆ یەك لەسەر یەك وتاریان بۆ ئەدان) شـارلوت لەدێیەکەی خۆیەوە زوو خۆی گەیاندە (کاین) ، ئەچوە ناو خەلکەکەوە ، گوێی لەجیرۆندیە ڕاکردوەکان ئەگرت ، تاکو جارێك لەیەکێکیانی بیست کە گوایە مارا وتویە : سەری دوسەدو شەست هەزار کەسی تر ماوە کـە پان بکرێتەوە ، ئەوسا باری ولات دائەمەزرێت ، جاریکیش لە وتارێـکی بارباڕۆدا گوێی لێبوو ئەیوت (ئەگەر خوا جان‌دارێکی نوێ نەنێرێت‌و ئاسمان یارمەتی نەدات‌و موعجیزەیەك روونەدا ، فەرەنسە ئەفەوتێ) • ئەم قسەیە زۆر کاری‌کردە سەر شارلوت ، هەربیری لێ ئەکردەوە ، بیری لـە

ولاّتی فەرەنسەی ویران‌و بریندار ئەکردەوە ، تا گەیشتە ئەو شوێنەی ئایا بۆچی ئەم خۆی ئەو (جان‌دارك)ە نەبێت ••• ، ئەمە بووبە هەوینی بیرێـك کە هەرگیز لەمێشکی نەئەچوە دەرەوە ، هەر لێکی‌ئەدایـەوەو تاوتـووی ئەکرد ، تاکو ئەوە بووبە (بریار)و دەستی دایە جێبەجی‌کردنی ، لەپێشـدا خۆی گەیاندە (باربارو) ، وای پیشان‌دا ، کە کچێکی هاورێی هەیە ئیشێکی لای وەزیری ناوەوە هەیە لەپاریس ، ئەویش گورج نامەیەکی دایـە بـۆ (لوزدیبیریە)ی هاورێی کە نوینەریش بوو تاکو یارمەتی بدا ، باوکیشی وا تێ‌گەیاندبوو بـۆ ئینگلتەرە ئەچێت ••• شارلوت هەستا چوە پاریس ، لە ئوتێلیك دابەزی ، دوای ئەوە چوو (لوزدیبیریـە)ی دۆزیـەوە ، دوای ئەوەی نامەکەی باربارۆی دایە ، رێك‌کەوتن لەسەرئەوەی بۆ رۆژی دوایی بیبات بۆلای وەزیر ، بەلاّم کە بۆ سبەینێ بەیانی چوەوە (دیبیریە)ی نەدی ، چونکە هەر ئەو بەیانیە پێش چوونی شارلوت گیرابوو •

ئەمە شارلوتی لەکارنەخست ، گەرایەوە ئوتیـلەکەی خـۆی لـەوێ نوسراوێکی دورودرێـژی بۆ (فەرەنسەییـەکان) لە ئـاشتی خـوازەکان‌و یاساناسان ) نووسی‌ی کە دوای گرتنی پـێی گـیرابوو ، تیایـدا داوای یەکیەتی‌و بەرهەڵستی‌ی خوین‌رشتن‌و دەست‌رویشتنی یـاسای کردبـوو ، لەدواییدا رووی کردوتە فرەنسەی نیشتمانی خۆشەویستی‌و ئەڵێت : «هەر ئەوەندەم پێ‌ئەکرێت گیانی‌خۆم بکەم بە قوربانت •• ئەوسەرەم کە ئەکرێ بەسەررمەوەو بە شەقامەکانی پاریسدا ئەیسورێننەوە ، ئومێد ئەکەم ببێت بە ئالاّیەك هەمو یاساناسان دوای‌کەون‌و بین بەیـەك منیـش دوایێچـیری (موتتانیار)ە خۆین‌رێژەکان بم • لەوبروایەشدام بەوەی کردوومە ، هەمـوو مرۆڤایەتی سوپاسم ئەکەن » •

بۆ رۆژی دوایی‌تر چوە بازار ، کێردێـکی گەورەی کـری‌و لەژێـر جلەکانیا شاردیەوە ، ئنجا چوو بەشوین مالّی مارادا گەرا تا دۆزیەوە ، بەلاّم

ئەو (فلات)ەی مارای تیا ئەژیا ، هەروا بەئاسانی هەموو کەسێکی نەئەگەیشتێ ، دوسێ جار چوو ، هەموجارێك ژنە دۆستەکەی مارا کە ناوی (سیمون افرار) بوو ، نەی ئەهێشت بچێتە ژورەوە ، ئەمیش بەو ناوەوە کە لە (کاین)ەوە هاتوەکە (پیلانێکی) گەورەی تێدا بەرێوەیە ، ئەمیش هاتوە ئاگاداری‌ی بکات ... ئەم جارەش چوەوە ، قاپیەوانەکە دەرگای لێ‌کردەوە، بەڵام سیمۆن زوو بەرەنگاری بوو ، تاکو بووبە شەڕەقسەو هەرایان ... لەوکاتەدا مارا لەگەرماوا بوو کەگوێی لەم هەرایەبوو ، وتی: کێ‌یە رێ‌ی‌بدەن ، با بێتە ژورەوە ، مارا لەبەرئەوەی تووشی نەخۆشیەکی زۆربە ئالۆشی پێست بوبوو ، لەبەرئەوە زوربەی کاتی خۆی لەناوئاودا رائەبوارد، هەر لەوێشدا کاغەزیان بۆئەنا بەدیواری حەمامەکەوە ، نووسینە ئاگرینەکانی تەواوئەکرد ... شارلوت یەکسەر ملی‌نا بۆ حەمامەکە ، لەسەر کورسیەك نزیك حەوزەکەی مارای تیابوو دانیشت ، دەستی‌کرد بەقسەکردن بۆی ، ئەویش پرسیاری لێ‌ئەکرد ، تا تەواوی‌کرد ، ئەوسا شارلوت گورج کێردەکەی دەرهێناو هەتا هێزی تیابوو کردی بەسنگە رووتەکەیدا بەجۆرێك هەمووی‌برد تاگەیشتە سەردەستکەکەی مارا دەستی‌کرد بەهاوار . ملی‌لاربوەوەو خوێن فیچقەکرد، سیمۆنی دۆستی‌و قاپیەوانەکە دەستیان‌کرد بەهاوار بەڵام کریکارێکی رۆژنامە شارلوتی گرت‌و تا هێزی‌تیابوو کێشای بەسەریا ، لەدواییدا خەڵکیان لێ‌گردبوەوە ، تاپزیشك فریاکەوت‌و هات سەیری‌کرد مارا لەهەزار ساڵان راستبۆتەوە ، ئیتر پولیس‌و هاوڕێکانی مارا هاتن ... بەڵام شارلوت زۆر لەسەرخۆبوو هیچ نەشڵەژابوو ، ئەوەبوو بۆ رۆژی دوایی رۆژنامەکان کردیان بەهەرا ، هەندێك ئەیانووت ئەم تاوانە دژی‌شۆرشەو دانتون‌و روبسبیریش ئەگرێتەوە ... ئەمەیان ئەدایە پاڵ چیرۆندیەکان‌و بریاردرا شارلوت بدەن بەدادگای شۆرش ، (دیبیریە)و (فوشیە)ی کاهنیش گیران بەوەدا کەشارلوتیان لادیون ... لاشەی مارا

بەریزێکی زۆرەوەو بەگوڵو ریحانەوە برایە کلێسە ، ووتـەی ئـاگرینو بەکاری زۆر خویندرایەوە ، هەندێك بەخوایان ئەدایە قەڵەم •

شارلوت زۆرباش ئەیزانی چی‌لێ‌ئـەکەن ••• رۆژی (١٧) تەممـوز بردیانە بەردادگا کە خەڵکێکی زۆری لێ گردبوبوەوە ، پارێزەریکیان بـۆ دانا ••• ئنجا سیمۆن افرار هات بۆ شایەتی ، بەگریانو فرمێسك رشتنەوە دەستی‌کرد بەقسەکردن ، شارلوت زوو قسەکەی پێ‌بـڕی وتی : ئەمـەی پێ‌ناوێت (من کوشتومە) ، دوای ئەوە گفـتو گۆی بەینـی شـارلوتو سەرۆکی دادگا دەستی پێ‌کرد ، بەڵام سەرۆك بەڕەقی ئەی‌دوانو ئەویش لەسەرخۆو بەئاشکرا وەڵامی ئەدایەوە ، بۆ نموونە سەرۆك پرسیاری‌لێ‌کرد :

ــ ئەم تاوانەت بۆ کرد ؟

ــ چونکە مارا تاوانباربوو •

ــ مەبەستت لەتاوانەکانی چی‌یە ؟

ــ مەبەستم لەو کارەساتانەیە کە بەسەر فەڕەنسـەیدا هێنـا ، لـەرۆژی بەرپابوونی شۆرشەوە تا ئەمرۆ •

ــ کێ وای لێ‌کردیت ، ئەم هەموو رقەت لە مارابێت ؟

ــ پێویست بەوە ناکات کەس کارم لێ‌بکات ، کردەوەکانی خۆی رقـی پێ پەیداکردم •

ــ چیت لەئەنجامی کوشتنەکەی چاوەڕێ ئەکرد ؟

ــ گەرانەوەی ئاسایش بۆ نیشتمانەکەم •

ــ ئایا لەو بروایەدای هەمو یەکێکی وەك مارات کوشتبێت ؟

ــ نەء ، بەڵام مردنی ئەو ، ئەوانی‌تر ئەترسێنێ •

دوای ئەوە شارلوت وتی : ئەمزانی مارا سزای فەرەنسیەکان ئەدات ، مارام کوشت تاکو سەدهەزار کەس رزگارکەم ••• دڕندەیەکم لەناوبـرد

تاکو نیشتمانەکەم بکەوێتە ئاسودەییەوە ••• من پێش شۆڕش ئیمانم بە جمهوریەت بوەو هەرگیز ئەو بڕوایەم خاونەبۆتەوە •••

لەدواییدا کە (بلوز دیبیریە)و (فوشیە)یان لەدادگادا بەرەو ڕووکردەوە، هەتاتوانی نارەزایی خۆی دەربڕیو بەتوندی پیێدا بەعەرداو وتی : ئەمانە بەهیچ جۆرێك لەگەڵمانینو ئاگایان لە هیچ نییە •

ئنجا داواکەری گشتی قسەی خۆی کردو لەئەنجامدا داوای سەری کرد ••• پارێزەرەکەشی نەیئەزانی چۆن تاوانەکە لەم کچە جوانە پاکە ئازایە دوورخاتەوە ئایا بەشێتی بداتە قەلەم ؟ ••• بەرامبەر بەکوشتنی کی ؟ مارا کە پێشەوایەکی خۆشەویست بوو لەناو گەلدا • چۆن بیپارێزێت کە ئەو خۆی دانی بەهەمو شتێکدا ناوە ، هیچی بۆنەکرا ئەوەنەبێت حوکمەکەی بەرەورووی سۆیندخورەکان بکاتەوە ••• ئەوانیش دوای گفتو گۆو سەنگاندن بڕیاری خنکاندنی شارلوتیاندا ••• کە بڕیارەکەی بۆ خوێندرایەوە ، خوانەکات ئەوەندەی تۆزێك پیێ تێك بچێت یاخود شتێکی پێوە دیاربێت •

دوای ئەوەی شارلوت گێرڕایەوە بەندیخانە ، ئەو وێنەدروستکەرەی کە هەرلەکاتی محاکەمەکەیدا دەستی کردبوو بەکێشانی وێنەکەی ، چووەوە بۆلای بۆ بەندیخانە تاکو وێنەکەی تەواوکات ، ئەویش زۆر سوپاسی کردو بەهێمنی لەبەردەمیا وەستا تاکو لیێبوەوە ••• ئنجا کابرای کارپیێسپێرراو هات قژەجوانەکەی هەڵپاچیو کراسێکی سووری لەبەرکردو هەردودەستی بەستەوەو سواری گالیسکەیەکی کردو بەناو جەماوەرێکی زۆردا کە هەموو بۆسەیری تۆلە وەستابوون بردی ••• ئەویش لەهەموکاتێك بیێدەنگ‌ترو لەسەرخۆتر بوو••• (ئادەم لکس) تۆینەری (مایانس) لەناو سەیرکەراندا بوو ، جوانیو هێمنیەکەی شارلوت ئەوەندە کاری لیێکرد ، تا بن‌تەورەکە

دوای کەوت لەویدا تا هێزی تیـابوو ووتی : (لـە برۆتـاسی خوێن ڕێـژی یولیوس قەیسەر مەزنترە ) ، ئەمە بووبە هۆی ئەوەی دوای ملپەڕاندنی شارلوت ، ئەویش بەگیربهێنـن ، بـەوە گوناهباری بـکەن کەستـایشی خوێن ڕێژێکی کردوە ، لەملی ئەویشیاندا بگرە هەربـەوەوە نەوەستـان ، بۆیژی مەزن (اندریە شنییە)ش کە شیعری بەئازایەتیەکەیدا هەڵدا بەجۆرێك کەوتبووی (تەنها هەر تۆ پیاو بویتو بەس) ، لەسەری ئەویش درا •

ئەمەبوو بەسەرهـاتو کارەسـاتی ئەوکچـەی کـە لەسەرێـکەوە خۆشەویستیی نیشتمانو دلسوزیی بۆ دانیشتوانی ولاتەکەیو گەلەکەی، لەسەرێکیترەوە باری ئالوزو بڕوای سیاسیو پارتایەتی ، ئنجـا خوێنـی گەرمی گەنجیەتیو زۆرشتیتر کاری تێکردبوو ، وایئەزانی کە بەکوشتنی مارا ئیتر ، خوێن ڕشتنو توندوتیژیو باری ئالۆزی فەرەنسـە کۆتـاییی دێت ••• نەیئەزانی ئەم جۆرە بارە نائاساییە کرژانـە هـەر ئەبێ بچنـەوە دۆخیانی رەمەکیو ئاساییی خۆیان بەلام ئەویش هەر شێوەیەکی لەسەرخۆو یاسای تایبەتی خۆی هەیە ، کە پێویستە بەگـوێرەی ئەو یاسایـە بڕوات بەڕێوە نەك بەکوشتنی ئەموئەو •

## موحاکەمەی سلێمان حەلەبیو

## کوشتنی جەنەراڵ کلیبـــەر [1]

ناپلیۆنی بوناپارت کە دەستیکێشا بەســـەر میسرداو لەداگیرکردنیدا دەستپێشکەری کرد ، بۆ ئەوەبوو کە پێش ئینگلتەرەی دوژمنە گەورەی بکەوێو رێگای هندستانی لێ‌ببڕێ ، لە ساڵی ١٧٩٨دا بە سوپایەکی گەورەوە هات میسری داگیرکرد ، هەر دوابەدوای ئەویش ئەمیراڵ نلسونی ئینـــگلیز بەهێزە دەریاییەکەیەوە دوای‌کەوت لە (ابو قـــیر)دا ، شکانـــدی ، بـــەڵام ئەوشکاندنە ناپلیونی سارد نەکردەوە ، بەڵکو پەلامـــاری سوریـــای‌دا ، پێش‌ئەوەی عوسمانیەکان دەستی بۆ درێژبکەن ، کە بەمە لەفەرەنسە بون بەدوژمن • دوای‌ئەوە زۆری نەبرد خەبەریان دابە ناپلیـــون کـــە روسیـــاو پروسیاو نەمساو ئینگلتەرە خەریکن پەلاماری فەرەنسە ئەدەن ، لەبەرئەوە ناپلیون بەهەڵەداوان گەرایەوە بۆ فەرەنسەو سوپاکەی کەبردبووی بۆ میسر هەمـــووی لـــەوێ بـــەجێ هیشـــت دوای‌ئـــەوەی یـــەکیـــك لەپێشـــەوا هەرەبەناوبانگەکانی شۆرشی فەرەنسەی بەسەرەوە دانا کە ئەویش جەنەراڵ کلیبەر بوو ، کە ئەمیش دوای شەرەکەی (عکا) هەرکە پاپورە زرەیلیەکانی ئنگلیز بەسەرۆکایەتی سێر سدنی سمیث ناپلیونیان ، پیش گەرانەوەی بـــۆ فەرەنسە شکاند ئیتر جەنەرال کلیبەریش لەگەڵ سدنی سمیت‌دا رێکەوت کە

(١) لە کتێبی (قضایا التاریخ الکبری او اشهر المحاکمات والجرائم . محمد عبدالله عنان المحامی . ادارة الهلال بمصر . سنة ١٩٢٥) وەرگیراوە .

بەبێشەر سوپاکەی فەرەنسە بکێشێتەوە بۆ فەرەنسە ئەمەش ساڵی (١٨٠٠) بوو ، بەڵام ، حکومەتی ئنگلتەرە فەرمانیدا بە سدنی سمیت کە پیویستە سوپای فەرەنسە چەك بکات ئەوسا ڕێگای کشانەوەی بدا ، لەئەنجامی ئەمەدا کلیبەر دەستوبرد پەلاماری ئەوسوپایەی عوسمانیەکانیدا کە هەشتا هەزار سەرباز ئەبوون ، بەتەنها دەهەزار سەربازیخۆیەوە لەهلیوپولیس ، لەرۆژی (٢٠) مارتی ١٨٠٠دا ، چەکیانکردنو بەرەڵلایان کردن ، دوای ئەوە دەستیانکرد بە سپەرداناںو خۆ ئامادەکردن •

کلیبەر خۆی لە خانویەکی گەورەدا هەڵیدابوو لە قاهرە لەگەڕەکی (أزبکیە) کەباخو باخاتێکی گەورەو چڕی بەدەورابوو، پێشەواکانی سوپاش هەر لەوێ کۆئەبونەوە ، لەروژی ١٤ی حوزەیرانی ساڵی ١٨٠٠دا کاتێك کە جەنەرالکلیبەر لەگەڵ سەرۆکی ئەندازیارەکان کە ئەندامی کومەلەیزانستی فەرەنسەبوو لەگەڵ سوپاکەدا ، لەباخچەکەدا هەردوکیان پێکەوە پیاسەیان ئەکرد ، بەڵام کلێبەر لەپێشترەوە ئەرویشت ، لەپڕ لاوێکی باڵا مامناوەندیی لاواز بەجلی تورکیەوە لەناو درەختەکاندا دەرپەڕیو لە (کلیبەر) نزیكبوەوە، ئەویش بەبەرگو سەرو سەکوتیا وایئەزانی سواڵکەرە ، هەر لەدورەوە تێیخوری (خوا بتداتی مەیەرە پێشەوە) ، کوڕە بەپارانەوە هەر ملیئا تا دەستیچەپی بۆ جەنەرال درێژکرد گوایە ئەیەوێ دەستی ماچبکات ، ئەویش دەستیدایە ئەم توند گرتی ، بەدەستەکەیتری ئەو خەنجەرەی کە لەژێر جلەکانیدا ، شاردبویەوە ، رایکێشاو بەربوە جەنەرال ، چەندجارێك دەستی لێوەشاند ، دایلەسنگیو قۆڵیو وسکی ، تا دایبەزەویدا ئەویش واهەر هاواری ئەکرد ، (بروتان)ی هاورێی ڕایکرد بچێت بەدەمیەوە ، بەڵام لاوەکە بەربوە ئەویش چەند خەنجەرێکی لیداو ئەویش بێهوش کەوت بەزەویدا ، دوای ئەوە کوڕە رایکرد ، هەر لەناو باخەکەدا خۆی وونکرد • ئیتر زۆری نەبرد تفەنگچیەکان پەیدابوون ، سەیریانکرد وا پێشەوای

سوپاکەیان کەوتوە لەخوێنی‌خۆیدا ئەگەوزێت ، هاوڕێ‌کەشی هەروا لەولایەوە کەوتوە • ئیتر خەبەر بەهەموو لایـەکدا بلاوبـوەوە ، شـاری قاهـیرە لەترسی دەست‌درێژی سەرباز دوکانیان هەلگرت‌و هـەرکەس رای‌کردەوە مالەوە ، دەرگای خێ لەسەرخۆی داخست ، ئەوەندەی نەبرد سەربازەکان لاویکیان گرت کە لەباخچەکەی تەنشت مالی جەنەرالدا خۆی شاردبوەوە ، هەر دەست‌بەجێ‌و لەئەنجامی ئەوەدا ، کۆڕێکی سوپاییش بەسەرۆکایەتـی (منو) گیرا ، کە گەورەترین ئەفسەر بوو دوای کلێبەر • دوای (فحص)ی پزیشکەکان ، جەنەرال ئەوەندەی پێ‌نەچوو تەواوبوو ، دەرکەوت بەخەنجەر لێ‌دراوە ، هەروەها (بروتان)ی ئەندازیار ، بەلام ئەو برینەکانی کوشندە نەبوون ، لەبەرئەوە ماو نەمرد •

دوای لێکۆلینەوە ، دەرکەوت ، ئەو کوڕەی کە گیراوە ناوی سلیمان حەلەبی‌یە ، لە حەلەب لەدایك‌بوە ، تەمەنی (٢٤) سالانەو لەگەل قافلەیـەکدا هاتۆتە قاهیرەو لەمزگەوتی ( أزهر ) دابەزیوە ، بێ‌گومان لەپێشەوە دانـی بەهیچ تاوانێکدا نەنا کەئەمانە بەلگەکانی بوون :

یەکەم : سەربازەکان لەباخەکەی تەنشت مالی جەنەرالدا گرتویانە •

دوەم : خەنجەریکی خوێناوی نزیك شوینی روداوەکە دوزرابوەوە •

سێ‌یەم : پارچەیەك قومـاشی سـەوز نزیـك شـوینی روداوەکـە دوزرابوەوە ، بەتەواوەتی لەجلەکانی گوناهباری ئەکرد •

چوارەم : سەری سلیمان شکابوو دەموچاوی رنرابوو ، ئەمانـەش لەئەنجامی دەستەویەخەبوونی‌دا بووە لەگەل (بروتان) •

پێنجەم : هەندێك لەسەربازەکان ناسیبویانـەوە کەوا هـەر بەیـانی ئەوڕۆژە کەجەنەرال بەناوچـەی (جـیزە)دا تێپەڕیبـوو ، ئەویـش دوای کەوتبوو •

وەك ووتمان لەپێشەوە سلێمان دانی بەهیچ شتێکدا نەنا ، بەڵام کە دەستیانکرد بەئازاردانی ، هەرچیەکی کردبوو هەڵیڕشت، گیرایەوە کەوا : سەرۆکەکانی سوپای عوسمانی دوای شکاندنیان لەلایەن فرنسیەکانەوەو هەڵهاتنیان بۆ شام ، ویستبویان تۆڵەی خۆیان بسێنن ، بەپارەو بەدامەزراندنی لەشوینیباشدا ، حەلەبیەیان دەستخەڕۆ کردبوو ، کەلێیان پرسی ، ئایا لە میسردا کەس هانیداوە ، وتی : نەء ، بەڵام کە لەمزگەوتی (أزهـر)دا ، نیشتەجی بووە ، چوار لەمەلاکانی ئەوێی ناسیوە ، نیازەکەی دڵی بۆ هەڵرشتوون ، ئەوان ئاموژگاریان کردوە کەواز بهێنێت چونکە شتیوای بۆ ناچێتەسەر • دەست بەجێ فەرمانی گرتنی ئەومەلایانەش دەرچوو ، شێخ عەبدوڵلا غەززی ، شێخ موحەمەد غەززی ، سەید ئەحمەد الوالی غەززیو سەید عەبدول قادری غەززی، ئەمانە هەموو قورئان خویندبوون لەئەزهەر، دوای لێپرسینەوەیان هەموو دانیان بەوەدا نا ، کە سلێمان نیازی دڵیخۆی بۆ دەربڕیبوون گوایە غەزای بەدەستەوەیە ، ئەویش بەکوشتنی (دیان)ێكو هیچیتر ، هەر لەئەنجامی لێپرسینەوەی ئەو مەلایانەدا ، ناوی (مستەفا ئەفەندی بورصەلی)یەکیش هاتە ناونـاوان کە ئەویش گورج راپێچکرا خۆی خەلکی (بورصە)ی ئەنەدۆڵ بوو ، لەتەمەنی (١٨) ساڵاندا ، ئەمە مامۆستای سلێمانبوە لە سێساڵ لەوە پیشەوە ، بەڵام بەهیچجۆریك ئاگای لەو تاوانەی سلێمان نەبوەو بۆی باسنەکردوە ، سلێمانیش قسەکانی هەمو سەلماند ، لەبەر ئەوە هەرزوو واز لەو هێنرا •

دوای لێپرسینەوە پێشەکی ، بەوجۆرەی باسمانکرد ، پێشەوای گشت سوپا جەنەرال (منو) بۆ رۆژی دوایی دادگایەکی سوپایی (عورفی) لە نۆ ئەندام پێكهێنابە سەرۆکایەتی جەنەرال ( ریشیه ) ، ( سارتلون ) بە (سکرتیر)و (لیبەر) بە داواکەری گشتی ، دادگاکە هەموو دەسەڵاتیکی پێبەخشرا بەمەرجێك دەستبەجێ بکەوێتەکار •

دادگا گوێی لەشایەتی چەند سەربازو ئەفسەرێك گرت لەوانـەی کە سلیمانیان گرتبو ، یاخود خەنجەرەکەیان دوزیبوەوە ، جـگە لـەوەی یەکیکیان لەوانەبوون کە سەرلەبەیانی دیبویان دوای جەنەرال کەوتـوە ، دوای ئەوانیش گوێیان لەقسەی (بروتان)ی ئەندازیار گرت کە بریندارو هیشتا لەناوجێگادا کەوتبوو گێرایەوە کـەوا : لەناوباخچـەکەدا لەگـەڵ جەنەرال کلیبەردا پیاسەیان ئەکرد ، لەپڕ پیاوێکی بەدیکرد کەبەرگی وڵاتی عوسمانی لەبەردابوو ، لەپێشەوا نزیك ئەبوەوە ، کە ئەویش چەند هەنگاوێك لەپیش ئەمەوەبوە ، لەپرر ئەو زەلامە هەڵیکوتایە سەر فەرماندەی سوپـاو دایە بەر خەنجەر ، ئنجا ووتی : منیش کەچوومە بەرەوە ، کابرا وەرگەرایەوە سەرمنیش‌و دەستی‌کرد بەلیدانی منیش بەخەنجەرەکەی دەستی ، تاکەوتم‌و هۆشم لێبڕا ••• کە (سلیمان حەلەبی)یان پیشاندا ، کە ئایا ئەم‌بوو لەتۆو جەنەرالیدا ، دەست‌بەجی ناسیەوەو وتی : بەڵێ خۆیەتی • دوای‌ئەوە دادگا گوێی لەقسەکانی سلێمان حەڵەبی خۆی گرت کە بەم جۆرەبوون :

دوای ئەوەی سوپاکەی ـ صدری أعظم ـ بەشکاوی لـەمیسرەوە لەمانگی (ذی القعده)ی ساڵی ١٢١٤ی کۆچدا خۆیان گەیانـدە شـام ، ئەوسا سلیمان لە حەج گەرابوەوە ، گەیشتبوە قدس ، لەوێشەوە بۆ حەڵەب، لەوێ دوان لەئاغاکانی سەربە (صدری أعظم) هاتنە لای بەوەدا کە لەوەپیش چەند ساڵێك لەمیسردابوەو تەواو شارەزایەتی ، بچێت پێشەوای گشتیی سوپای فەرەنسەیان لەقاهرە بۆ بکوژیت ، چیئـەوێ دوای بەجێهێنـانی کارەکە ئەیدەنێ ، جگە لەوەی کارێکی وا ئەکەن کەلەوەدوا ، والی حەڵەب کەلەوەپێش زۆر توندو بەزەبربوو لەگەڵ موحەمەد حەلەبی باوکیا ، ئیـتر باش بێت‌و رووی‌خۆشی بداتی ••• ئەمیش هاتـە قاهـیرەو لە (ئەزهـەر) دابەزی ، مەبەسی خۆی لەو مەلایانە گەیاند کەوا نیازی کوشتنی فەرماندەی گشتیی هەیەو هەمو رۆژێك ئەیدایەوە بەگوێیانداو ئەوانیش زۆر لەگەڵیا

خەریك‌بوون کە وازبهێنێ بێ‌سوودبوو ••• ئەمانە هەموو لەدادگای تایبەتی‌دا وترا ، دوای ئەوە داوا لەتاوان‌باران کرا ، پارێزەر بۆ خۆیان بگرن ، کە نەیان‌گرت دادگا بۆی‌گرتن •

رۆژی ١٦ی حوزەیرانی سالی (١٨٠٠) دادگا بەئاشکرا کۆبوەوەو رێی خەلك‌درا بچنەژورەوە : ئەوسا (سارتلونی مقرر) دەستی‌کرد بەخویندنەوەی ئەو (لائحە)یەی کە ئامادەی کردبوو لەبابەت ئەم رووداوە (لەپڕو سەیرەوە) کە ئەمە هەندێك لەناوەرۆکەکەیەتی :

سارتلون دوای ئەوەی باسی ئەژنۆشکاندنی سوپای‌کرد بە لەناوبردنی پێشەواکەی ووتی : باهەموو ئەوروپاو گشت‌جهان باش‌بزانن کەوا ئامەردی‌و ناپیاوی (صدری أعظم)و گشت سەرۆکەکان‌و هەموو سوپای عوسمانی گەیشتە رادەیەك ، بۆرەپیاوێکی خوێن‌رێژ بنێرن ، کلیبەر بکوژێت ، دوای ئەوەی لەشەڕدا هیچیان لەگەلیدا بۆ نەکرا ، جگە لەو درۆو دەلەسەیەی هەلیان‌بەست کەوا گوایە ئەوان ناچاریان کردین بەکشانەوە لەمیسر بەگوێرەی پەیمانێك کە ئنگلیزە سوێندخۆرەکانی ئاشنایان نەیان هێشت بێتەدی ••• دوای‌ئەوە دەستیان‌کرد بەهاندانی خەلك کەدەست لەکوشتنی فەرەنسیەکان نەپارێزن ، ئەمە لەکاتێکدا کە ئێمە زۆر بەنەرمی لەگەل دەست‌بەسەرەکانی ئەواندا ئەجولاینەوەو برینی برینداره‌کانیانمان تیمار ئەکرد •

ئنجا دوای ئەوەی گەلێکیش بەسەرو پۆتەلاکی ئەحمەدئاغادا ناوێك‌دا هاتەخوارێ ، بەوەدا کە ئەو لەبەیندابوەو سلیمان حەلەبی بۆ ئەم تاوانە هان‌داوە • سلیمانیش بەمێشکی ئاخنراو لەتاوان لەحەلەبەوە بۆ قدس‌و لەوێوە بۆ (خلیل) لەفەلەستین ، هاتوەو لەدواییدا گەراوەتەوە (غەززە) ، لەوێ یاسین ئاغا ناوێك کە ئەویش هەر یەکێك بووە لەدەست‌و پێوەندی

عوسمانیەکان ، دوای ئەوەی ئەوەندەی‌تر مێشــکی پڕکردوە ، چل قرۆشی تورکیشی خستۆتە گیرفانیەوەو بەسواری هێستریك لەگــەڵ قافڵەیــەکدا خستویەتیەرێ بەرەو میسر ، ئەویش بەخۆی‌و خەنجەرەکەیەوە لە (ئەزهەر) دابەزیوە ، لەوێ خۆی بۆ تاوانەکەی ئامادەکردوە ... نوێژی‌کردوەو لەخوا پاڕاوەتەوەکە لەئیشەکەیدا سەرکەوێ . هەرلــەوێ ئەوچــوار مەلایــەی دیوەوقســەی بۆ کردوون ، ئــەو ئاموژگاریانــەی ئەوانــیش کردویانــە لەسەرکێشیەکەی نەگێڕاوەتەوە ... بەڵام ئەوانەش جگە لەقســە هیــچ کارامەییەکی کەیان نەنواندوە کەلەم تاوانەی بسلەمێتەوە ، جا لەبەر ئەوەی کە بێ‌دەنگ‌بونو خەبەریان نەداوە بەکەس ، کەوابوو ئەوانیش تاوانبارن.. سلێمان ماوەی (٣١) رۆژ خۆی بۆ ئەم تاوانە ناوەتەوە ، لەدواییدا چووە بۆ (جیزە) خەبەری بە موحەمــەد غــەززی داوە ... ئــەو رۆژە جەنــەراڵ گەڕاوەتەوە بۆ قاهیرە . سلێمان بەجۆرێك دوای کەوتوە ، گەلێك جــار سەربازەکان بەتوندی تی‌یان‌خوڕیوەو دووریان خستۆتەوە ، بەڵام هەروازی نەهێناوە ، تا رۆژی (٢٥) کە خۆی‌کردوە بە باخچەکەدا بەبیــانوی دەســت ماچ‌کردنی جەنەرالەوە نزیك کەوتۆتەوە ، ئەویش بەزەیی‌ی پیاهــاتوتەوە زۆر گوێ‌ی نەداوەتە نزیك کەوتنەوەی‌و خۆی بۆ شل کردوە ، ئەمیــش بەهەلی زانیوە ، بەخەنجەر دای‌دروە ، دوای‌ئەویش کە (بروتان) تــاوی داوەتە خۆی فریای جەنەرال بکەوێ ، سلێمان ئەویشی داوەتە بەر خەنجەر تا لەهۆش خۆی چوە ... دوای ئەوە سارتلون هەر لە ووتەکەیدا ئەڵیت : ئەئاوا ، ئەو جەنەراڵەی لەو هەمو شەڕە ساماناکانەدا سنگی ئەنا بەگوللەوەو نەئەترسا ، بەلکو ئاگری شەڕ سڵی لەو ئەکردەوە .. ئەو جەنەراڵەی یەکەم کەس‌بوو بەخۆی‌و سوپای جمهوریەوە بە (راین)دا پەڕیــەوە ، ئەوی بــۆ دووەم‌جار میسری لەژێر چنگی عوسمانیەکان دەرهێنایەوە ... ئاواو هەروا لەبەر خەنجەری ئەم کابرایەدا بکەوێ بێ ئەوەی بتوانێ پارێزگاریەکی خۆی

بکات ! • دیسانەوە سارتلون ئەڵیت : دوای ئەم تاوانانە سەربازەکان سلێمانی دەست بەخوێنیان گرتو نەیـان هێشـت دەرچێـتو خەنجەرەکەشیـان دۆزیەوە ••• تاوانبار خۆشی دانی بەهەموو شتێکدا ناو ناوی هاورێکانیشی یەکە یەکە ووت • دوای ئەوە سارتلۆن رووی کردۆتە ئەندامانی دادگـاو وتوویە : جۆری سزای تاوانبارەکان بۆ ئێوە بەجـێ ئەهێڵـمو ئەیخەمـە ویژدانی ئێوەوە ••• بەڵام ئەوەش بزانن نابێ ئەو سزایـە دژی عـورفو عادەتی ئەم وڵاتە بێت ، بەڵێ تاوانەکە ئەوەندە زلە سزایەکی هێجگار قورسی پێویستە ••• با ئەوەش کوشتن‌بێت بە ملپەڕاندن بەمەرجێك لەپێشـدا ئەودەستەی تاوانەکەی پێ‌کراوە بسوتێنرێت ••• دوای ئەوەش لاشەکەی لەو دەشتەدا فڕێ بدرێ کەباڵیندەو دڕندە بیخۆن • چوارەکـەی تریـش هەر تەنها بە ملپەڕاندن حوکم بدرێن ••• ئەمانە هەمووی دوای نـاشتنی لاشەکەی جەنەرال بێت، لەشوێنیکدا سوپاییەکانو دانیشتوانی وڵات هەموو ببینـن ••• دوای ئەمانـە هەموو پێویستـە نوسینـەوەی رووداوەکـە بەسێ‌زمان ، عەرەبی ، تورکیو فەرەنسی لەچاپ‌بدرێو بەدیوارەکاندا لەزۆر شوینی وڵاتی میسردا هەڵبواسرێت •

گوناهبارەکان بەبێ‌کۆتو زنجیر ، جارێکی تریش برانـەوە هـۆڵی دادگاو پارێزەر (وکیل)ەکەشیان لەگەڵدا ••• سـەرۆکی دادگا جەنـەرال (رینییە) گەلێك پرسیاری تری لێ‌کردنەوە ••• بەڵام وەڵامەکانیان هـەر قسەکانی پێشویان بوو ••• دیسان پرسیاری لێ‌کردن ئایا هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوەیە کە خۆیانی پێ رزگار بکەن ، هیچ وەلامێکیان نەبوو • دوای ئەوە سەرۆکی دادگا فەرمانی‌دا بە چۆڵ‌کردنی هۆڵەکە بۆ گفـتو گـۆی ئەندامان ••• دوای دەست پێ‌کردنەوەی کۆڕی دادگا بەئامـادە بـوونی هەموو ئەندامەکانی، بریاری تاوانباریەتی سلێمان حەلەبیو موحەمەد غەزیو

عەبدوڵلا غەزیو عەبدولقادر غەزیو سەید ئەحمەد والی دراو حوکمەکانیان بەم جۆرە بوو :

یەکەم : دەستی سلێمان حەڵەبی بسوتێنرێ ، دوای ئەوە بەتەور لە ملی بدرێو لەشەکەشی هەر لەسەر گردەکەی (تل العقارب) فرێ بدرێ کە درندەو بالیندە بیخون ••• ئەمەش دوای ناشتنی لاشەی جەنەرال بێت •

دوەم : عەبدولقادر غەزی بەتەور ملی بپەرێو هەرچیەکی هەیە دەستی بەسەرا بگیرێت •

سێیەم : موحەمەد غەزیو عەبدوڵلا غەزیو ئەحمەد والی هەموو سەریان بپەرێت ، دوای ئەوەش سەرەکانیان بکرێن بەسەر رمەوەو لاشەکانیشیان بەئاگر بسوتینرین ••• بەمەرجێك ئەمانەش هەر لەسەر گردەکەی (تل العقارب) وایان لێ بکرێتو پێش کوشتنی سلێمان حەڵەبیو لەبەر دەمیا بێت ••• ئەم بریارانە هەمو بۆ گوناهبارەکان خوینرانەوە ••• دوای ئەوەی لێکوڵینەوەو دادپرسین گشتی لەچوار رۆژ زیاتری نەخایاند ••• بۆ رۆژی دوایی چوارشەممەی (٢٦)ی مانگی (محرم) ساڵی (١٢١٥) ، لاشەی جەنەرال نێژراو لەملی هەرپێنج کەسەکەش درا بەو جۆرەی حوکم درابوون •••

دوای ئەمانە نووسەری ئەو پەرتووکەی[1] ئەم رووداوەی لێوەرگیراوە پارێزەر (محمد عبدالله عنان) لە سەنگاندنی بریاری حوکمەکەدا ئەڵێت :

ئەمە لاپەرەیەکبوو لە لاپەرەکانی کوشتنی پێشەوای سوپای فەرەنسە لە میسرو دادپرسینەوەی گوناهبارەکان ••• کە بە لاپەرەیەکی سپیو بێگەرد ئەژمێررێت لە مێژووی ئەو هێرشەی فەرەنسەدا بۆسەر میسر ••• بەڵکو لاپەرەیەکی پردادی ئەو سەردەمەیە ••• کە کاتێکی پر لە پشێویو

(١) قضايا التاريخ الكبرى او اشهر المحاكمات والجرائم .

شیرازە بەربوونی یاساو شەریعەت بوو ... رۆژی کوشتن‌و برین‌و ماڵ خواردنی خەڵك‌و پەلاماردان بوو ... کلیبەر کوژراو ، کێ کوشتی دانی بە تاوانەکەیدا نا ، ئەویش حوکمی کوشتنی بەسەردا درا ، بەڵام دوای محاکەمەیەکی یاسایی ، کە هەمو کاروباریکی راست‌و تەواوی تیا رەچاو کراو بە ئاشکراش لەبەر چاوی خەڵك ، ئەندامەکانی دادگاکەش پیشەواکانی سوپاو سەرۆکەکان‌و ئەو بیربەرزانە بوون کە لەگەڵ سوپاکەدا هاتبوون ، کە بەراستی لە کاتی محاکەمەدا ، نموونەی لەسەرخۆیی‌ی‌و ساردی‌و هێمنی، بەڵکو نموونەی دادو پاکی بوون .

هەروەها مامۆستا (عنان)ی پارێزەر ئەڵێت : کارەساتەکەیان لەو چمکەوە سەیر ئەکرد کە روداوێکی تایبەتی‌یە نەك ئەمە بکەن بە بیانوو، کوتەك لە ناحەزەکانیان لەمیسریەکان‌و (ممالیك) هەڵبگرن ... تەنها وەك دادگەر رێگای یاسایان گرتوەو هیچی تر ، جگە لە رەچاو کردنی عورفی ولاتەکە ، نەزەبرو هێز ، نە لەخشتەبردن‌و فرو فێڵیان بەکارنەهێناوە لە لێکوڵینەوەو دان پیانانندا ... واتا شتێکی ئەوتۆیان نەکردوە ، کە لەمیسردا نەبوبێت‌و لەعادەتی ئەو رۆژەوە بەدوور بوبێت .

ئنجا بەرامبەر بەئازاردانی گوناهباران بۆ دان‌نان بە تاوانەکەدا ئەڵێت: ئازاردان بەلیدان‌و بە قامچی (جەڵدە) ئەو رۆژە نەك هەر لە (تحقیق جنائی) لەمیسردا ، بەڵکو لەهەمو رۆژهەڵاتدا باو بووە ، جگە لەوەی تا نیوسەدە پێش ئەو دەمە لەفرەنسە خۆیدا هەمو جۆرە ئازاردان‌و سزایەکی پیس باو بووە تا شورشەکەی فەرەنسە هەمووی لابردن‌و هیچیانی نەهێشت .

دوای ئەوە لەرووی حوکمی مەلاکانیشەوە وەك بەشدار لەتاوەنەکەدا ئەڵێ : وادیارە لەم رووەوە ئەو یاسا کۆنەی فەرەنسەیان خستۆتە کار کە لەسەردەمی لویسی یازدەهەمدا دانرابوو : بەرامبەر بەو کەسانەی کە خەبەری

ئەو پیلانە نادەن کەدژی دەولەت یاخود گەورەکانو حاکمەکان بەرپا ئەبێت، ئەوانیش بە هاوبەشی تاوانباری (اصلی) دائەنرێنو سزاشیـــان هەرسنرای ئەوە٠٠٠٠مەلاکان هەمو دانیان بە ئاگاداربونیاندا پیش روودانی تاوانەکە، ناوە ئنجا ئەڵێت :

ئەگەر لەوچمکەوە سەیری ئەم تاوانە بکەین کە بەرامبەر بە گەورەترین پێشەوای سوپای فەرەنسیەکان کرا لـــە میسردا ، لەکاتیکدا کـــە بـــاری فەرەنسیەکان زۆر لەنگبوو ، ساردی تەواویان لەگەڵ میسریەکاندا هەبوو، جگە لەوەی کە کوشتنی پێشەوایەکی وا ئەبێ بەهۆی تێکچوونی شیرازەی سوپا، دە ئەمانە هیچیان نەبوون بەهۆی ئەوەی ئەو دادگەرانە لە دادو پاکیو رێی‌راست لابدەن ٠

## موحاکەمەی کارۆلینا
## قەراڵیچەی ئینگلتەرە

میرکچە کارۆلینا کچی میری (پرنسویك)ی ئەڵەمانی بوو کە دایان بە جۆرجی چوارەم شای ئینگلترە • ئەم دوانە هیچ کامیان یەکتریان نەدیبوو هەر لەدورەوە بەکاغەز نوسین ڕێك کەوتبوون تاکو بوك گوێزاریەوە کاتێ بوکیان دابەزاند لەدورەوە ، نەدەسگیرانەکەی و نەکەسیکی کەی وەهای نەدی هاتبن بەپیریەوە ، تەنها ئەو ئافرەتە نەبێ کە ئەیان ووت دۆستی میرە •

میرکچ کە گەیشتە ناو شار یەکەم جار میری بەکەیلی لەسەرخوشیا دیی ، یەکەم شەوی زاوایەتیشی ئەوەندەی خواردبوەوە دەمی گۆێ نەئەکرد قسەی پێ بکا ، وەنەبێ ئەمەش خوو ڕەوشتی تەنها ئەوسای میر بووبێ بەڵکو لەوەبەریش هەربەم جۆرەو هەمیشە هەر وەهابوو •

میرکچیش وەنەبێ ئافرەتێکی ئەوەندە جوان بوبێ ، لەبەر ئەوە هەر لەیەکەم مانگی ژنو میردیانەوە میر لووتی لێی خواربوو ، ئەوەندەی پێ نەچوو بەجاریك لێی تەکیەوە ، ئیتر زیاتر خووی دایە ئافرەتەکانی تری ناو کۆشکی شاهانە لەسەرئەوە زۆرجار کارۆلینا ئەیکرد بەشەر لەگەڵیان بۆ ئەوەی دەریان پەڕێنێ بەڵام میر ڕێی نەئەدا ، هەر لەسەر ئەوەش و کارۆلینا ویستی خۆی لەکۆشك بچێتە دەرەوەو لەجیگایەکی کە دامەزرێ ، میر ئەوەشی نەهێشت ، کەسیش حەددی نەبوو بەلایا بچێت ، تاکو یەکەم ساڵ کچیکیان بوو ، میر گورج ئەو منالە ساوایەی لە کۆشی دایکی فراندو

ناردیە دەرەوە بۆ کوشکی (هاملتون) لەوێ پەروەردە کرا ، ئیتر تا ئەو کچە گەورەبوو وەدرا بەشوو ئەو دایکە هەژارەی لە چەند جاریك زیاتر نەدیەوە کە دراش بەشوو هەر ئاگای لێ نەبوو ، کچە بەو شووکردنــە لەدەســت چروساندنەوەو زۆردرای باوکی رزگاری بوو بەڵام ساڵێکی پێ نەچــوو بەسەر منالەوە رۆیشت •

میر بەحەق بێت یا ناحەق دڵی لەکارولینا پیس کردبوو ، کە لە ئینگلترە ئەچوە دەرەوە خێرا میردەکەی دەورو پشتی بە نەهێنیی ئەگرت بۆ ئەوەی لە هەموو هەڵسان‌و دانیشتنی ئاگادار بێت ، تاکو بوختان گەییە رادەیــەك وتیان کارولینا لە ئیتالیا کورێکی بوە لەمیر نیە ، جگە لەوەش هــەر رۆژە پەیامیك ئەنێررا بۆ وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا لەو کەســانەوە کەرقیان لەکارولینا بوو لەبابەت هەڵسان‌و دانیشتنیەوە ، میریش ئەمانەی پێ خۆش‌بوو چونکە حەزی لەچارەی نەئەکردو ئەیویست رزگــاری بێ لێی • لەســەر ئەوە گورج لیژنەیەکی سێ‌کەسی لەدوو پشتیوان‌و نوینەرێکی دەولــەت (ئەمانە نوینەرانی میلانۆیان پێ‌ئەوتن) نارد بۆ ئیتالیا بۆ کۆکردنەوەی ئەو تۆمانجانەی کە کارولینای پێ تووش بکەن ، ئەو لیژنەیەش بەلایەنگیریەکی تەواو گەلێك پیاوخراپیان لەگەڵ کارولینادا کرد ، بەدرۆ زۆرشتیان بــۆ رێك خست ، میر ئەمەی بە هەل زانی گورج ژنەی هینا دەستی لێ هەلبگرێ، بەڵام وەزیران رێ‌یان نەدا چونکە ئەیان زانی ئەم کابرایــە خۆی چەنــدە داوێن‌پیس‌و خراپ بووە لەگەلیا ، هەرچەندە ئافرەتەکەش کە لەتــاو دیلی‌و بەندیەتی خێرا ئەچو بۆ گەڕان بەولاتەکانی ئەوروپادا ، بەڵام ئەویش لە گەرانەکانی‌و هەڵسان‌و دانیشتنیدا زۆر ئاگاداریی شوین‌و ناوی خۆی نەئەکرد •

لەم کاتەدا جۆرجی سێ‌یەم مرد ، دەنگ بڵاوبوەوە کەوا میر ئەچێتــە جیگای باوکی ، میر ئەمەشی بە هەل زانی دیسانەوە داوای تــەلاق دانــی

کارۆلینای کردوەوە ، لەکاتێکا کە کارۆلینا لەئەوروپا بوو بەرێگاوە بوو بۆ ئینگلترە بگەرێتەوە بۆ ئەوەی لەشەکراو خواردنەوەی میری میردیا هاوبەش بێت • میللەتی ئینگلیزیش ئەیانزانی ئەم کابرایە چ جەورو زورێك لەکارۆلینا ئەکات ، لەرقی میرو لەخۆشەویستی کارولینا هەڵسان چوون بەپیریەوە ، زۆر بەگەرم بەخیراتنیان کردەوەو خۆیان هەڵیان گرت تا گەیانیاندەوە ناو شار ، لەولاشەوە پەنجەرەو قاپی ژۆری ئەو ئافرەتەیان ئەدایە بەر بەرد کە دۆستی میربوو •

بەلام لەگەڵ ئەمانەشدا شا گوێی نەدایە ، گورج فەرمانیکی دەرکرد کەوا کارولینای لە شاژنیەتی ئینگلترە خستو بەدەست تیکەلاوکردن لەگەڵ (پارتۆلۆمۆ بەرجامی) ناویکی ئیتالیایی گوناهباری کرد ، کە ئەمەش پێویستی بە محاکەمە هەبوو ، بەگویرەی دەستور ئەو محکمەیان لە ئەندامەکانی ئەنجومەنی لۆردەکان بۆ دامەزرانو محاکەمە لەمانگی ئاغستوسی ساڵی ١٨٢٠دا دەستی پێکرد ، ئەو رۆژانەی شاژن ئەبرا بۆ مەیدانی لوردەکان بۆ محاکەمە ئەو رێگا پانو بەرینە یەکێکی کەی لەبەر تێکچرانی میللەت نەئەگرت کە هەموشیان سەر بە شاژن بوون بۆ ئەوەی لەخۆشیو ناخۆشیدا لەگەڵیدا بن ، تەنها چەند کەسێك نەبێت کە سەر بەشابوون ئەهاتن بەلام ئەوانیش لەگاڵتەو بوغزاندنی میللەت رزگاریان نەئەبو تاکو میللەت خوشەویستترین رۆڵەی خۆی لەبەر چاو کەوت لەسەر ئەوەی کە لایەنگیریی شای ئەکرد لەم باسەدا ، ئەویش (دۆقی ولنگتون) بوو کە شکێنەرو تۆقینەری ناپولیون بوو لە هەرای (واترلو)دا •

ئەندامەکانی محکمەش (لوردەکان) بەر لەوەی محاکمە دەست پێ بکات بوون بەدوو بەشەوە ، لایەکیان سەر بەشا لاکەی تریان سەر بەشاژن • پشتیوانەکانی شاژن چەند کەسێك بوون بەسەرکردەی پشتیوانی بەناوبانگی ئینگلیز (بروجام) •

لەکاتی محاکەمەدا باسی تەلاقدانی شاژن نەهێنرایە پێشەوە ئەگینــا ئەبوایە لەپاڵ ئەوەشا باسی خوو ڕەوشتی هەردوو لا بێتە ناوناوانەوە ، لەبەر ئەوە تەنها بوختانی دەست تیکەلاوکردنی شاژنیان هینایە کایەوە لــەگەڵ (برجامی) ، بۆیان خویندەوە کە وا خزمتکارەکانی شاژن شایەتیان لەســەر داوە گوایە ئەم کابرایە یەکەم جار بۆ شارەزاییی شاژن‌و دەستەو دایــەرەی راگیراوە کە نەشارەزای ولاتی ئیتالیابوون ، ئەم پیاوە لەوەبەر هەر لەگەڵ خزمتکارەکاندا جێگای بۆ چاك کراوە بەڵام سێ هەفتــەی پێ نەچوە شاژن جیگاکەی پێ گواستۆتەوە بۆ ژوریك تەنشت ژوری نوستنی خۆی هەروەها چەند جاریك (برجامی)یان دیوە لەسەر قەراغی چەرپایەکەی شاژن دانیشتوە لەکاتیکا کە شاژن بەرووتی لەناو جیگادا بوەو بینراوە کە یــەك دو جــار ماچیشی کردوە جاریکیش لەسەر پشتی کەشتیەك لەناو ئاوا چادر هــەڵ ئەدەن بۆ شاژن ، نوێنیش بۆ نوستنی (برجامی) هەر لەو چادرەدا رائەخەن بەم جۆرە گوناهباریەتی شاژن دوو رۆژ لەسەریەك لەلایــەن دادخــوازی گشتیەوە خۆیندرایەوە •

بانگ کرایە شایەتی ساغ کەرەوەی ئەم باسە • یەکیك لەوانە کۆنــە پیاوێکی خۆیان بوو ناوی (تیودو ماجوکش) بوو کاتێ شاژن چاوی پــێ کەوت ترسو تورەییەکی ئاشکرا گرتیی ، هەموو کەسێك وای‌ئەزانی کــە ئەم کەینو بەینە راستەو هەموی لەژوور سەرایە بۆیە وا ئەکات ، کابــرا زۆر شتی ووت تا هاتە سەر ئەوەی جاریك شاژن بەڕووتی لەحەماما (برجــامی) بانگ کردوتە ژورەوەو دەرگایان لەسەر خۆیان قایم کردوە ، بەینیك پێکەوە ماونەتەوە • بەم قسەیە زۆر جێگا بە (بروجام)ی پارێزەر لێژ بوو تاکو گورج دەستی کرد بە پرسیاری ورد ورد لەکابرا ، هەرچیەکی لێ پرسی وەڵامــی ئەدایەوە (نون می ریکوردو) واتە (لە بیرم نیە) لە ئەنجامــدا بۆ محکمــە دەرکەوت ، کابرا ئەم قسانە فێرکراوە وەك توتی لەبــەری کردون بۆیــە

ناتوانێ وەڵامی هیچ پرسیارێکی کە بداتەوە کەوابوو ئەم شایەتیە بـاییی پولێکە •

شایەتیکی کەیان بانگکرد کە سەرۆکبوو لە هێزی دەریایی ئیتالیاداو لەو کەشتیەدا ئیشی کردوە کە شاژن چەند جاریك لەناو ئاوا پێی سوراوەتەوە، شایەتی‌دا کە : زۆر جار لە کەشتیەکەدا شـاژن‌و برجامی‌پێـکەوە دیـوە بەڵام لە دواییدا دانی بەوەشدانا کە هەموو مانگیك (٨٠٠) لیرەی پێ ئەدری جگە لە خەرجی تری تاکو لە ئینگلترەدا بمینیتەوە بۆ باسیی ئەم شایەتیە •

سەرۆکێکی کەیان بانگ کرد کە ئەویش وەکو هـاورێ بـەروەکەی شایەتی‌داو دانیشی پیانا کە بالیوزی بەریتانیا لە ناپولی دوو هەزار لیرەی هەر تەنها لەبەر ئەم شایەتیەی ئەداتێ ئینجا کاپتان (بریجر) هێنرا کە ئەمیش سەرۆکیك بوو لە هێزی دەریایی بەریتانیا ، شایەتی‌دا کە چەنـد جارێـك برجامی‌و شاژنی پێکەوە دیوە ، بەڵام کە لی‌یان پرسی :ـ

ـ هیچ رۆژیك تۆ جوڵانەوەیەکی ناشیرینت لە شاژن دیوە ؟

ـ نەخـێر •

ـ جوڵانەوەیەکی وەهات لێ دی‌ی کەبۆنی داوین‌پیسی لی‌بیت ؟

ـ نەخـێر •

ـ دە فەرموو دەرەوە •

ئینجا کارەکەرێکی پێشوی شاژنیان بانگکرد کە ناوی (دیونـت)ی سویسرەیی بوو ، ئەمیان نەختێك لـەوانی کە خوینـدەوار ترو ژیرتـرو قسەکانی کاریگەر تربوو ، سوێندی خـوارد کەوا : زۆر جـار برجـامی لەباخڵی شاژنا دیوە ، بەڵام شایەتی ئەمیش لەئەنجامـدا کاری لەقسـەی ئەوانەی پێشوو زیاتر نەبوو چونکە دەرکەوت کە شاژن لەکاتی خۆیا ئـەم

کارەکەرەی لەسەر درۆ دەرکردوە ، تاوەکو دەریــش کەوت کە (دیمونت) خۆی نوسراویکی بۆ خوشکێکی ناردوە ئەڵێت : (پەیامیان بۆ ناردوم کەوا پارەیەکی زۆرم ئەدەنێ بۆ ئەوەی بچمە لندن شایەتی لەئاغــاژنم بدەم) •

هەروەها (راستیلی) ناوێك کە ئەیوت من مەیتــەرەوانی وڵاخەکانــی شاژن بووم شایەتی وەرگیرا ، دانی پیانا کەوا : نەهینی نوینەرانی میــلانو بوەو گەراوە کە شتێك لەشاژن بدوزێتەوە بەکاری ساغبونەوە بێت •

شایەتەکانی شاژن : ئەمانە بەپێچەوانەی پێشوەکانەوە هەموو پیــاوی باشباشو ناوخاسو خاوین بوون هەموشیــان ئاگاداریی جوڵانــەوەی شاژن بوون لەدەرەوە • یەکێك لەوانە کابرایەکی ئیتالیایی بۆیەچی بــوو ، بۆیەی ئەو خانوەیکردبوو کە شاژن بەکرێیی گرتبــوو شــایەتیدا کەوا : راستیللی لای ئەویش دانی پیاناوە کە لە لایەن (نوینەرانی میلانــووە) بــۆ شایەت پەیداکردن لە دژی شاژن بەکرێ گیراوە کە ئەمەی ووت بروجامی محامی لەویدا هەڵیدایە ، خــیرا داوای کرد کــە جارێــکیکە راستیــللی بهینرێتەوە محکمەو سەرلەنوێ قسە بکاتەوە ، بەڵام دادخوازی گشتیی بۆ ئەوەی ئیشە ناشیرینــەکانی کەی دەرنــەکەوێ راســتیللی کە لەشایــەتی هەوڵجار بوبوەوە خێرا دەستیان پێوە نابوو ناردبویــانەوە بۆ ئیتالیــا • کە بروجام داوای کردەوە داد خوازی گشتیی ناچار بوو دانی پیانا کــە گەرانویانەتەوە بۆ میلانو • لیرەدا بروجام بەجاری قسەکانی چوە ســەرو پرسیاری کرد : ئایا پێویستە ئیتر لەسەر محاکەمە بروێن دوای ئەوەی هەموو درۆو دەلەسەی شایەتەکان لەبناغەوە رووخان ؟ جگە لەمە ساغیکردەوە کــە راستیللی لە ئیتالیا هەمیشە کنەی لەمو لەوا کردوە کەشایەتی بەپارە لەدژی شاژن بدەن •

ئنجا هاتە سەر ئەوەی ئەنجومەنی لوردان (ئەندامەکانی دادگا) فەرمان

دەرکەن ، دوای ئەوەی سێ چوار جار دەنگی ئەندامەکان جوێ کرایەوەو لەژێر زۆری دەوڵەتدا دەنگی ئەو ئەندامانە زۆرتربوو کە شاژنیان گوناهبار کرد ، (١٠٨) دەنگ بەرامبەر (٩٩) دەنگ کە لەپاڵ شاژنا بوو • لەبەر ئەوەی بەینیکی وەها نەبوو لە دەنگەکانا ، لوردی لیڤرپول (سەروکی ئەنجومـــەن) بریاریدا کەوا دەوڵەت وازی لە محاکەمەی شاژن هێنا چونکە کاروبارەکە دوژمنایەتی تیدایە ، سەرەڕای ئەوەی کە دەنگی گشتیش لەگەڵ شاژندایە •

هەموو گەلی ئینگلـــیز لەخۆشی ئەم فەرمـــانە ئەو شەوە نەنوســـتن ، بۆیان کرد بەشایی‌و شەکراو خواردنەوە ، دایان لەتەقەی دەهۆڵ‌و زورنا ، بەڵام ساڵ وەرنەگەرایەوە دوای رزگاربونی شاژن لەو بوختانە ، بەداخەوە سەری‌نایەوە ، چونکە بوختانەکە بوختانێکی کەم نەبوو •

ئەئاوا گەلی ئنگلـــیزو نۆینـــەرانی گـــەل ، دژی زۆرو زۆرداری‌ی‌و بوختان وەستان ، دژی شا وەستان‌و نەیان هێشت بوختانەکەی بۆ بچێتـــە سەر ••• کە ئەمەش لاپەرەیەکی زێڕینە لە لاپەڕەکانی دادگای ئینگلتەرە• بێ‌لایەنی‌و راستی‌ی‌و دادگەری دادگای ئینگلتەرە دەرئەخات ، بەجۆرێـــك، (مەلیك) بەهەمو هێزێکیەوە ئەیویست کار بکاتە سەر ئەندامەکانی دادگا لە ئەنجومەنی لۆردەکان شاژن گوناهبار بکەن ، بەڵام ئێستاو ئەوسا هیچـــی بۆ نەکراو حەق‌و داد ریگای خۆیان گرت •

# موحـــاكەمەی دریفــۆس

دریفۆس کی‌یـــە ؟

دریفۆس لەبنەرەتا لە خیزانیکی ئەلزاسی لەرەگەزی جولەکەیە ، لـــە سالی ۱۸٦۰دا لەدایك بووە بە دەسالْ دوای بوونی‌ی شەری (۷۰) سالْـــە لەبەینی فەرەنسەو ئەلەمانەکاندا هەلْگیرسا ، ئەلزاس‌و لورین کە دوو پارچە بوون لەفەرەنسە لێی سەندرایەوەو درا بە ئەلەمانیا ، لەتاو ئەوە کە سوکاری دریفۆس ئەلزاسیان بەجێ‌هیشت‌و چوون لە پاریسدا جێ‌گیر بوون •

دریفۆس یەکیـــك بوو لەوانـــەی کە هەســـتی بـــەو زۆرە کرد کـــە لەنیشتمانەکەی کراوە ، بۆچی ئەلزاس‌و لورین‌یان لەفەرەنسە پچری‌و دایان بە ئەلەمانیا ؟ ئەهی کرد تۆلە بسێنێ ، نزیك‌ترین ریگاش بۆ ئەو تۆلەسەندنە سەربازی بوو ، خێرا چوە قوتابخـــانەی سەربازیـــەوە ، دوای چوارســـالْ بەئەفسەری تۆپچی دەرچوو شەش سالی پێ‌نـــەچوو دوای ئەوە ، خـــۆی گەیاندە قوتابخانەی سەرەواری‌شەرەوە ، دوای دوسالْ لەنـــاو دوســـەد قوتابیدا بە تۆهەم دەرچوو وە لەپلەی هەرەباشەکان ژمیردرا •

ئەم هونەرمەندیەتیەو پێشکەوتنە لەئیشدا لەگەلْ گەنجی‌و جـــوانی‌و دەولەمەندی لەلایەك ، جوانی ئەو ژنە بالاّ بەرزە قەد باریـــکە ئەگریجـــە خاوەی کە هێنابووی لە لایەکی کەوە ئەمانە بوون بەهۆی ئەوەی دلی زۆر کەسی پێ تەنگ بێ‌و بگەرێن چالێکی بۆ هەلْکەنن ، ئەمە هەمووی لەکاتێکا بوو کە جەنەرال (مەرسییە) وەزیری جەنگی فەرەنسە بوو ، چەند پلەیـــەك

خوار ئەو کۆلۆنیل (ساندهر) سەرۆکی گیرانی (مخابراتی سوپایی) بوو ئەو ساندهەرەی بەخوێنی سەری جولەکە تینو بوو هێچگار دریفـوس ، لەبەر ئەوەی کە لە لیژنەی سەرەواری شەررا بوو •

کولونیل (هنری) ناویکی نیشتمـان فرۆشی بەدنمەکیش یـاریەدەری ساندهر بوو ، بۆیە ئەلیرن نیشتمان فرۆش چونکە زیاتر لە سەدو شەسـت پەیامی نەهێنی ولآتەکەی بە ئەڵەمانەکان فروشت بەهۆی (اسـتر هـازی) ناوێکەوە کەهەموو باسی چەكو تۆپو تۆپخانەی فەرەنسەییەکانی تیابوو ، جگە لە زۆر باسی نەهێنی تر •

لەکاتی ئەم چیرۆکەدا بالیۆزخانەی ئەڵەمانیا لەفەرەنسە ئافرەتیـکی فەرەنسەییان گرتبوو بۆ گسكدانو خۆڵرشتنی باڵیوزخانەکەیان ، هـەر ئەو ئافرەتە لەلایەکی کەوە لقی مخابەراتی لەشکرىی فەرەنسـە سازیـان کردبوو کە هەرچی فڕێدراوو وردە کاغەزێ کە بالیوزخـانەی ئەلەمانیـا پێی فرێ ئەدەن ، بۆ ئەمانی بهێنێ بەپارە لێی بکرن •

خواو راستان یەکێك لەو نەهێنیانەی بەهۆی ئەم ئافرەتەوە چنگیـان کەوت ، پارچەی ئەو کاغەزانە بوو کە هنری بەبالیوزخانەی ئەلەمانەکانـی ئەفرۆشت •

دەمودەس زابتەکان هەستیان کرد بەوەی کە نەهینیان ئەچیتە دەرەوە ، لەو ناوەدا دریفۆسیان تووش کرد ، جارێ لەبەر ئەوەی ساندهر زۆر رقـی لەجولەکە بوو ، ئنجا لەسەر ئەوەی ئەو نوسراوە لە دەستخەتی دریفۆس ئەچوو ، جگە لەوەی ئەو باسانەی لەو نـوسراوەدا بوو هەمـوو بـاسی توپخانەو چەکەکانی بوو کە پیویستە دریفـۆس بەهـۆی فرمانەکەیـەوە ئاگاداریان بیت چونکە ئەو سەرەواری جەنگ بوو ئنجا بۆ ئەوەی زیاتر دڵنیابن لە پێوەکردنی دریفۆس ، دەست نووسەکەیان دا بە پسپوری تایبـەتی بـۆ

بەراوردکردنی لەگەڵ دەست نووسی دریفۆسدا پسپۆر دوای تێ ڕوانینیکی درشت گورج بڕیاریدا کەوا نوسینەکان لەیەك ئەچن ، خۆ هەر کەسێکیش بیوتایە وانیە هەزار سوێندی لەسەر ئەخوارد • ئیتر میهرەبانی کاری خۆی کرد لەناو گەلدا بووبە چاولێکردن هەر کەست ئەدی بوو بوو بە دوژمنی خوێنخۆری دریفۆس ، جا با ئەم کابرایە ئاگاداری هیچ نەبیت خۆ هەر ئەبێ بگیرێ وبکرێتە ژورەوە • لە رۆژی ١٥ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٨٩٤دا هەر هنری خۆی چوو دریفۆسی گرت ، دوای ئەوەی کەلەپچەی کردە دەست فرێیی دایە زیندانەوە ، تاکو رۆژی ١٩ی کانونی یەکەمی هەمان ساڵ کە بڕیار درا بۆ محاکەمەکردنی •

حەوت کەس لە سەرکردەکانی سوپا بە ئەندام لەو محکمەیەدا دانران•

ئەو تۆمانجانەی ئاراستەی دریفۆس کران ئەمانە بوون :ــ

١ــ لەیەك چوونی نوسینی دریفۆس و کاغەزەکەو بڕیاری پسپۆری تایبەتی لەم بابەتەوە •

٢ــ ئەو چوار نوسراوەی بەهۆی هنریەوە ریکخرابوون ، یەکێکیان لەبابەت فروشتنی دریفۆس نەهینی بۆمبا بە ئەلەمانەکان ، دووەمیان خوو رەوشتی دریفۆس کە بە جورێکی زۆر پیسو ناشیرین لە قەڵەم درابوو ، سییەمیان ئەو دونوسراوە کە بەزمانی (ملحقی) سوپایی ئیتالیاوە رێكخرابوون ئەلیت (د) ناویك نەهینییان پێ ئەفروشێت و ژنی ئەو کابرایەش لەگەڵ (ملحقەکانا) زۆر جار نانی خواردوە ، چوارەمیان وێنەیەك لە نوسراوی نەهینی (ملحقی) سوپایی ئیتالیا بۆ دەوڵەتەکەی کە ئەڵێت (ئەگەر دریفۆس هیچ پەیوەندیەکی بەئیمەوە نیە پێویستە بالێوز رابسپێرێ کەوا هەر شتێك لەم بابەتەوە لەرۆژنامەکانی فرنسەدا بڵاو ئەکرێتەوە بە درۆی بخاتەوە ) کەچی شفرەکانی ئەم نوسراوە بەپێچەوانە وەرگێرابوو کە

گوایه (ملحق) مەبەس لەوەیە (لەپاش گرتنی دریفۆس پیویستە ئاگاداریی خۆمان زۆر بکەین نەك بە نەهینیەکانمان بزانرێن ) •

٣ــ ئەو درۆو دەلەسانەی وەزیری جەنگ بەناوی دریفۆسەوە بلاوی کردبوەوە لە رۆژنامەکاندا کە گوایە دریفۆس وتویەتی (ئەگەر منیش ئـــەو نەهێنیانەم دەست ئەلەمانەکان خستبێ خۆ شتێکی وایان تیا نەبوە شایەنی باس بن ، بۆ ئەوە داومنەتی سیخوررەکانیانم بۆ دەرکەون ) •

٤ــ مانەوەی دریفۆس هەموو رۆژێــك دوای هەلسـان لە شــوینی فرمانەکەی ، جگە لەوەی کە لەکاتی گرتنیدا وتویــەتی (هــا ئەوە کلیــلی ژورەکەم منەتتان ئەبێ بچن زۆر باش بگەرێن بەلام بەخوا هیچ نادۆزنەوە) ئەم قسەیەشیان بۆ وەرگیرا کە گوایە ئەو ئیشی خۆی ساز کردوە ، هەموو شتێکی شاردۆتەوە ، چونکە ئەم رۆژەی لەبــەر چــاو بووە بــەم جــۆرە (ئەنجومەنی بەرزی لەشکریی فرنسە) پیاوێکی بێ گوناهی بێ تــاوانی بەگوناهبارو بەدنمەك دایە قەلەم ، بریاری بەندیەتیدا ، پاشل پیسەکانیش لە دەرەوە وەك نەبایان دیبێ نە باران بە سەربەســتی ئەسورانــەوەو وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرچون • جا جگە لە بریاری بەندیەتی دریفۆس بەرگی سەربازیەتیەکەشیان لەبەر داکەن‌و ئەستیرەکانی سەر شانیشیان لێ سەندەوە، کاتێ سەرەکی پێشەوای تازەش هــاتە سەر کار ، ئەویش بــەشی خــۆی بە دریفۆس کرد فەرمانیدا نابێ لەخاکی فرنســەدا بمێنێتــەوە ، ناردیانــە دوورگەی (شەیتان) لە قەراغی ولاتی غینیای فرنسی لە ئەمریکای خوارو •

جگە لەویش وەزیری مستعمرات زیاتری پێ کرد ، ئەمیش فەرمانیدا دەست‌و پێی دریفۆس زنجیر بکرێ‌و لەکاتی نوستنیا بەشیشیکی ئــاسنی دریژەوە ببەسترێتەوە کە تەنها هەر بەسەر لایەکا بتوانێ بکەوێت •

دریفۆس بەئاواتەوە بوو بمرێ‌و رزگاری بێ لەو سزایەی لە بەندیخانەدا

ئەی کێشا ، چونکە بەمردن نەبوایە لەو هەموو ئازارو نەخۆشییە رزگاری نەئەبوو بەڵام خوا گەورەیەو دەرووی هەر لەلایە ، قاپیەك داخا ، قاپیەك ئەکاتەوە ، لە رۆژی یەکی مانگی تەمموزی ساڵی ١٨٩٥دا (ساندەر) لە سەرۆکی گێرانی مخابراتی نەهێنی لا براو لە جێگای ئەو کۆلۆنیل (بیکار) دانرا ، تاکو خواو راستان جارێکی کە ئافرەتی خۆڵرێژ لە سەبەتەکەیدا وێنەی دۆەمی کاغەزێکی باڵیۆزخانەی ئەڵمانیەکانیان بۆ ئەباتەوە کە ئەوان نوسیویانە بۆ ئەسترهازی لەبابەت بەسەرهاتی دریفۆسەوە • بیکار لەم کارو بارە زۆر سەرسام ئەمێنێو دوو دڵ ئەبێ ، ناچار دەست ئەکات بەپرسیارکردنی رەوشتو هەڵسانو دانیشتنی ئەسترهازی ، بۆی دەرئەکەوێ کەوا کابرایەکی تا حەزکەیت سوكو رسوایە ، ناکاتە نامەردی داوای دەست نوسی ئەسترهازی ئەکات ، وەك لەبانیکەوە بەری دەیتە خوارەوە کە ئەبینێ ئەو نوسراوەی دریفۆسی لەسەر گیراوە لەگەڵ دەست خەتی ئەسترهازی یەکن ، لە هەموی سەیرتر ئەوەبوو هەر ئەو پسپۆرەی لەکاتی خۆیدا بەهەمو بروایەکیەوە بریاری دابوو کەنوسراوەکە دەستخەتی دریفۆسە ، ئەم جارە هەر ئەو کابرایە سوێندنی لەجاری پێشو زیاتر خوارد کەوا دەسخەتی ئەسترهازیە ، لە مانگی ئەیلولی ساڵی ١٨٩٦دا رۆژنامەی (اکلیر) داستانیك ئەنوسێت لەبابەت روداوەکەی دریفۆسەوە ، رۆژنامەی (الماتا)ش لاسایی ئەو ئەکاتەوە ، ئەمیش هەر لەسەر ناپاکی دریفۆس بۆی ئەروا بەڵام خراپتر ، ئەم وینەیەکی فوتوغرافیی ئەو نوسراوەش بلاوئەکاتەوە کە دریفۆسیان لەسەر تووش کردوە ، بێ گومان چ ملحقی سوپایی ئەلمانو ئیتالیاو چ ئەسترهازی ئەمەیان لا ناخۆشە ، تەنانەت ئەسترهازی لەسەر ئەوە خۆی وون ئەکات ، ژنەکەی دریفۆس ئەمە بەهەل ئەزانێ دووبارە ئەچێ داوینی سەروکەکانی سپاو دادگا ئەگرێتەوە ، کەچی وەزیری جەنگ بێ ئەوەی لە هیچ بزانێ هەر لە خۆیەوە جوابی ئەدا ، کەوا

خوا لەکاری خۆیبۆتەوەو ئەم ئیشە کۆتایی پیٚهاتوە ، ژنەی هەژار بە هەناسەی ساردەوە پاشەو پاش ئەگەریتەوە ، لەو لاشەوە ئەسترهازی کە خۆی شاردبوەوە سەر دەرینیو دیتەوە ناو تاوان •

بیٚینەوە سەرەوکاری بیکار بزانین چی ئەکات بۆ دریفۆس ، لەو کاتەدا کە ئەو هەموو کارەساتە رووی‌دا بیکار بە ئیشیکی میری تێررا بۆ دەرەوەی فرنسە ، بۆ ولاتی تونس ، هنری ناپاك کرا بە جیٚنشینی تا ئەگەریتەوە •

هنری لەو کاتەدا بۆ رزگاربوونی خۆیو ئەسترهازی هاوریٚیو بۆ قورگرتنەوە بۆ دریفۆس تا بیناقاقەی ، هەرچیەکی لەدەست هات کردی ، تەنانەت رای سپارد لە تونس بیکار بکوژن نەك کە هاتەوە نەهینیەکەیان دەرخات ، بەلاّم بۆیان نەچوە سەر ، ئەوەندەی پیٚ نەچوو بیکار بەساغی گەرایەوە گورج لە ئیشەکەی دریفۆس هەلّچوەوە بەلاّم ئەمجارە کورانە ، هەلّسا هەرچی نوسراویٚك بوو لەبابەت دەست پیسیو خراپەی هنریو پاکی دریفۆسەوە هەموی دابە (جیٚنشینی سەرەکی ئەنجومەنی ریش سپیان ــ شویرر کستنر) ــ ئەم پیاوەش بەدلیٚکی پاکەوە ویستی ئەم چەوتیە راستکاتەوە ، چوە لای سەرەك وەزیرانو وەزیری جەنگ کەراستیەکەیان تیٚ بگەیەنیٚت بەلاّم ئەوانیش وەها گوناهباریی دریفۆسیان چوبوە میٚشکەوە نەك بەو بەموکیٚشیش لە میٚشکیان دەر نەئەهات •

لە سالّی ١٨٩٧دا جامبازیٚك (دیکسترو) ناو پەیا بوو لەکاتی خویا ئەو هەمو ئیشو کاریٚکی ئەسترهازی لە بانقدا هەلّسوراندوە ، ئەم کابرایە دەریخست کەوا ئەو کاغەزەی دریفۆسی لەسەر گیراوە ، بە دەستو خەتی ئەسترهازی نوسراوەو زۆر بەئاسانی ئەتوانیٚ ئەمە ساغ بکاتەوە ، برایەکی دریفۆس ئەمەی بەهەل زانی گورج لە رۆژنامەکانا بلاّوی کردەوە ، کەوا

هەمو سوچیك لە ئەسترهازیەوە بوەو براکەی پاکە • لە ئەنجامی ئەمـەدا پیاو خراپان دەستیان کرد بە خراپەکردنی ئاشکرا لەگەڵ تاقمی دریفۆس • هنری و ئەسترهازی خێرا خێرا بروسکەیان بـەناوی بیکارەوە لێ ئـەدا کە تووشی بکەن ، بەڵام بێ گومان یەکیك راستبوو هیچ کاتێك ناکەوێ ، بەد خوای بەجۆریك سەری لەو دوانە شیواندبوو ، کە نـاوی بیکاریـان لەبروسکەکانا وەها ئەنوسی دیاربوو دەس خەتی خۆیانە ، بەمە ئەسترهازی زانی کەوا رۆژی روناك و پاکی ئەوەندەی نەمـاوە لـەهەوری تاریـك و چلکن سەر دەرهینێ ، لەترسی گیانی خـۆی زیـاتر دەسی کرد بەجوڵـەو پەلەقاژە ، هەستا چوە سەر ملحقی سوپایی ئەڵمانیا بەدەمانچەوە ، بۆ ئەوەی بینێرێتە سەر ژنەکەی دریفوس و پێی بڵێ کەوا (دریفۆسی مـێردی ئـەو نەهینیانەی پێ فروشتوم) بۆ ئەوەی ئیتر تەقەلای بەربونی دریفۆس نـەدا ، بەڵام ملحق هەر وەڵامیشی نەدایەوە ئەوە نەبێ پەیمانی دایە کە تـا بتوانـێ ناوی ئەو نەخاتە ناو ناوانەوە •

ئەم جووتە بەدبەختانە هەر وازیان نەهێنا، تا ئەهات خراپتریان ئەکرد، ئەنجا ئەسترهازی چوو هەندێ خراپەی بۆ خۆی هەڵ بەست و بەدەست خـەتی خۆی نوسی و خستیانە ناو ئەو نوسراوانەوە کە بیکار کـۆی کردبـوەوە لەحەقیان ، بێ گومان ئەوسا لەمحاکمەدا دەر ئەکەوێ کە ئەسترهازی دوورە لەو گوناهانەی خۆی بۆخۆی هەڵبەستوە ، هەر بەوە لەگوناهەکانی تریش رزگاری ئەبێ ، سا هەرواش بوو زۆر باش بەو فرۆفێڵە رزگـاری بوو و محکمەیان وا لێ کرد بیکاریان پێ کردە ژورەوە •

لەم کاتەدا نەعرەتەی پشتیوان و نوسەری هەرە بەناوبانگی فرنسـە ، بەڵکو جهان (امیل زولا) بەرز بوەوەو راپـەری لەو هەمـو ناهەقیـانەی دەولەت و سوپاو دادگاو دەنگی گشتی فرنسە کە لە دریفۆسی پاکی بێ تاوانی ئەکەن ، بەڵام چۆن راپەرینێ ، بەقسەو بەنوسـینەکانی هەمـوو گیتی ی

تێ گەیاند ، کردی بەهەرایەك دەولەتی بەجارێ شت ، بەتەواوی بریاری خۆ بەخت کردنی دابوو لە ریگای دادپرسیندا بەلام داخەکەم ئەو هەموو تەقەلایە لە هەوەڵەوە هیچ سودیکی نەبوو بەلکو بە پیچەوانەی ئەوەوە (زۆلا) خۆی درا بە محکمە لەسەر قسەی وەزیری جەنگ کە وتی : (امیل زولا بەجاریك حەیای سوپای برد ، چەند ساڵە تێ ئەکۆشین لە رێگای نیشتماندا ئێستا ئێمە بەدەس بڕ دەر ئەچین • ئەگەر زۆلا نەدرێ بە محکمە بۆ تۆڵە سەندنی ئەو بوختانانە لێی ، ئێمە هەموو لەئیش دەر ئەچین ) •

ئا بەم جۆرە امیل زولاش درا بە محکمە ، ئەمیش بەرگریەکی بەهێزو کاریگەری وای نووسی کە لە هەموو جهاندا دەنگی دایەوە ، کە ووتی :ــ دریفۆس پاکە ، سوێند ئەخۆم بە ئابرووم بە ژیانم ، لەم ساتە تەنگ و چەلەمەیەدا ، لەبەر دەمی ئەم دادگا بەرزەدا کە بۆ دادپرسینێکی راست پێك هاتوە لەبەر دەمی ئیوەدا ئەی هونەرمەندان کە لە بەرزترین پیاوی دادو یاسان ، لەلای هەمو میللەتی فرنسە ، بەلکو لەناو هەمو جهانا سویند ئەخۆم و ئەلێم دریفۆس پاکە ، ئەنجا بەناوی ئەو چل سالەوە کە لەئیش و ئێشدا رامبواردوە بە ناوی ئەو بەهرە سەلاریەوە کە لەپاداشی ئەو فرمانە قورسەدا پێم بەخشراوە ، هەمدیسانەوە بەناوی ئەو شوێنە بەرزەوە کەبۆ خۆمم دروست کردوەو بەرد لەسەر بەرد بناغەم داناوە ، بەناوی نوسینەکانمەوە کەبێ گومان بەشداربوون لە بلاوکردنەوەی تێ گەیشتن و پێ گەیشتنی میللەتی فرنسە ، سا با ئەوانە هەموو رەشەبا بردبنی ، با نوسراوەکانم هەموویان فەوتابن و ناوم لەرووی زەمیندا کوژابێتەوە ، ئەگەر ئەم دریفۆسە پاك نەبوو ، سا هەر پاکە •• پاکە •• پاکە • هەرچی هەیەو نیە لەم کارەساتەدا ناحەزیم لەگەڵ ئەکەن چ کۆمەلی ریش سپیان چ پەرلەمان چ پیاوە ئاینیەکان چ رۆژنامە گەورەکان ئەنجا دەنگی گشتی ی کە ئەوانەی پێشەوە مێشکیان پیس کردوە ، بەلام من کەسم لە گەلا نیە

بەهرەی راستیو حەق پەرستی نەبێ • هەرچەندەش زۆر باش ئەزانم لەسەر ئەمە تووشم ئەکەن بەلام ئەهێکەو کردومە پێویستە لەسەرم ولاتەکەم لەدرۆو زۆرو زۆرداری رزگار بکەم ، رۆژێك ئەبێ هەمو فرنسە سوپاسم ئـەکات چونکە ئابرویم کریوەتەوە ) • سەرەرای ئەو پارێزگاریە کاریـگەرەو ئـەو هەمو قسەو باسە ئەمرانەی زۆلا کردنی ئەنجا هیچ سوودێکی نەبوو کەس گۆیی لێ نەگرت بەلکو بە پێچەوانـەی ئـەوەوە زۆلا درا بـە محکمـە بەسالێك بەندیەتیو سێ هەزار فرنك جەزا فەرمان بەسەریا درا بـەلام زۆلا خۆی لەو فەرمانە هەلچووەوە ، لە ئەنجـامی ئەو تێهەلچونەوەیەدا فەرمانی محکمەی پێشو هەلوەشایەوەو بریاری محاکمەی زۆلا سەر لەنوێ درایەوە، لە دواییدا هەندێ لەدۆست خواهـانی زۆلا ئاموژگاریـان کـرد کە واز بهێنێتو بە خۆرایی خۆی توشی بەندیخانەی زۆرو زۆرداران نەکا وا باشە بروا بەلایەکا ، زۆلا بە قسەیکردن هەستـا چوو بۆ ئینگـلترە کە لـەوێ دانیشێت هەتا ئەم چەرخە ئەگۆرێت ، لەو لاشـەوە بە نەهینی محـاکمەی ( بیـکار ) کـرا فەرمـانی دەرکردنـی ئـەویش درا لەسوپـا ••• بەم جۆرە ئەم جارەش هەر پاشلپیسو دەستبرو خراپـەکەران بەسـەر دادو راستیا سەرکەوتن ، بەلام بێگومان هەر ئەبێ لە ئەنجامدا حەق جێی خۆی بگرێ ، ئەوەندەی پێ نەچوو کۆمـەلی تـازەی نوێنەران لە فەرەنسـەدا هەلبژێررا ، وەزیری جەنگی تازەش وەك وەزیرەکانی پێش خۆی هەلسـا بە تەگبیری هنری کاغەزێکی درۆی رێكخـستو دای بە پەرلەمـان کەوا ئێستا دریفۆس بە دەمی خۆی دان بەگوناهباری خۆیدا ئەنێ ، پەرلەمانیش کە (٥٧٤) ئەندام بوون ٥٧٢یان بریاریان لەسەر ئەوەدا کە وێنـەی ئـەو قاقەزە بنوسرێتەوەو بە هەمو دیهاتەکانی فرنسەدا کە ٣٦٠٠ دێ بوو بـلاو بکرێتەوە • بیکار لەسەر ئەمە خۆی نەگرت لەرۆژنامەکاندا وەزیری بەدرۆ خستەوە کەوا دریفۆس بەهیچ جۆرێك ئەمەی نەوتوەو هیچ کاتێـك ئـەم

بوختانە بۆ خۆی ناگات • وەلامی دەولەت بۆ ئەم هەڵـدانەوەی (بیکار)ە ئەوە بوو دیسانەوە کردیانەوە ژووری بەندیخانە •

دوای ئەم هەمو زۆرداری‌و ناحەقیە کە دەنگی گشتی فرنسەو سپاو محکمەو کۆمەڵی نوینەران لە دریفۆسیان کرد ، ئەمجار دەروئی ملحقەکانی بالیوزخانەی ئیتالیاو ئەڵمانیا هاتە جۆش‌و لەمە زیاتر خویان لەسەر ئـەو ناهەقیانە پێ نەگیرا ، بلاویان کردەوە کەوا ئەم کارەساتە ، هەر لەهەوەلیەوە تادواییەکەی هەمووی هەڵبەستە ، ئەو نوسراوانەی دریفۆسی لەسەر گیراوە هەمووی هنری‌و ئەسترهازی رێکیان خستوە ، تەنها بەمە وازیان نەهینـا هەستان چوونە لای وەزیری جەنگیش ئەمانەیان تێ‌گەیاند •• کە وەزیـر دەستی کرد بە لێکولینەوەو پرسیارکردن هەمو شتێکی بۆ دەرکەوت ، ئەنجا تەنگی بە هنری هەڵچنی ، هنری هیچی بۆنەمایەوە دانی بە هەمویاندانا ، لەسەر ئەوە گورج گیراو کەلەبچە کرایە دەستی •

بۆ رۆژی دوایی کە ئەچنە ئەو ژوری بەندیخانەیەی کە هنری تیایە ، سەیر ئەکەن گیانیان کێشاوە ، سەریان بڕیوەو لاشەکەی لەو نـاوەدا لـە خوێنی خۆیا ئەگەوزێ ، ئیستاش کەس بە تەواوی نەیزانی چۆنو لەسـەر چی‌و لەلایەن کێوە سەربرِرا ؟ ئایا لە لایەن هاوریکانیـەوە کوژراوە بـۆ ئەوەی راستیان لێ نەڵێ ؟ یاخود خۆی خۆی لەناو بردوە لەسەر قسـەی سەرۆکەکانی بۆ ئەوەی ناوی سپا پیس نەکا ؟ یاخود لە تەریقی‌و پـایشتی ئیشی نارێکی‌خویا ؟ کەس نەیزانی •

لەسەر کوشتنی هنری روژنامەکانی فرنسە کردیـان بە کارەساتێـک مەپرسە • تەنانەت هیچیان بۆ نەمایەوە لەمو لەو شەش هەزار جونەیهیان بۆ کۆکردەوە کە پەیکەرێکی بۆ دروست بکەن چونکە راست بۆیژی رێـگای نیشتمانە هەر چەند خۆی بەناحەق فەوتا با ناوی بەرزی هەر بمێنێ •

وتمان هنری پێش مردنی دانی بەوەدا نابوو کەوا خۆشی گوناهبارە ئەم دەربرینە بێ گومان ئەسترهازی پێ تووش ئەبێ ، کەوابوو با ڕا بــکات لە هەموی باشترە ، گورج داوینیکرد بەلادا بۆی دەرچوو بۆ ئینگلتــرە ، لەوێ بێ شەرمو حەیا لای هەموکەس بێ ترس ئەیدرکان کــە نووســەری ئەو نوسراوانەی دریفۆسی لەسەر گیرا خۆی نەبێ کەسی تر نیە ، • بەمــە دەولەت ناچار ما دریفۆس لە دوورگەی (شەیتان)ەوە بێنێتەوە بۆ فرنســە کە سەر لەنوێ دادی بپرسرێتەوە ، بەڵام دادپرسێنێکی وەکو پێشــو بــە نهینی نەء ، بەلکو بە پێویست زانرا ئەمجارە ئاشکرابێ بۆ ئەوەی دەنــگی گشتیش ئاگادار بێ ، شەش وەزیر لەوەزیرەکانی جەنگی پێشو لەوانــەی ئاگاداری ئەم باسەن هێنران بۆ شایەتیی ، هەر شەشیان ئەمجارە تێکــڕا شایەتیاندا کەوا دریفۆس پاکە هیچی لە ژوور سەرا نیە •• دۆسیەی ئەو نوسراوانەیان هێنا کە دریفۆسی پێ تووش کرابوو سەیریان کرد هیچی وای تیانیە کە شایەنی ئەوە بێ ئەم کارەساتە بە دریفۆس بکری •

کاتیك کە میللەتی فرنســەو دەنگیگشتیی گیتیی بەمەیــان زانــی کردیــان بەهەرا ، بــۆچی تا ئیستا راستییــان لــێ شــاردراوەتەوە ، ؟ میریی ناچار بوو کوتوپڕ دریفۆسی بەرەڵلا کرد •

زانیمان دریفۆس چەند سزای کیشاوە لە بەندیخانەدا بەبێ سوچو گوناح ، لەبەر ئەوە تەنها بەهینانە دەرەوەی وازی نەهێنا ، تا دەولەتی ناچار کرد ، سەر لەنوێ دادی بپرسێتەوە بۆ ئەوەی تۆڵەی ئەو چەندساڵەی کــە بە ناحەق لە بەندیخانەدا رایبواردبوو تۆڵەی ئەو ئابرو چونەی بسێنێتەوە کە تا پێنج ساڵ خەلك وەك بنێشتە خۆشە دانیان پیا ئەناو ئەیان جوو ، تفەو لەعنەتیان ئەکرد ، بۆ ئەوەش کە جیگاو پایەی پێشوی دەست کەویتەوە • دادگا ســەر لەنوێ تــا سێ سالی کە (لە سالی ١٩٠٣وە تا ١٩٠٦) بــەم کارەساتەوە خەریــك بووەوە ، بەڵام ئەمجــارە لەسەرخــۆو بــەووردی ،

ئەوەندەی پێ نەچوو هەرچی هەبوو نەبوو وەك هیلکەی پاك کراوی لێ کرد، بۆی دەرکەوت کەوا دریفۆس لەشیر پاکترە ، جگە لەوە پێویستە تۆڵەی ئەو زوڵمو زۆرەی بۆ بکرێتەوە کە لێی کراوە •••

ئەم بریاری محکمەیە پەنجا رۆژنامە زیاتر بڵاوی کردەوە لەسەر ئەرکی میری ••• پەرلەمان ئەنجا بڕیاریدا سوپاسی ئەو کەسانە بکا کە بنجو بناوانی ئەم بوختانەیان دەرخست چونکە ئابڕووی دادگاو پەرلەمانو رۆژنامەکانو دەوڵەتی فرنسەیان کڕیەوە •

بۆ دریفۆس خۆشی بریار درا کە درووشمی تیپی شەرەف (لیجون دونور) هەڵگرێ ، و لە پاداشی ئەو بەسەرهاتەدا کە پێنج ساڵ لە تاریکی بەندیخانەدا پێوەی تلایەوە ، سپاش ئاهەنکیکی گەورەی بۆ گێرا شەکراوی رزگار بونیو گەرانەوەی بۆپایەی پێشوی خۆی لەسپادا تیاخوارایەوە •

ئا بەم جۆرە کارەساتی دریفۆس کوتایی هات ، دوای ئەوەی نزیکەی دوانزە ساڵ بیرو هۆشی هەموو جهانی بەخویەوە خەریك کرد ، • ئیستاش بەگەورە ترین کارەساتی خراپەو پیسیو گرنگ ترین کاروباری یاساییو تیاچونی عەدالەت ئەژمیررێ لەچەرخی نوێدا ، بەلام لەهەمان کاتدا ئەتوانین بڵێین کەوا : دادو حەق لەئەنجامدا شوێنیخۆیان گرتەوە ، هەرچەندە بەینێکی زۆر دریفۆس وەك قوربانی لەرێی دادگەریدا سزای زۆری کێشا • سەد ئافەریمیش بۆ حەق پەرومرێکی وەك ئەمیل زۆلا کە ئەو هەموو کارەساتانەی بەسەر خۆی هێناو سزای دیی بەلام هەر کۆڵی نەدا تا لە توانایدابوو تا حەقی گەیاندەوە بە شوێنی خۆی •

## موحـاكەمەی یۆسۆبـۆف

## خوێن رێژی راسپۆتین

راسپوتین کێیـە ؟

ئەڵێن راسپوتین قەشەیەك بووە ، بەڵام بەراستی ئیستاش کەسیك لـە میژوونوسەکان نەیتوانیوە بگاتە بنجو بناوانی ، چونکە پێ‌گەیشتنو گەورە بوونی ئەم کابرایە نەزانراوەو بەپەردەیەکی ئەستوور داپۆشراوە ، بـەڵام ئەوەی کە لەم پیاوە ئەزانرێت ناوی (کریکوری افیموفیچ) بووە لە سیبەریا لەدێی (بوکروفسکو) چاوی کردۆتەوەو لەسەرەتای هەرزەکاریـدا لـە هەردەکان ئەسپی دزیوەو فرۆشتویەتیەوە ، کە ئەمـەش خویـەکی زۆر ناپەسند بوە لای دانیشتوانی سیبەریا ••• تا لەکاتی گەرانیـدا ناسیـاوی لەگەڵ قەشەی کلێسایەکا پەیدا کردوە ، لەو قەشەیـەوە توێکـلی بـیرو باوەرەکانی وەرگرتوە ، ئەوەندەشی پێ نەچوە ئەم توێلکەی کردوە بەدار دەسی خۆی بۆ ئیشی بێ ئابڕوانەی •

کەس ئەیزانی چۆن ئەم پیاوە لەو ژیانە دەروێشانەوە هاتە شـاری (موسکو)ی پایتەخت بەجێ گیریی ، لەپڕیکا لەم شارەدا سەری هەڵدا، تا لە سالی ١٩٠٧دا توانی بێ بە پیاوی بارەگای قەراڵی روس •

زۆری پێ نەچوو بوبە بنێشتە خۆشەی ژێـر دانی ئـەمو ئـەو ، هەندێك سەریان گەیاندە ئاسمان ، گەیاندیانە ریزەی خوا ، هەندێکیـش

بەکابرایەکی دڕودڕندەو ناکەس بەچەیـان دا ئەنـا ، هەرچەنـدە خـۆشی پیاوێکی پیسی‌ی ژاکاوی شل‌و شێواوی بۆرکەلەی بۆرەڵـوکە بوو ، دڵ بێزی لە هەڵکەوتنی ئەکردەوە ، لەگەڵ ئەوەشـا کە خـۆی بە پیـاوێکی بەئایین دا ئەنا وەك ماسی مەلەی لەعەرەقا بکردایە ئەنجا ئۆخەی نەئەکـرد، واش‌زانراوە ئەم کابرایە بە زمانێکی جادوانە توانیوێتی بەخەلکی‌بگونجێنێ کە خاوەنی هێزێکی وا کاری‌گەرە ئەتوانێت قورس‌ترین دەردو بەلا چـاك بکاتەوە تا رەگی گولیش بپەڕێنێ • یەکجار بەختی راسپوتین بەوە یاربوو کە (شازادەی) کوری قەرالی روس توشی دەردێکی ئەوتۆ بوو هەرچـی پزیشکی ئەوروپا هەیە دەستە پاچە وەستان لەبەریـا ، کورە وای لێهـات گەیشتە سەرە مەرگ ، ها ئێستا بمرێ ها ساتێکی تر ، لەناو جەرگی ئـەم پەستی‌و غەمگینیەدا کارەکەرێکی قەرالیچە دەنـگو بـاسی راسـپوتینی بەگوێ‌ی ئاغا ژینا دا کە چ قەشەیەکی شارەزاو بلیمەتەو هیچ نەخوشیەك لە چنگی دەرناچێت •

ناچاری سەرت بەمالی دوژمنتا پێ ئەکات ، دایکەی داماو دەس بەجێ ناردی بەدواياو بردیانە سەر شازادەی نەخـۆش ، کەس نەیـزانی کە راسـپوتین چی‌کرد ؟ بـەلام ئەوەنـدە زانـرا هـەر کە راسپوتـین ئەچێتـە ژوری نەخۆشەکەوە ، شازادە گورج ئاهێکی تێ ئەگەڕێ‌و ئەوەندەی پێ نـاچێ ئازارەکەی روو ئەکاتە کزی‌و لەمەترسی رزگاری ئەبێ ، تا بـەرە بەرە کوڕە چاك ئەبێتەوە ، ئەنجا راسپوتین پڕ بەدەم وا ئەگەیەنێ کە بەهێزی جادوانەی خۆی توانی شازادە لەچنگ مردن رزگار بکات •

دیارە بەمە چ قەرال‌و چ قەرالیچە لەچاکەی راسپوتین دەرچونیان نابێ، تا بەمال خەلاتی کەن کەمە ، تا بە کاربەدەسی گەورەی دابنێـن لەجیـگای بەرزا هیشتا کەمە •

بەم جۆرە راسپۆتین لە ماوەی شەوو روژێـکا لە خۆێریـەکی نـاو

کۆلاَنانەوە گەیشتە ریزی راویژکەرانی بارەگای شاهانە • ئـەم کابرایـە ئەگەر چاولەدووی پارە بوایـە زۆر ئاسـانبوو بەلاَم نـەء ، چاو لەدووی دەسەلاَتو دەس بەسەرا کێشان بوو ، باوەجو قەراڵو ژنەکەشی باشتریـن کوتەکی دەسیبوون •

چەند مانگێکی پێ نەچوو راسپوتین بووبە حوکمداری هەمو روسیا ، هەر وەکو لەو ساکەدا بوبوو بە باو (قەراڵ حوکمی روس ئەکا ، قەراڵیچـە حوکمی قەراڵ ، راسپوتینیش حوکمی هەردوو لا) کابرا وای لیهات ئەوی ئەو سەری نەبڕیایە نەدەمرد ، تا وای لیهات وردو درشتی روسیا لەکردەوەی ئەم کابرا جادوگەرە سامناکە سەرسام بوون ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هـەر وەك جاران بە عەرەق خۆریو قیافەت چەپەڵو پنتیەتی مایەوە •• دیـارە ئەم کردەوانەش هەر ئەبنە هۆی بلاَوبونەوەی رقی خەلکی لەناو کۆشکی شاهانەو لە دەرەوەیدا ، ئەوەی ئاگری ئەم رقەی زیـاتر خـۆش ئـەکرد ترسبوو ، جگە لەوەی دەنگی دابووەوە ئەم قەشە شەیتـانە (جاسوسێـکی ئەلَمانە) ئەیەوێ لە روسیا بدا ، قەراڵ بێنێتـە خوارەوەو خـۆی بچێتـە جێگای ، ئەمەش بەجارێ بیرو باوەری نیشتمان پەروەرێتیی خرۆشـان ، لەگەڵ ئەوەشا کەس دەسەلاتی ئەوەی نەبوو پەنجەیەکی بۆ بەرێ ، هەمـو زراویان لیی چوبوو ، بۆیان دەرکەوتبو ، نە ژەهر کاری تێ ئەکا نە گوللە ئەیسمێ ، بڕوا گەیشتە رادەیەك کە کابرا پەلەیەك هێزیی مغناتیسی جادواوی دەورەی داوە لەهەموو ئێشو ئازارێك ئەیپارێزێت •

لەناو هەمواندا تەنها یەك کەس توانی ئەو پەردە سامناکە بدرێنێو خۆی لەو بەندی مەترسیە رزگار بکاو ئەو هێزە جادوگەرە بخاتە ژێر پێ ، هـەر ئەو کەسە بڕیاری کوشتنی راسپوتینی داو کوشتیشی •، لەبـەر ئـەوەی راسپوتین کابرایەکی ئێسك قورسبوو لای هەمو میـللەتی روسو لەبـەر ئەوەی خۆین رێژەکەی لە خێزانێکی خانەدان بوو ، لە چنگ قەراڵ رزگاری

بوو قەراڵ هەر بەوە وازی لێ‌هێنا کە لە بارەگای شاهانە دەری‌کردو فەرمانی‌دا خوێن‌ڕێژ خۆی‌و ژنەکەی لە پارچە ملکێکی دوریانا لە روسیـا تـا دوای‌ی ژیانیان پێکەوە بژین‌و لەوێ نەجوڵێن ، بەم جۆرە مانەوە تا ئاگری شۆرشی روسیا هەلگیرسا ئەوسا ڕایان کرد ، زۆری ولاتەکانی ئەوروپایان تەی کرد ، تا لەیەکێ لە شارەکانا خۆیان گرتەوەو جێ گیربوون ، بێ‌بەش لە هەمـوو سامان‌و دەسەلات‌و ناوەکەی جارانیان ...

## کوشتنی راسپۆتین لەسەر پەردەی سینەما

دوای شۆرشی ئۆکتۆبەری سالی ١٩١٧ قەراڵ‌و قەراڵیچە سەرنگوم بوون ساڵ بەدوای سالا تێ‌پەڕی ، هەرچی ئاگاداری ئەم کارەساتە بوو یـا دەستی تیابوو هەموو چوونە ژێر گلەوە .

هاوکاری‌ی سینەمای (مترو گولدین مایر) لە ئەمریکا ویستی ئـەم کارەساتە بکات بە فلیمێك هەستی خەلکی پێ بجولێنێ ، خۆشی قانزاجی لە پارەو لە هونەرمەندیا دەست کەوێ ، بۆ ئەم کارە ویستی کە داستـانی فلیمەکە ئەگەر هەموشی بەتەواوی نیشان نەدا زۆرتر لە راستی‌ی نزیـکی بخاتەوە لەبەر ئەوەی ئەندامەکانی ئەم کارەساتە کەسیان نەمابوون تەنهـا (خوێن ڕیژ)و ژنەکەی نەبێ ئەیتوانی فلیمەکە بە ئاسانی دەربهێنێ ئـەگەر ئەو دوانە نەبونایە ، بەلام ئەم هێنای لەبریـتی ئـەوان دوکەسی خەیـالی دروست کرد یەکێکیان (جیکودیف) کە لە جێگای (یوسوبوف)ی مـیری خوین رێژی راستی‌ی دانا ئەوی‌تریشیان ئافرەتێکی‌تر کە گوایە دەسگیرانی میربووەو دوای کارەساتەکە شووی پێ‌کردوەو بۆئەوەی هەستی سینەمـا خواهان زیاتر بخرۆشێنێ ، دەست کاریـەکی تـری چـیرۆکەکەی کرد . داستانەکەی وا دانا کە گوایە راسپوتین بەهێزی جادوگەری‌ی خۆی جلەوی میرژنی راکێشاوەو دەستدرێژی کردۆتە سەر ئابرووی . فلیمـەکە دوای

ئەوەی ڕێك‌خرا برەوێکی گەرمی لەهەمو جیهاناو لای گشت کەسیك بـــوو تەنها لای دوان نەبێ (یوسوبوف)ی میرو (ایرینا الکسندروفنا)ی ژنی کە ئەوساکە دوو مهاجری روس بوون لەشاری لەندەن‌دا •

لەگەڵ دەرچوونی فلیمەکە دەستوبرد میرژن لە یەکێـــك لە دادگاکانی ئینگلترە شکاتی لە هاوکاری (مترو) کرد کە گوایە ئەم هاوکاریە بـــەوەی کە دەست دریژی راسپوتینی بۆ دەسگیرانەکەی (جیکۆدیف)ی لە فلیمـــا پیشان‌داوە ، تەپلی بەناوی بۆ ئەم لێداوەو بۆبە هۆی سوکی‌و ئابڕوو چوونی لە ناو هاوڕێکانیدا چونکە لەراستیدا ئەو ئافرەتەی دەسگیرانی (چیکودیف)ە هەر ئەمەو کەسێکی کە نیە •

بەلاّم هاوکاری‌ی (مترو) خۆی نەکرد بەخاوەنی ئەم گوناهە ، وتی ئەم دوو کەسەی لەسەر پەردە نیشانمان دابوون لە راستیدا نین بەڵکو بەخەیاڵ دروستمان کردوون‌و لەهیچ رووبەکەوە لەمیرو ژنەکەی ناکەن ، جگە لەوەش ئێمە ئەو ئافرەتەمان لە فلیمەکەدا بەدەسگیرانی (جیکودیـــف) نیشـــان‌داوە کەچی (ایرینا الکسندروفنا) لەکاتی کوشتنی راسبوتینا ژنی مـــیربوە نەك دەزگیرانی • بەلاّم (سیر باتریك هستنجز)ی پشتیوانی میر (نوسەری ئـــەم باسە ) تاقە نوقتەیەك کە کردبووی بەکوتەکی دەسی خۆی بۆ سەرکەوتنی لە محکمەدا ئەوەبوو کە لەبەرئەوەی (یوسوبوف) خۆینریـــژی راسپوتینـــەو لەبەرئەوەی هاوکاری مترۆ ئەڵێت ئەم داستانە لەراستیـــەوە وەرگـــیراوە کەوابوو بە (جیکودیف)ی سەر پەردەکە مەبـــەس لە (یوسوبـــوف)ەو بـــە دەسگیرانەکەشی مەبەس لە (ایرینا)ی ژنیەتی ، جا ئەگەر هاتو هاوکاری مترۆ دانی بەوەدا نا کەوا (یۆسۆبۆف) خۆینریژی راسپۆتینە ئەوساکە محکمـــە ئەزانێ چۆن فەرمانی خۆی ئەدا ، جا لەبەر ئەوەی پشتیوانەکەی میر ئەوەی لە هاوکاریەکە چاوەروان ئەئەکرد کە ئەبێ بە محکمـــەی بســـەلمێنێ کـــە خۆینرێژ (یوسوبوف)ە ، هیچی بۆنەمایەوە کە (یوسوبوف) خۆی بکا بـــە

شایەت‌و لەم کارەساتەدا چی‌کردوە بیگێڕێتەوەو بەئاشکرا لــە محکمــەدا دانی‌پیانێ کە ئەو راسپوتینی کوشتوە • بەم جۆرە (هستنجز) ئەم پیــلانەی رێك‌خست ، جا لەپیش ئەوەدا محاکەمە درێژە بسینێ وای یەباش‌زانی‌و بۆ ئەوەی بەزەیبی گویگرەکان بجولێنێ محکمە جارێ گوێ لەشایەتی میرژن بگرێت •

میرژن بەسەنگینیەکەوە لەسەر خۆ هاتە پێشەوە کە ناویان لێ‌پرســی وتی :

خاوەن‌شکۆ ( ایرینا الکسندروفنا یوسوبوف) یەکیك لە میرکچەکانی ئیمبراتوریەتی روسیاو خوشــکەزای قــەراڵی پێشــوو ژنــی (فلیــکس یوسوبوف)ی میر کەلە ســاڵی ١٩١٤دا شووم‌پێ‌کرد لەپاشا بەدەنگێکی رەوانی لەسەرخۆ دەستی‌کرد بەگێرانەوەی کارەساتەکە • نەپرسیــارەکانی پارێزەرەکــانی متــرۆ شڵەژانــدی‌و نەبووبــە داوی پیلانــەکانیانــەوەو نەبەربەرەکانیەکانیان ساردی کردەوە ، تاکوو لەو شوینەشا خۆی‌گــرت‌و رقی‌هەڵنەسا کەویستیان بەو جورە بیخەنە پیش‌چاو کەبۆ پارە وائەکات نەك بۆ ناوو ئابروو •

ئنجا سەرگوزشتەی گێرایەوە کە ئەو ژنی (یوسوبوف)ی خوێنرێژی راسپوتینە ــ راسپوتین هیچ حەددیکی نەبوە ئەوەندەی نوکی دەرزیــەك ئابڕووی ئەم بەرێ ، مەبەس لەداستانی فلیمەکــەش هەر ئــەم ئەگرێتــەوە بەلکو بەوە سووك‌بوە لەناوخەلکا چ جای ئەوەش کە هاوکارێ مترۆ خۆی ئەڵێت فلیمەکە لەراستیەوە وەرگیراوە •

هەرچەند میرژن بەمە بەزەیبی خەلك‌و ئەندامەکانی محکمەی بە خویــا هێنایەوە بەلاّم تەنها ئەوە بەس‌نەبوو بۆ بڕوای محکمە جگە لەوەی تەنهــا بەقسەی ئەویش ساغ نابێتەوە کە (یوسوبوف) خوێنرێژی راسپوتینە •

لیرەدا (باتریك هستنجز) هەڵی دایەو لەپشتیوانەکانی متروی پرسی :
ئایە ئیوە دودڵن لەوەی (یوسوبوف) راسپوتینی کوشتوە ؟ ئەمەش گەورەترین کوتەلێ بوو کە (هستنجز) لەوە پیش ئامادەی کردبو بۆ وەشاندن.

بەم پرسیارە گوێگران هەناسەیان لە خۆیان بڕی ، پاریزەرەکانی مترو بوون بەداوەوە ، ناچار یەکێکیان هەڵسا وتی :ـ

بەڵێ لە یەك شتی زۆر گەورە دوو دڵین .

وایان زانی بەم وەڵامە (هستنجز) تێکەوت چونکە بە چ جۆریك ساغی ئەکاتەوە (یوسوبوف) خوێنرێژی راسپوتینە ؟

(هستنجز) بانگی کردە (یوسوبوف) خۆی بۆ شایەتی بێ ئەوەی بە پێویستی بزانێ کە لەم رۆەوە سازکاریی محکمە بخوازیت .

(یوسوبوف) نەیکردە نامەردی بۆی سەرکەوتە سەرێ بەسەرێکی بەرزەوە بەبێ شلەژان دەستی پێکرد :

**ماڵ .. جوانیی .. بەرزیی .**

دەستیکرد بە خویندنەوەی سەجەرەی خۆی کە گوایە : دوا کورەزای شای تاتارەکانو جێگیری‌بەرزیانە ، کاتێ رۆسەکە هاتە خوارەوە بۆ ناو ولاتەکەیانو داگیریان کرد (ایفانی سامناك) بەزەییی بەکوڕی ئیمبراتورا هاتەوە کە باوکی لە پیناوی میللەتو نیشتمانەکەیا سەری نابوەوە . بەزەییی پیاهاتەوەو کردی بەکوڕی خۆیو بەخێوی کرد ، رەنگە لەبەر ئەوەش بوبێت کە هۆزی تاتارەکانی لێ‌رازی بێت ، کە (ایفانی سامناك)یش مرد زەویو زارێکی بێ شوماری خەڵات کرد .

ئەم (یوسوبوف)ە گەنجێکی بەهێزی جوان ، رەوشت بەرز ، دڵ راکیشەری لەسەر خۆ ، خاوەنی دەوڵەتیکی لەژمارە نەهاتوو بوو ، لەساڵی

١٩١٤دا (ایرینا الکسندروفنا)ی میرکچ خوشکەزای قەراڵی روسی مارەکرد کە جوانترین گوڵی بارەگای شاهانە بوو ، دوای ئەوە لە کۆشکی (مویکا)دا ژیانێکی وەهایان ئەبردە سەر هەموو کەس چاولەدویان بوو •

## پێویست بوو لەسەرم کە بیکوژم

دوای ئەوەی میری شایەت هاتە سەر باسی خۆیو راسپوتین ، میر پێشەنگی ئەو کەسانە بوو کە مەترسیان لە دەسەلاتو دەستدرێژی ئەو گەڕۆکەی بێئابڕوە پەیدا کردبوو ، زۆر رقی لەوەی بوو کەوا بەوجۆرە دەسەڵاتی بەسەر قەراڵو ئەو ئیمبراتوریەتە گەورەیەدا هەیە ، ئەمەی زۆر بەڕسواییی دائەنا ، لەبەر ئەوەی کە پیاوێکی عەرەق خۆری سەرچڵی داوێن پیس بوو • کاتێ ئەو دەنگوباسە بەهێزبوو کە ئەڵێ راسپوتین جاسووسی ئەڵەمانەکانەو هەوڵی روخاندنی تەختی قەیسەر ئەدا ، یۆسۆبۆف خۆی پێنەگیرا دەماری نیشتمان پەروەریەتی جوولا ، زۆریشیی پێناخۆش بوو ئەم خەڵکە لە ترسی ئەو جادوبازە لۆتیە وا زارەترەك بوبوون ، لەبەر ئەوە پەیمانی لەگەڵ خۆیدا کرد کە نیشتمان لەدەس پیاو خراپیو پاشلپیسیی ئەو بێ ئابروە رزگار بکات ، ئینجا دەنگی میر لەو ناوەدا بەرزبوەوە بۆ ئەوەی تێك بچێت : راسپوتینم کوشت چونکە پێویست بوو لەسەرم کە بیکوژم •

لەدواییدا دەستیکرد بەگێرانەوەی چۆنیەتی کوشتنەکە :

ئەمزانی کە کوشتنی راسپوتین گاڵتەی منداڵان نیە چونکە وا بڵاوبوبوەوە کە نەگوللەو نە ژەهر کاری لێ ناکەن •

بەڵام کۆڵم نەداو بۆ ئەم مەبەسە لەگەڵ چەند گەنجانیکی بەرز لەبارەگادا گەلێك تێکۆشام • زۆر بە نەهێنیو وردی دەستمان بە پیلان

دانان کرد ، تا بڕیارماندا کە راسپوتین بە میوانداری بانگ کەینە کۆشـــکی (مویـــکا) •

ترسیشمان لە نەهاتنی نەبوو ، چونکە هەر ئەوەندە بینرانیایە عەرەقی خۆڕاییی‌و خواردنی خۆش هەیە لە حەوت جێ‌ملی خۆی بۆ ئەشکاند •

یەکەم هەنگاوی پیلانەکەمان دەرمانخوارد کردن بوو ، جگە لەوەی چەند دەمانچەیەکی پڕ فیشەکمان ئامادە کردبوو ، لەوە ئەترساین ژەهر کاری لێ نەکات •

## ژەهر کاری لێ نـــاکات

ئەو شەوەی راسپوتین گەیشتە کۆشکی (مویکا) زۆر بەرێزەوە بـــە پیریەوە چوین ، هەر ئاوازی موزیقە بوو لەملاو لای کۆشکەکەوە هەڵئەسا بە جۆرێك راسپوتین بۆی دەرکەوت کە چ ئاهەنگێکی بەرزی بۆ گێڕراوە ، کە جارو بار دەنگی موزیقە هەڵئەسا بەسەر هەمو دەنـــگەکانی تری نـــاو کۆشکەکەدا بەرز ئەبوەوە • بۆ ئەوەی راسپوتین وابزانێ قەدری زۆرتـــر گیراوە ، خۆم کە خاوەن ماڵبووم بردمە ژوورێك لە دەستـــەی خوارەوە ، سفرەیەکی تایبەتی لە خوشترین خواردەمەنی تیابوو کەوای ئەگەیاند ئەم جۆرە خواردەمەنیانە لەسەر سفرە گەورەکە دانانرێت •

راسپوتین وورگی زلی نایە سەر خواردن خۆشـــم خـــۆش خـــۆش خواردن‌و خواردنەوەی ژەهراویم بۆ ئەبردە پێشەوە ، ئەویـــش وەکـــوو برسیەکانی سالی گرانی تێنیشتبوو ، ئنجا ئەو هەموو ژەهرەی کە دە زەلامی یخ‌ئـــەدا ئێستاش کار ی‌لێ‌نەکرد ، لەمە زۆر سەرم سوورمـــاو ســـامناکی دایگرتم هەلسام چوومە دەرەوە دەمانچەیەکی لەسەرپێـــم لە یەکێـــك لـــە هاورێکانم سەندو هاتمەوە ژورەوە کەچی کەوا ئەبینم راسپوتـــین هێشتـــا هەوەلیەتی وەکو ژهرەکە لەئاو سکیا بوبێ بەدۆشاو ، کەئەمەم لێ دی دامە

بەر دەمانچە ، ئەوسا لە جێی خۆی هەڵسا وەکو گای بەلەسە ئەیبۆڕانـدو هێرشی ئەهێنایە سەرمو بەدەوری خویا ئەخولایەوە ، گوللەش وەکو باران هەر بەسەریا ئەباری ، دوای ئەوەی هێزی تیا نەماو دەمارەکانی شل بوو کەوت ، بەلاّم لەبەر ئەوەی کە هەر بڕوام بەخۆم نەئەکرد ئنجا بەلیسێکەوە تێی بەربووم لەو کاتەدا هاورێکانیشم فریام کەوتن تا سەری راسپوتینمـان هاڕی ، کەزانیمان وا بەراستی دوژمنە سامناکەکەمان کوشتوە لاشەکەیمان هەلگرتو فڕێمان دایە ئەو روبـارەوە کە دەمودەس ئەیبەسـتو ئەبـوو بەسەهۆڵ .

ئەم داستانەی (یوسوبوف)ی میر لەسـەر خۆ بەدەنگێـگی رەوانو ئاشکرا لە محکمەدا ئەیگێرایەوە ، بەزەیی دانیشتوانی جولاّند . بـەلاّم پاریزەرەکانی مترو وا بەئاسانی خۆیان نەئەدا بەدەستەوە بەڵکو بەپێویستیان زانی ئەم داستانە بە راست نەزانن‌و لێی دوو دڵ بن . دوو دڵ بن لـەوەی یوسوبوف کوشتەری راسپوتینە ، لەوەش زیاتر بڵێن خۆی نەیکوشتـوە بەڵکو یەکێك لە هاورێکانی کوشتویەتی کە زۆر شێوەی ئەچێتەوە سـەر (جیکودیف)ی ناو فلیمەکە .

جگە لەوەش ئەو پاریزەرانە شتێکی تریان بەکار هێنا ، ئەیانزانی کـە دەنگی گشتی لە ئینگلترە رقی لە گوناهباریو زۆرداریە با دەرحەقـی یەکێکی وەکو راسپوتینیش بێتو ئەیانزانی کە ئەندامەکانی محکمە ئـەوە بە نارەوایی ئەزانن کە گوللەو ژەهر تێکرا بەجارێـك بۆ کوشتنی بـەکار بهینرێت چ جای لیس ، لەبەر ئەمە زۆر جار ئەم پرسیارەیان لەمیر دوبـارە ئەکردەوە تا ناچار بێت زیاتر باسی ئەو دیمەنە بکات ــ دیمەنی کوشتنەکە .

ئەم پرسیارەیان لێ ئەکرد :ــ کەواتە تۆ ئەتەوێ دلّنیامان بـکەیت کەتۆ راسپوتینت کوشت ؟

هەر بە لەسەرخۆیی‌و سەنگینیەکەی جارانەوە وەڵامی ئەدایەوە :
بەڵێ من کوشتم ، کوشتنیم بە پێویستیەکی نیشتمانی ئەزانی •

ــ ئایە بەراستتە ئەتەوێ تێمان بگەیەنی کە خواردنی ژەهراویت بۆ ئەبردە پێشەوەو بەدەسی خوت ؟

ــ بەڵێ خواردنی ژەهراویم ئەدایە بەڵام هەرچەندێکی خوارد کاری لێ نەکرد لەبەر ئەوە دامە بەر گوللە •

ــ بەڵام هەندێك سەرچاوەی مێژوو ئەڵێت تۆ راسپوتینت نەکوشتوە بەڵکو هاوری‌یەکی تۆ کوشتویەتی ؟

•• نەخێر من بووم ، کاتێك کەدیم نایەوی بمرێ چومە دەرێ دەمانچەیەکم لە هاوری‌یەکم سەند گەرامەوە راسپوتینم دایە بەر گوللە بەڵام لەگەڵ ئەوەشا نەجولا تا لەپریکا وەکو گای بەلەسەی لێ‌هات ، ئنجا دامە بەر تێلا ، تا دوایيم بەژیانی هێنا ، لەدواییدا لاشەکەیمان هەڵگرت‌و فرێماندایە رووبارەکەوە •

هەرچەند ئەم داستانە بەزەیی گوێگرەکانی جولاند بەڵام یەکێك نەبوو کە بڵێ وشەیەکی درۆ کردوە ، دوای ئەوە یوسۆبوۆف وتی : لەوەپێش کەسم نەکوشتوە بەڵام پیویست بوو لەسەرم راسپوتین بکوژم‌و کوشتیشم •

کەسیەتی‌ی راستی‌و کەسیەتی‌ی ناو سینەما :

پارێزەری مترو دیسانەوە گەرانەوە سەرباسی جیاوازی لەبەینی (جیکودیف)ی ناو فلیمەکەکە راسپوتینی کوشت‌و یوسوبوفی راستی کە راسپوتینی کوشتوە • جگە لەوە وایان لەمیرو ژنەکەی کرد کەبڵێن ئەو دوکەسەی تەمسیلی ئەمانیان کردوە لەفلیمەکەدا نەلە رەفتاردا نەلە لەشولاردا

لەمان ناکەن وایان ئەزانی بەمە باسەکە ئەبەنەوە نەیانزانی بەمە قسەی پشتیوانی میرو میرژن ئەچێتە سەر ، جارێ نەیانتوانی پێلێنانەکەی یوسوبوف بگۆرن یابەدرۆی بخەنەوە،ساغیش کراوەتەوە کە چیکودیفو دەسگیرانەکەی تەمسیلی یوسوبوفو ژنەکەی ئەکەن بالەوانیش نەچن •

هەروەها فلیمەکە هەر کەسێکی سەر پەردەکەی سووك کردبێ بێ گومان راستیەکەشی پێ سووك کردوە •

ئەندامەکانی مەحکمە بەتایبەتی سەیری فلیمەکەیان کرد ئەبوایە ئیتر پارێزەری مترو لێرەدا وازیان بهێنایە کەچی هەڵیاندایەوە وتیان گوایە جیکودیفی ناو فلیمەکە لە یوسوبوف ناچێت بێئەوەی بەخۆیان بزانن کە بەوە جارێکی تر یارمەتی پشتیوانی میرژنیاندا چەند شایەتیکیان هێنا کە لەکاتی بەرزیی یوسوبوفو ژنەکەیا دیویانن وەشارەزای بارەگای قەراڵی روس بوون •

ئەو شایەتانە هەموو وتیان چونیەتی خوێنرێژی ناو فلیمەکەو دەسگیرانەکەی لە یوسوبوفی میرو ژنەکەی ناکەن • هستنجز لیرەدا نەیویست هیچ رەخنە لەم شایەتانە بگرێت بەلکو یەکە یەکە پرسیاری لێکردن • ئایە خەڵك لەهەموو جێگایەك یوسوبوف بەکوشتەری راسپوتین دانانیت ؟ •

•• بەڵێ وایە •

ـ کەواتە هەرکەسێك ئەو فلیمەی هاوکاریی مترووی دیکە ئەڵێت لەراستیەوە وەرگیراوەو بەراستی کوشتنی راسپوتین نیشان ئەدا یوسوبوفی میر بەخوێنرێژ دائەنێو ئافرەتەکەش بە ایرینای ژنی کە خاوەنی ئەم داد خوازیەیە • کەوابوو ئەمە راسترین لیکدانەوەیە کە ئەبێ بروای پێ بکرێت •

## بەر لەفەرمـان دان

ئەندامە سویندخۆرەکان ویستیان بۆ جاری دووەم فلیمەکە ببیننەوە ، ئنجا کە محکمە پێکهاتەوە کارەساتی دادخوازیەکەی لە شێوەیەکی قانونیا بۆ گیرانەوە لەپاشاندا سوێند خۆران چوونە ژۆریکی کـەوە بـۆ بڕیـار دەرکردن • لەم کاتەدا دانیشتوانی محکمە بەپەرۆشەوە کەوتنە چاوەروانو جولەجوڵ ، چرپەچرپ لە هەمو لایەکەوە پەیدابوەوە لیرەدا باتریك هستنجز ئەلێت : (ئەوەتەی پارێزەرم وەك ئەوجارە کە کۆمەلی سویندخۆران خەریکی بریار دەرکردن بون بەپەرۆش نەبوم بۆ زانینی فەرمانەکەیان هەرچەندە ئەو فەرمانەش پەیوندەییەکی ئەوتۆشی بەمنەوە نەبوو ، بەلام بۆ میرژن لەبەر ئەوەی کە بەئاشکرا سەختترین ماوەی ژیانی خۆی دەرخست دۆڕاندنی ئەم داوایــە بۆ ئەو لــەو رۆژەدا لــەژوور توانــاو هەلگرتنــەوە بــوو • لەنــاو ئەو هەموو چرپــە چرپو جولــەجولــەدا خــۆم پێ نەگــیرا کــە لەخۆم بپرسم ئایە ئێستاکە کەوا میرژن بەم بێدەنگیە دانیشتوە بیر لەچیی بکاتەوە ؟ ) •

سوێندخۆرەکان هاتنەوە هەیوانی محکمە ، حــاکم لەدوایــانەوە • بێدەنگیەکی سامناك ئەو ناوەی داگیر کردبوو هەمو دانیشتوان چاویــان بڕیبوە ئەندامەکانی محکمە ، میرو ژنەکەشی وەکو بت وەستابون •

حاکم لەپاشا لەسۆیندخۆرانی پرسی کەچیــان بەچی کرد ؟ هەمــوو وەلامیان دایەوە کە حەق بەلای میرو ژنەکەیەوەیە • محکمەش لەسەر ئەوە فەرمانیدا کە هاوبەشیی مترو ئەبێ بیستوپێنج هەزار لیرە بدا بە میرژن لــە تۆلەی بەناو بوونەکەیدا •

بۆ یەکەم جار میرژن بووژایەوەو کەوتە سوپاس کردنی هستنجز ئنجـا لەگەڵ مێردەکەیا هەر بە سەنگینیو لەسەرخۆییەکەی جارانەوە لە محکمە

چونە دەرەوە لەپاش ئەوەی ئابرووی خۆیان‌کریەوەو سامـانیکی مۆڵیـان دەست‌کەوت •

سەرنجێك لەم کارەساتە :

ئەم کارەساتە بەراستی شتێکی سەیرەو روداوی وای تێدایە کە لـە لەوەپێش نەمان دیوون وەك :

یەکەم : کوشتنی راسپوتین لە لایەن ئەندامێکەوە لەخێزانی قەیسەر ، کە ئەویش یوسوبوف بوو ، هەمو روژ بەگوێی خۆی هەزارو یەك پەندی لەخەڵك ئەبیستەوە ، کەوا ژن لە بارەگای قەراڵدا نەما راسپوتـین لاقـەی نەکردبێت تا ژنەکەی خۆشی (ایرینا) ، ئەمەو زۆرشتی تر لەوبابەتە کە هەموو پربون لەمەترسی لەئەنجامی دەست‌رویشتنی راسپوتـین‌دا بەو جـۆرە ، هێجگار کە ئەیان ووت جاسوسی ئەلەمانە •

دوەم : کەس وەك راسپوتین بە دڵ رەقـی نەکوژراوە ••• دەرمـان خواردکردن دەست‌رێژ بە دەمانچە ••• کوتەك کە ئەمانە بە گوێرەی یاسـا هەمو (ظروفی مشددە)ن دژی گوناهبار •

سێیەم : لەدادگادا گوناهی کوشتن لەگوناهبار دوورئەخرێتـەوە بەڵام ئەوکەسە خۆی بەهەموو جۆرێك ساغی بکاتەوە کە پیاوکوژە ، ئەویـش بۆ پارە • ئەمەشتیکی سەیرە !

# محاكەمەی شێخ مەحموود

کورتەیەك لە ژیانی شێخ :

شێخ مەحمود کوری شێخ سعید کوری شێخ محمد کوری حاجی کاك ئەحمەدی شێخ کوری حاجی شێخ مارفی نۆدێ کوری سەید مستەفا کوری سەید ئەحمەد کوری سەید محەمەدی کبریتە سور کە پشتاو پشت ئەچێتەوە سەر سەید عیسای بەرزنجی کوری سەید بابا علی همدانی •

شێخ مەحمود لە سالی ١٢٩٨ك (١٨٨١) لە سلێمانی هاتۆتە دنیـاوە • لەخانەوادەیەکی زانستیو ئایینی ناودارا چاوی کردۆتەوەو خوێندویەتی ، لە حوجرەو لای مەلا فارسیو عەرەبیو خوێندنی تری تەواو کردوە ، هـەر بە مندالی لەگەل شێخ سعیدی باوکیدا لەسەر بانگ کردنی سولتان عەبدول حەمید چوە بۆ ئاستانە ، بەینێك لەوێ بەمیـوانی لە کۆشـکی سولتانـدا ماوەتەوە ، ژیانی ئەوێی بە چاوی خۆی دیوە ، کە گەراوەتەوە ، توانـاو بلیمـەتیی وردە وردە دەرکەوتوەو سـەری هەلداوە بە هـۆی ئازاییو خۆگرتنیەوە ناوی بلاوبۆتەوە ، تاکو لە رووی رامیاریشـەوە ، بە هـۆی شوێنی بەرزی ئایینی بنەمالەکەیانەوەو تواناو دانایی خۆیەوە دەسەلاتێـکی ئەوتۆی لەناوچەی کوردوستاندا پەیدا کردوە بێوێنە بووە ، (١) تا ئنگلیز هاتنە سلیمانیو داگیریان کرد کە سەیریـان کرد ئەو رۆژە لەو بەدەسەلاتتر نیيە لە ناوچەکەدا ناچار روویان تێکرد •

---

(١) کتێبی (الشیخ معروف النودهی) شێخ محەمەدی خال .

له رۆژی ١/١١/٩١٨دا شێخ مەحموود لە لایەن ئنگلیزەوە بە (حکمدار)ی کوردوستانی عیراق دانرا ، بەلاّم ئەوەندەی نەخایانـد ، ناکـۆکی کەوتـە بەینیانەوە ، بەتایبەتی کە میجەر سـۆن کرا بە راوێـژکەری ، بەجۆرێـك شەر هەڵگیرساو لە دەربەندی بازیان بەبرینداری لـە رۆژی ٩/٦/٩١٩دا شێخ بەدیل گیراو درا بە دادگایەکی عورفی سوپایی ئنگلیزی ، کە فرمانی خنکاندنی لە رۆژی ٢٥/٧/٩١٩ بەسەردا دا ، بەلاّم لە جیـاتی ئەوە بـە یەخسیری ئێررا بۆ هندستان‌و فرمانەکە نەهێنرایە دی‌•••دوای پەرەسەندنی جولاّنەوەی نیشتمانی لە کوردوستان‌داو داواکردنەوەی شـێخ ، ئنگلـیز ناچارما ، جارێکی تر شێخ مەحمودی هەر بە (حکمدار)ی هێنایەوە سلیمانی، بەلاّم ئەمجاریش فروفێڵی ئنگلیزو دەست‌برین‌و ئەمرۆسبـەینێ‌کەیانی پـێ قووت نەدرا ، لەگەڵیان تێك‌چووەوە ، ئەم جارە شێخ مەحمـودی مەلیـك کەوتەوە جەنگ لەدژیان ، هێزی کوردو نیشتمان پەروەران بەدوایـەوە ، بەلاّم لەتاو بومباباران کە سلێمانی وێران نەکات ، شێخی گەورە شارەکەی بەجێهێشت ، هەرچەندە بومباردومان لەرۆژی چواری مارتی سالی ١٩٢٣دا هەر دەستی پێ‌کرد ، ئەویش رووی کردە (جاسەنە) لەوێوە بۆ (پینجوین) ئنجا (پیران) لە ئێران ، لەوێ مایەوەو هاتوچۆیەکی زۆر پەیدابوو لەبەیندا، بەتایبەتی دوای دامەزراندنی حکومەتی عیراق ، لەو ماوەیەشـدا چەنـد شەرو هەرایەك قەوما ، وەك شەری بەردەرکی سەرا لە سلێمانی (٦ ایلـول ١٩٣٠)و شەری ئاوباریك (شباط ١٩٣١) ، شێخ ناچـار هاتـەوە خـۆی‌دا بەدەستەوە ، حکومەتی عیراق لە ١٣/٥/٩٣١دا ناردیە (سماوە) دوای ئەوە (ناصریە) ، لەپاشدا لەسالی ١٩٣٣دا ، هێنرایە بەغداو لەوێ زۆر بەرێزەوە دانیشت ، تا لە شۆرشەکەی رەشید عالی گەیلانی‌دا لـە مـایسی ١٩٤١دا ، ئەمیش بەهەلی زانی ، بەغدای بە جێهێشت ، چوە دێیەکەی خۆی لەناحیەی بازیان ، دێی (داریکەلی) ، لەوێ دانیشت‌و ژیانی رابوارد تا لەئـەنجامی

نەخۆشیدا لە بەغدا لە نەخۆشخانەی (حیدری) ، دوای ژیانێکی پاکی پڕر لە خەباتو تێکوشان لەرێی نەتەوەکەیداو جەنگاندن دژی عوسمـــانیو ئنگلیزی داگیرکەر ، دوای ئەوەی دوجار فرمانی خنکاندنی دەرچوو ، جارێك لەلایەن عوسمانیەکانەوەو جارێك لەلایەن ئنگلیزەوە ، لەرۆژی ٩/١٠/٩٥٦ فرمانی یەزدانی بەجێ هێنا • تەرمی پیرۆزی بە پێشوازیەکی ئەوەندە گەرمو بەسۆزەوە کەبرایەوە سلێمانی ، گیرایە باوەشو خرایە سەرشان ، ئەوەندەی نەمابوو هەرایەکی گەورەی تێدا بقەومی ، لەمزگەوتی گەورە لای حاجی کاك ئەحمەدی باپیرە گەورەیەوە شاردرایەوە • ئەمەبوو ژیانی شێخی مـــەزن بەکورتی ، ئنجا لێرەدا بەپیویستــی ئەزانــین بــاری ئەوســای ناوچـــەی کوردوستانیش بخەینە پێش چاو ، بۆ ئەوەی کە هاتینەسەر محاکەمەکـــەی شێخ ، ئەوەندەی توانیبیتمان شتمان روون کردبێتەوە [١] •

ناوچەی کوردوستانی خواروو ، ئنجا عیراق خۆیو ولآتانی عەرەبو گشت ئەو ولآتانەی لەژێر چنگی دەولەتی بێ هەناوی عوسمـــانیدا بوون ، هەمو بەهۆی کردەوە بەدەکانی کاربەدەستانی عوسمانیو سیاسەتی نالەباری (پیاوە نەخۆشەکەوە) ئەیان نالآندو گیریان خواردبوو ، بەتایبەتی کە شەری یەکەمی گیتیشی بەسەردا هات ، ئیتر قورەکە ئەوەندەی تر خەست بوەوە ، ئەگەر بۆ نموونە بلێین لە سلیمانیو زۆر شوێنی تردا پیاو پیاوی ئەخوارد ، هیچ بەدرۆ ناکەوینەوە ئەوەبوو هێشتا شەریش کۆتایی نەهـــاتبوو ، کـــە دەولەتە گەورەکان چاویان بڕیە ولآتـــە ژێر دەستـــەکانی عوسمـــانی کە لەئەنجامی شەردا هەمویانی لێتەکینەوە ، خۆشی بە لەقـــە لەق هەنـــگاوی لاوازی بەرەو گۆڕ ئەنا ، تا خوا مستەفا کەمال (اتاتورك)ی بۆ رەخساند ، گیانی کردەوە بەبەراو زیندوی کردەوە ، ئەوەبوو ئنگلیزەکان عیراقیـــان داگیر کرد ، لە بەسرەوە پیا هاتن تا بەغداو موسلو سلێمانی ، هەر چاوێکیان

---

(١) شۆرشـەکانی کورد ـ عەلائەدین سـەجادی .

کرد بە هەزار چاو بەرامبەر بە شوێنی ستراتیجی عیراق‌و بەروبومی زۆری‌و بەنرخی ، بەتایبەتی نەوتەکەی (ولایەتی موسل) کە لیکی بەدەمیانا ئەهێنایە خوارەوە [1] .

سلێمانیش دوای چۆڵکردنی لەلایەن عوسمانیەکانەوە ، شێخ مەحمود وەك وتمان کە ئەوکاتە لەهەموو رووبەکەوە یەکەم پیاوی شارەکە بوو ، کاروباری گرتە دەست ، پرر پڕوا بەو پروپاگاندانەی دەوڵەتە گەورەکان‌و چواردە (مبدأ)ەکەی سەرۆك (ویلسن)ی ئەمەریکا بەرامبەر بەیارمەتی نەتەوە بێدەسەڵاتەکان بڵاویان‌کردبووەوە بە دڵێکی پاك‌و خواستێکی بێگەردەوە بەرامبەر بە ئنگلیزەکان نەوەستا ، کە بەبێ شەر هاتنە سلێمانیەوە ، کە ئەوانیش شێخیان لەژێر چاودێری خۆیاندا بە حوکمداری ناوچەی سلێمانی‌و دەوروپشتی دانا ، بەڵام ئاواتەکانی شێخ مەحمودی نەمر بەو پاکی‌و راستی‌و نەشارەزاییەی لەنەهێنی سیاسەتی ناو دەوڵەتان لەکوێ‌و درۆو دەلەسەو فرو فێڵی ئنگلیز لەکوێ ، بۆیە وەك لەمەو پێش باسمان کرد ، ئەوەندەی نەبرد لەگەڵیان تێك‌چوو ، هێجگار دوای ئەوەی کە میجەر (سون)یان هێنایە سلێمانی بەنوینەری خۆیان لە دام‌و دەزگای شێخ مەحمودا ، لەراستیشدا هێنانی میجەر (سون) [2] بۆ ئەوەبوو ، کە زووبەزوو کاروباری ولات یەکسەر بگرێتە ژێر دەستی خۆی ، بۆ هێنانە دی‌ی ئەم مەبەسە سۆن دەستی‌کرد بەکێشانەوەی دەسەڵاتی شێخ مەحمود کە دانیشتوانی ئەم ناوچەیەو دەوروپشتی نەك هەر بەچاوی (حوکمدار) سەیریان ئەکرد ، بەڵکو بە

---

(١) یادداشت ــ رەفیق حلمی .

(٢) ئەفسەرێکی پێشووی ئینگلیزو شارەزا لەووڵاتی ئێران‌و کوردستان بەینێکی زۆریش بە ناوی (میرزا غولام حوسەینی) شیرازی‌یەوە لەهەلەبجەو سلیمانی بە ناوی بازرگانیەوە مایەوە .

مەلیك‌و پێشەوایەكی ئاینیشیان دائەنا ، بەوەدا كە پیاوێكی لەخواترس‌و داوێن‌پاك‌و دلسوزو مەرد جگە لەوەی كورەزای حاجی كاك ئەحمەدی شێخە كە كورد بروایەكی ئاینی بەهێزیان پێ‌یەتی ، بەڵام كڕین‌و فروشتن‌و درۆو دەلەسەو فڕوفێل لە سیاسەتداو هەڕەشەو چاو سوورکردنەوە لە مستەفا كەمال بۆ تۆقاندنی بە دامەزراندنی قەوارەیەك [1] بۆ كوردو وروژاندنی كوردەكانی توركیاو گەلێك شتی‌ترو ملدانی (ئەتاتورك) بە وازهێنان لە ولایەتی موسلی پرر لەنەوت...ئنجا دامەزراندنی حكومەتی عیراق‌و شورشی ساڵی ١٩٢٠و پەیمانی بەینی عیراق‌و ئنگلیزو دانانی فەیسەڵی یەكەم لەسەر تەختی شاهانەی عیراق‌و لەدواییدا رێك‌كەوتن لەسەر پەیمانەكە ، بەو جۆرەی كە ئنگلیز ئەیویست لەگەڵ عیراقداو لەدواییدا ناچاركردنی بەگۆرینی لەئەنجامی نارەزایی‌و تۆپزی میللەتدا ... ئەمانە هەموو بووبوون بەهۆی دانەمەزراوی باری سلێمانی‌و وەك تەرمۆمەتر سیاسەتی ئنگلیزیان روون ئەكردەوە . ئەیان ویست چی بە شێخ مەحمود بڵێن دەست بگرێ بەسنگەوە بۆیان ، یاخود بیكەن بە كوتەكی دەستی خۆیان ، چیان بوێ بۆ بەرژەوندی خۆیان‌و دژی ئامانجەكانی گەلی عیراق بەكوردو عەرەبەوە پێ‌ی جێبەجێ بكەن ... بێ‌گومان شێخ مەحمودیش ئەوەندە پیاوێكی ساویلكە نەبوو بەوان بخەڵەتێ ... بەكورتی شێخ سەری بۆ دانەنەواندن ، بۆیە ئەو تاوە دەزوە باریكەی لەنیواندیانابوو پساو لەگەڵ ئنگلیزدا دەستەو یەخەی یەك وەستان .

شێخ لە رۆژی (٢٠)ی مانگی مایسی ١٩١٩دا دەستی كێشا بەسەر سلێمانیداو ئەفسەرە ئنگلیزەكانی ناوشاری هەموو گرت‌و خستنییە بەندیخانەوە ، بەڵام بێ ئەوەی خوێن لەلووتی یەكیكیان بێت ، بگرە زۆر رێزیشیان گرتن ، مێجەر سون پیش ئەم كارەساتە بە یەك دوو رۆژ خۆی

---

(١) كیان .

دەربازکرد بۆ کەرکوك • بێ گومان ئنگلیز هەروا بەئاسانی دەست لـەم کارە هەڵناگرن ، ئەو هێزانەی لە موسلو هەولێرو کەرکوك بوون کێشیان کردن ، بۆیە شیخیش کەوتە خۆی ، لەشکری بەرەو دەربەندی بازیان بردو خۆی لەپێشیانەوە ، لەوێ هێزەکانی بڵاوە پێ کردو هەر بەشەی لەشوێنی خۆی دامەزراندو سەنگەریان هەڵبەستو قاپی دەربەندەکەی تـەنیو لـە بڕوایەدا نەبوو ، ئنگلیزەکان هەروا بەئاسانی بتوانن پیایا تێپەرن ، ئەوەشی هەرگیز بە بیرا نە ئەهات کە لەلایەکی ترەوە بتوانن بەدەربەنـدا تێپـەرنو هەلمەتیان بەرنە سەر ، بەڵام وەك مامۆستا رەفیق حلمی ئەفەرمۆی : (١)

بە (رابەر)ی موشیری حەمەی سلێمـان کە یەکێـکە لـە رەئیسـە بەگزادەکانی (هەمەوەند) کە ساردیو ناکوکی لەگەڵ شێخ مەحمود هەبوو، بەشێك لە لەشکرەکەی ئنگلیز لەرێگایەکەوە کە بەبیری کەسدا نەهاتبـی لەلای راستی دەربەندەوە بەشاخەکاندا سەرکەوت ، لەسفیدەی بەیـانداو لەکاتیکدا کە شێخ مەحمود لەبەردەمی دەربەندەکەوە بەتەمابوو هەڵمـەت بەرێت ، لەپشتەوە دەورەیان درا لەشکرە گەورەکەش لەولاوە پەلامـاری چەکدارەکانی کوردیاندا ، تۆپو فروکـەی ئنگلیزیـش کەوتنـە کار ، کوردەکان بەتفەنگەوە بەرامبەریان وەستان ، لەدواییدا شەرربووبە شەرری دەستەو یەخە •

لیرەدا مامۆستا رەفیق حلمی ئەڵێت :

لەم کاتەدا کە لە خاکی کوردوستاندا کارەساتی کربلاء تازە ئەکرایەوە شێخ محمودی قارەمان لەدولاوە برینداركراو لەئەسپەکەی کەوتە خوارەوە، ئیتر بەمە لەشکری کورد جلەوی تەگبیری لەدەست دەرچوو شپرزە بوو ، حاجی سەید حەسەنی مامی شێخ محمود لەگەڵ تایەری فەرخـە (مدیـری

---

(١) یادداشت بەرگی‌یەکەم بەشی (٢) لاپەرە ١٢٤ـ١٢٧ چاپخانەی مەعاریف بەغدا ١٩٥٦ .

پولیسی شێخ) لەناو کوژراوەکاندا بوون ، شێخ محمود دوای بریـنـداری کشایەوە ژێر بەردیك لێی‌کەوت ، [1] ئنگلیزەکان دیسان بەهۆی مشـیر ئاغاوە شێخ مەحمودیان ناسیەوەو خستیانە (سەبیارە)و لەژێر پـارێزگاری هێزێکی گەورەدا ناردیانە بەغدا [2] .

ئەم شەڕە لە رۆژی (٢١)ی مانگی مایس‌دا دەستی پێ‌کردو لەرۆژی (٢٢)ی مانگی حوزەیرانی سالی ١٩١٩دا کۆتایی هات .

شێخ مەحمود لەبەغدا برینەکانی دەرمان ئەکراو لەگەڵ شێخ محەمەد غەربی زاوایدا لەبەندیخانە وەیا لەنەخوشخانە چاوەروانی (موحاکەمە) بوو لەولایشەوە زابتە کوردە بەدیل گیراوەکانی وەکو قادر ئەفەندی قەرەداغی‌و عیزەت توپچی‌و قالەی ئایشەخان‌و رەشید جەودەت وەرەشیـدی غفـورو ئەدهەم ئەفەندی‌و علی یاوەری صالح‌و گەلێکی تر لەبەندیخـانەی بەغـدا فێری خشتی کاڵ برین ئەکران [3] .

(ویلسن)ی حاکمی عامی ئەوسای عیراق ئەڵێت :

لە نەخۆشخانەی بەغدا چوومە لای شێخ مەحمود ، بەوێنەیەکی ئێجگار بەکوڵ‌و تین‌و ئازایانە ئەیوت : نەك مەحکەمەی عەسکەری‌ی ئنگلـیز ، بەڵکو هیچ مەحکەمەیەك خاوەن حەق نی‌یە کە محاکەمـەی مـن بکات ، چونکە من بەپێی حەقێکی شەرعی کە لەلایەن دەوڵەتە سوێند خۆرەکانەوە دانی پیانراوەو ناسراوە شەڕم لەگەڵ ئنگلـیز کردووەو لـەرێی کـوردو کوردوستاندا خۆم بەخت‌کردوە [4] .

هەر (ویلسن) ئەڵێت : شێخ مەحمود دوانزە مادەکەی (ئەبێ چواردەبێ)

---

(١) بەردە قارەمانی پێ‌ئەڵێن .
(٢) یادداشت لاپەرە ١٢٧ .
(٣) سەرچاوەی پێشوو ل ١٦٤ .
(٤) سەرچاوەی پێشوو ل ١٧٠ .

ویلسونی رەئیس جمهوری ئەمەریکای بیر خستمەوەو بۆی خوێندمـــەوە ، ئنجا بازی بەندەکەی قۆلی کردەوەو لەنـــاو ئەوەدا بەرگێـــکی قورئـــانی دەرهێناو پیشانی دام کە تەرجەمەی کوردیی مادەکانی ویلسونو تەرجەمەی بەیانەکەی بە ئینگلیزیو فرنسزی تیا نوسرابوو کە لە لایەن حقوقی قەومـــە بچووکەکانەوەیەو کە لە ۱۹۱۸دا بلاوکرابوەوە [1] .

محاکەمەی شێخ مەحموود

بۆ دادپرسێنەوەی شێخ مەحمودو شێخ حەمە غەریبی زاوای لەبەغدا دادگایەکی سوپایی واتا دیوانی عورفی دامەزرا . حاکمەکانی ئەم دیوانـــە هەموویان ئنگلیز بوون .

شێخ مەحمود بەم تاوانانەی خوارەوە گوناهبار کرابوو :

یەکەم : چەك هەڵگرتن دژی بەریتانیای گەورەو رژاندنی خوێنێـــکی زۆرو بوونە هۆی زیانێکی مەزن .

دووهەم : داگرتنی بەیداخی بەریتانیای گەورەو دڕاندنـــی [2] ...

شێخ مەحمود لەپێش هەموو شتێکدا رەخنەی لەوە گرتبوو کە دەستەی ئەم دادگایە وەیا ئەم (دیوانی عورفی)یە هەمووی لە ئنگلـــیز واتـــا لەدوژمنـــە خاوەن داواکانی رێك خراوە ، جگە لەوەش ملی‌نەدا کە پارێزەر بگرێـــت بەرامبەر بە دادگا قسەی بۆ بکاتو لەسەری بکاتـــەوە ، چونـــکە ئـــەی پێویست بـــەم جۆرە دان بـــە (ماف)ی محکمەدا نەئێت بۆ ئەم موحاکەمەیە، خۆی بەگوناهبار دانەئەنا . بەرامبەر بەکردەوەی ئنگلیزو بێ‌قەولی‌یـــانو لەرێی پاراستنی وڵاتو سەندنەوەی حەقی شەرعی کوردا راستبۆتەوەو بەگژ ئنگلیزدا چوونی لەسەرخۆی بە (واجب) ئەژماردو لەم خوێن رشتنەدا

---

(۱) سەرچاوەی پێشوو ل ۱۷۰ .

(۲) سەرچاوەی پێشوو ل ١٦٥ .

نەك خۆی ، بەڵكو ئنگلیزەكانی بەموجرم‌و گوناهبار ئەزانی (١) .

ئنگلیزەكان لە سلیمانیەوە بەناوی شایەت تاقمێك لە پیاوە ناسراوەكانیان ڕێك خستبوو بەزۆر یا بە خواهش لەم موحاكەمەیەدا حازربوون ، ئەمـانە لەگەڵ كەپتەن (بۆند)ی حاكمی سیاسی چەمچەماڵدا نێرران بۆ بەغدا (٢) .

بە بەرچاوی ئەم پیاوە ناسراوانەی سلێمانی‌دا شێخ مەحمود بە ~~پەلنقەو~~ زنجیرەوە هێزا وتی (٣) :

لەسەر خواهشتی گەلەكەم داوای ئازادی كوردم لەبەریتانیا كرد ، بەو پەیمانە ڕێگای هاتنیان دراو لەلایەن حكومەتەكەتانەوە ئەم حكمداری‌یە بە من‌و ئازادی بە كورد بەخشرا ، بەڵام ڕاستتان نەكرد ، جا من كە لەســەر ویستنی گەلەكەم بە حكمدار دانرام ئەبوایە داوای ئەو پەیمانە بكەم بەزمان یا بەچەك

ئنجا ووتی : من لەگەڵ ئێوە لەجەنگدا بووم ، منتان بەدیل گــرت‌و لەبەندیخانەی ئێوەدام كە دوژمنی كوردو منن ، لەبەر ئەوە بێ‌گومــان . دوژمن بۆ دوژمن بڕیاری باش نادات‌و منیش بەو حوكمەی ئێوە ڕازی‌نیــم‌و بەعدالت نابینریت (٤) .

شێخ مەحمود دوای ئەم هەمو كارەساتە گرنــگ‌و سامنــاكە ورەی بەرنەدابوو نەپەشۆكابوو ، برینداری‌ی‌و بەدیل گیران‌و (دیــوانی عورفی) ئنگلیز ، نەی شڵەژاندبوو ، بەوێنەی پلنگی ناو قەفەس لەهەڵمەت بردن‌و

---

(١) سەرچاوەی پێشوو ل ١٦٥ـ١٦٦ .

(٢) سەرچاوەی پێشوو ل ١٦٧ .
ناوی شایەتەكان لەو لاپەرەیەدا هەیە هەروەها لەلاپەرە ٥٣ـ٥٤ چیم‌دی بەرگی یەكەم ـ بەشی‌یەكەمدا .

(٣) چیم‌دی . بەرگی یەكەم بەشی یەكەم ل ٥٤ .

(٤) سەرچاوەی پێشوو ل ٥٤ .

چەپۆك داهێنان ئەگەڕرا ، بەرامبەر دیوانی عورفی رەوشتو گفتو گۆی بێ گرێو ئازایانە لەعاست شایەتەکانا سوروشتی مەردانەو دلیرانەبوو ، لە نیگاکانیا بەرامبەر بەشایەتەکان وا ئەخوینرایەوەکە نرخیکیان نـاداتێو بەسووك دێنە بەرچاوی ، داخی ئەوەی ئەخوارد کە لای بێگانە کورد شایەتی لێ بدا . ماتەمینی ئەوە گرتبوی کە کۆتو زنجیری ئنگلیز پەکی خستبوو نەی ئەتوانی بیان پلیشێنێتەوە [١] .

لە ئەنجامی ئەمانەدا پەلاماری سەروپێچەکەی خـۆیدا ، راینەکانو دای بەسەرسنگی (گرینهاوس)دا کە لە هۆلی محکمەدا بۆ شایەتی وەستابوو ووتی : بەدبەخت ئەوە هەمووی گۆبەندی تۆیە [٢] .

گرینهاوس چی لەجەوالەکەیدا بوو دژی شێخ هەلی رشت وتی :
عیزەت نەجیب ئالای بەریتانیای داگرت ... و دراندنیو فڕێیدا .
عیزەت نەجیب لەوەلامدا وتی :

لەسەر فەرمانی حکمداری کوردوستان ، لـە کاتی شۆرشـدا بـۆ دامەزراندنی ئیشوکاری دائرەکانو مأمورەکان فرمانم پێ درا ، بێ گومان ئەبوایە ئەم فەرمانە بەجێ بهێنم ، ئالای ئنگلیزم داگرت ... بەقەدکراویو زۆر بەرێزەوە پێشکەش بەگرینهاوسم کرد ، بەلام داخەکەم دڕیو بەشەق لەبالقۆنەکەوە فرێی دایە خوارەوە،جنێوی خراپی بەمنو بەریتانیاشدا[٣] .
کە لەشێخ مەحمودیان پرسی پێی وتن :

بەلێ من فرمانمدا بەداگرتنی ئالای بەریتانیـا ... لـەرووی زالیو نەزانی سیاسەتەکەتانەوە ئالاتان داگیرا [٤] .

---

(١) یادداشت ل ١٦٧ .
(٢) چیمدی ل ٥٤ .
(٣) چیمدی ل ٥٥ .
(٤) چیمدی ل ٥٥ .

که دیوانــی عــورفی حــوکمی خنکانــدنی شێــخ مەحمــودیدا ، بەزەردەخەنەیەکەوە روانیەشایەتەکان کەپڕبوو لە (مانا)و لەستەم •

بریتانیای گەورە ئەم حوکمە گرانەی لەبەر دوو هۆ دابوو بەسەر شێخ مەحمودا •

یەکەم : بۆ نواندنی (هەیبەت)و گەورەیی بریتانیا •

دوەم : بۆ ئەوەی کە هاتوو حوکمەکەی دیوانی عورفییان گــۆری بەگرتنی شێخ مەحمود لەبەندیخانەدا وەیا ناردنی بۆ دەرەوەی عیراق ، ئەمە بکەن بە بەڵگەیەکی لێبــوردنی خۆیــانو چاوپۆشینیــان بەرامبــەر بــە گوناهباران ، هەندێکیش ئەیــان وت رێی تێ ئەچێــت کە ئنگلیزەکان ، ئەوەیان لەبەر چاو بووبێ کە کوردەکان بەرامبەر بە (دیل)ە کانی دەبۆکە پیاوانە جولابوونەوە ••• لەندەن حوکمــەکەی بە (بەنــدیی) دە ســاڵ گۆڕیی • دوایئەوە لەگەڵ شێخ حەمە غەریبی زاوای ناردیانە (جەزیرەی ئەندامــان ) [1] •

ئەمە روونکردنەوەیەکە بۆ ئەو پروپاگاندانەی کە پیاوەکانی ئنگلــیزو ئنگلیزەکان خۆشیان ئەیانکرد کە گوایە ئەو بەندییانە کە ( میــجر گرینهاوس ، کابتن دگلاس ، کابتن هۆڵت ، کابــتن رایــت ، میــجر دانلیس ، شکوفیل ، کابتن بوندو چەند ئەفسەرێکی تــر) بــوون کوژراون ، بەڵی راستە لەدواییدا بوندی حاکمی سیاسی چەمچەماڵ کوژرا ، هەر وەك زۆر لە ئنگلیزەکان لەگەڵیك شوێنی تردا لەعیراقدا هەر لەو سەردەمەدا کوژران وەك :

- کولونیل بیل حاکمی سیاسی موسل نزیك بیرەکەپرە •
- کابتن ووکر ، پیرسون ، بارسن ، ویکلی لەزاخۆ •

---

(۱) سەرچاوەی پێشوو .

ـ کابتن ویلی ، کابتن ماکدونالد له ئامیدی •
ـ کابتن سکوت له عەقره •
ـ کابتن لویس ، میجەر شبرد ، لیفتننت روس له مزوری •
ـ کولونیل لیچمن که شێخ ضاری محمود شێخی زەوبەع له فەلوجـه کوشتی •
ـ کابتن لوید سەرۆکی محکمه له بعقوبه •
ـ کابتن ریگلی معاونی حاکمی سیاسی ، کابتن برادفیل ، نیوتن ، هەموو له مقدادیه کوژران •
ـ کابتن بوکانان ، جونبینر ؟
ـ کابتن سالمون له کفری له شۆرشی ئیبرایم خانو وەیس بەگدا •
ـ کابتن مان ، میجەر نوربری له کوفه کوژران •
ـ کابتن بیرسن به دەستی گۆیانەکان کوژرا •

سەرنجێك لەم داوەری‌یە

زۆر راسته پێشوونیان که وتوویانــه ( ئــاوی زۆر دار بەرەو ژوور ئەروات ) ئیمپریالیزمی ئنگلیزی هاتوه کوردوستانی داگیرکردوەو ئەیەوێ (مساومه) به گەلی کوردو کوردوستان بکات ، شێخ محمودی پێشەوای کورد بەرامبەر بەم کاره ناپەسەندانەی ئنــگلیز وەستــاوەو داوای مــافی گەلەکەی نەبێت داوای هیچی تری نەکردوه ، کەچی ئیمپریالیزمی ئنگلـیز بێشەرمانه پێی ئەڵێت : بۆچی بەرامبەرم ئەوەســتی‌و ئــاڵای بەریتانیــا ئەهێنیته خوارەوه ؟ جا ئایا ئەمه زمانی هێزو دادی درندەکانی ناودارستــان نی‌یه ؟ شێخ مەحمود بەپیاو کوشتن گوناهبار بکات ، که ئەو له ماڵی‌خۆیداو له خاکی خۆیدایەو وەك هەموو نیشتمانپەروەرێك ئەیپارێزی‌و بەرگری‌لێ ئەکات‌و گیانی خۆی لەرێگایدا فیدا ئەکات ، کەچی پێی ئەڵێت : تۆ حەقی خنکاندنت هەیه چونکه بەرگری لەولاتەکەت ئەکەیت ، بەڵام ئەگەر نەمــان

خنکاندیت‌و له جیاتی ئه‌وه ئاواره‌ی (اندامان له هندستان)مان کردیت ، ئه‌وه ره‌حممان پێ‌کردوێت‌و پیاوه‌تیمان له‌گه‌ڵ کوردا کردوه •

شێخ محمود له‌و دادپرسی‌یه‌دا به هیچ جۆریك دانی به‌و دادگا عورفیه‌دا نه‌ناو ملی‌نه‌دا پارێزه‌ری بۆ بگرن ، چونکه خۆی به‌گوناهبار نه‌ئه‌زانی ، به‌ڵکو خۆی به‌خاوه‌ن حه‌ق ئه‌زانی‌و ئه‌وانه‌ی به‌گوناهبار دائه‌نا که‌ولاته‌که‌یان داگیرکردوه ، ئه‌وانه‌ی که درۆ له‌گه‌ڵ گه‌له ژێرده‌سته بێچاره‌کان ئه‌که‌ن له‌ژێر په‌رده‌ی حه‌ق‌و ئازادی‌و سه‌ربه‌ستی‌دا• شێخ محمود له‌گه‌ڵ شکاندنی خۆی‌و له‌شکره‌که‌ی ، ئنجا بریندارکردن‌و به‌دیل گرتنی ، له‌به‌ر دادگای عورفی‌دا ، نه‌ك هه‌ر نه‌ترسابوو یاخود نه‌په‌شۆکابوو به‌ڵکو ئازایانه‌و مه‌ردانه قسه‌ی کردوه ، ئه‌و شایه‌تانه‌ی بردبویانن که شایه‌تی لێ‌بده‌ن ، ئه‌وان ئه‌م پاڵه‌وانیه‌تیه‌ی شێخ ئه‌گێرنه‌وه که چه‌ند بێباکانه وه‌ڵامی پرسیاره‌کانی دادگای داوه‌ته‌وه ، ئنجا چۆن رقی خۆی به‌رامبه‌ر به‌نوینه‌رانی ئیمپریالیزم ده‌ربریوه ، ئه‌وانه‌ی که حوکمه‌که‌یان لێ تێکداوه ، هیچی نه‌که‌وتۆته به‌رده‌ست ، مشکی‌و کلاوه‌که‌ی خۆی نه‌بێت گرتویه‌تیه (گرینهاوس) که بۆ شایه‌تی هێناویانه پێی‌وتوه : به‌دبه‌خت ئه‌مه هه‌موو گۆبه‌ندی تۆ بوو ، واتا تۆو هاورێکانی تۆ ئه‌م فتیله‌تان نایه‌وه‌و ئاوا کوردوستانتان شێوان ، ئه‌مه له‌کاتێکدا که بێ‌گومان به‌چاوی خۆی په‌ته‌که‌ی دیوه که بۆی هه‌ڵواسراوه تاکو ملی پیابکه‌ن • ده‌ئازایه‌تی‌و نازه‌زایی ده‌ربرین‌و خۆبه‌پاکی‌پیشاندان هه‌ر ئه‌وه‌نده ئه‌بێت له‌کاتیکی‌واو شوێنێکی ئاوه‌هادا • بێ‌گومان ئه‌مانه‌ش هیچیان له شێخه‌وه دوورنین چونکه چه‌نده‌ها جار ئه‌م شتانه‌ی دیوه‌و به‌سه‌ریا تێپه‌ربون چ ئه‌وساو چ دوای‌ئه‌وه •

# محاکەمەی بینوی هندۆك

شوێنی نووکی دەرزیەك : هەموو کارێك وەکو خۆی لە کەلو قوژبنی ئێستگەکەی شەمەنەفەری (هوار) لە کلکتا لە رۆژی ٢٦ی تشرینی دوەمی سالی ١٩٣٣ دوای نیوە رۆدا ئەڕۆیشت لەو کاتەدا کە (ئامار باندی) خۆیو پوریو خوشکەکانیو برا گەورەکەی (بینوی) گەیشتنە نزیك بەردرێژی قەراغ رێگای ئێستگەکە بۆ ئەوەی سواری شەمەنەفەر بن بۆ شاری (باکور) لە ولاتی (بیهار) کە مالەکەیانی لێ بوو •

وتمان هەموو شتێك ئاساییی بوو وەك خۆی ئەرۆیشت ، تەنها دوشت نەبێت ، یەکێکیان ئەوەبوو ئەم خیزانە لەناو گەرمەی قەلەبالغیەکەدا لە ئیستگە کابرایەکی کورتە بالای پێسترەش بەدی ئەکەن کە هەر بە دوایانەوەیە لێیان نابێتەوەو دورو نزیك شوێنیان کەوتوە ، دوهەمیان هەستکردنی ئامار بەو نووکە دەرزیەی کرا بە قۆلیا لەوکاتەدا کە ئەیویست خۆی لەناو ئەو قەلەبالغیە رزگار بکات بگاتە فارگۆنی شەمەندەفەرەکە •

ئامار کە دەرزیەکەی پیاکرا پڕ بەدەم قیژانی تاکوو کەسوکارەکەی گورج لێی گردبوونەوە ، ئەوانیش زیاتر دەنگو قیژەیان لێبەرزبوەوە تاکو (بینوی) برا گەورەی سنگی نابۆپێشەوە تا گەیشتە ناویان کە پێیان ووت ئامار دەرزی پیاکراوە بە زەردەخەنەیەکەوە سەیری جیگای نووکە دەرزیەکەی کردو تۆزێ بەنووکی (پەنجەی دەستی چەپی) بۆیخوراند ئنجا دەستی کرد بە گالتە پێکردنیان کەوا بەس نیە ئامار لەناو ئەو

قەڵەباڵغیەدا لەوە خراپتری بەسەر نەهاتوە • هەشت رۆژی پێ نەچوو دوای ئەم کارەساتە هەر (بینوی) بە پێکەنینەوە گاڵتەی بەدنیا ئەهات کەلەبەر چاوی خۆی لاشەی براکەیان سوتاند بێ ئەوەی کەس بزانێ بە چ دەردێك مردوە • دوای ئەوەی لاشەی ئاماریان لەسەر رەوشتی هندوکەکان سوتاند بینوی وازی لەرویشتنەکەی پیشووی هەر نەهینا سواری شەمەنەفەر بوو یەکەوراست بۆ بومبای بەلاّم لە چوار قۆناغ زیاتر دوور نەکەوتبوەوە کاتێك بەخۆی زانی پۆلیس گرتیانو کەلەپچەیان کردە دەسی لەسەر ئەوەی دەستی لەکوشتنو لەناوبردنی ئاماری برایدا هەیە • محاکەمەکەی هەژدە مانگی کێشا بێ ئەوەی شتێك دەرکەوێت تەنها ئەوەنەبێ شایەت هەبوو کە (بینوی)یان دیبوو لەوکاتەدا دەرزیەکە کرابوو بە قۆڵی ئامارا بە پەنجەی شەهادەتی چەپی شۆرینی دەرزیەکەی قۆڵی ئاماری خوراند کە ئەمە کردەوەیەکی زۆر ناقوڵاو پێچەوانەیە لەئایینی هندۆکەکاندا چونکە لەو ئایینەدا هەرچی ئیشێك خێروباش بێ پێویستە بە دەستی راست جێبەجێ بکرێو هەر گوناهو کارێکی خراپیش بێت بەدەستی چەپ ، بەلاّم لە ئەنجامدا لێکولینەوە لکی لێبوەوەو تەنیەوە •

هەرا لەسەر میراتیی : ئەم جوتە برایە (بینویو ئامار) دوای مردنی باوکیانو دوای باوکیان پورەکەیان ، سامانو ماڵو زەویەکی زۆریان پێ ئەبرێ بەنیوەییو لەبەر ئەوەی ئامار منالْ بوە بەشەکەی ئەویش دراوەتە دەست بینوی برای کە سەرپەرشتی بۆ بکات •

جا لەبەر ئەوەی بینوی بەدوای ئیشی ناپەسەندو کەیفو خراپەدا ئەگەڕا ئەوەندەی پێناچێت لە بەشەکەی خۆی ئەبیتەوەو هەرچی ئەبێ ئەیفرۆشێت ، کە ئامار گەورە ئەبێتو ئەگاتە تەمەنی هەژدە ساڵان خێرا هەوڵی ئەوە ئەدات بەشەکەی خۆی لەچنگ بینوی دەربێنێ تا ئەویشی وەك خۆی نەخستۆتە سەر ساجی عەلی : بینوی ئەمەی لاستەم ئەبێ هەر بۆ

ئەوە ئەگەڕێت چۆن چالێك بۆ براكەی هەڵكەنێ‌و لەناوی بەرێ •• تــاكو بیری رەشی ئەیگەیەنێتە پزیشــكێكی ( باكتریولوجی ) لەوانــەی كە ئیش لە میكرۆبی نەخۆشیا ئەكەن ، ئەم پزیشــكەش ناوی (تارا شارچی) عەجەب مێ بازیك بوە ، هەر لەبەر ئەوەی چاوبڕكێ لەگەڵ كچەی دۆستی بینوی‌دا بكا ••• هەمو شتێكی بە قسەی بینوی ئەكرد •

تارا لەسەر داواكردنی بینوی دەست ئەكا بە هەوڵ‌و تەقەلادان بەدوای میكرۆبی رشانەوەی [1] پەروەردەكراودا بە بیانوی تاقی‌كردنەوەوە •

لە رۆژی دوانزەی مایسی ساڵی ١٩٣٢دا بە بروسكە داوای هەندێك لەو میقرۆباتە ئەكات لە پەروەردەخانەی (هاڤگین) لە شاری بۆمبای ، كــە هەر وەڵامیشی نادەنەوە چونكە ئەم جۆرە شتانــە هەروا بە ئاســانی لــە پەروەردەخانەكاندا نابرێنە دەرەوە ، ئنجا ئەكەوێتە دەست‌و پێ لستنەوەی برادەریكی خۆی لە شاری بومبای كە هەندێك لەو میكرۆبانەی بۆ پەیدا بكات ، كابرا دوای تەقەلایەكی زۆر كەمێكی چنگ ئەكەوێ بەڵام خــوای منوتۆ كردێ لەكاتی خۆیدا نەگەیشتە دەست تارا تا هەموی كۆن بوو و لــە كەڵك كەوت •

ئەم دو بەدبەختانە كۆڵیان نەدا ، رۆژێك بینوی لەگەڵ هاورێیــەكی كیمیاگەری كەیدا هەڵئەكوتنە سەر ئامار لە كاتێكدا كە لەگەڵ پوریدا لــە وڵاتی (دیوجار) پێكەوە ئەبن ، هەرچۆنێك ئەبێ رۆژێك بە هەردوكیــان ئامار هەڵئەخەڵەتێنن تا لەماڵ دووری ئەخەنەوە بۆ چەند سەعاتیك، لەو سەرەوە كە ئەیهێننەوە ، دەست بەجێ لە جیگادا بۆی ئەكەوێــت ، ئیــتر ئەمــان ئەگەرێنەوە بۆ شوێنی خۆیان ، خواوڕاستان پزیشكێك لەو ناوەدا ئەبێت گورج بانگی ئەكەنە سەری • پزیشك خێرا دەرمانی (تیتانوسی) ئەداتــێ

(١) چاو قوولكە ، طاعون .

که دژی (خوێن زەهراوی بوونە) • پوری هەژار بــە هەمــوو دڵێکــەوە ئەنیرێتەوە بەدوای بینوی خۆیو پزیشکی بنەماڵەکەی خویاندا •

بینوی خۆی ئەزانێ چی‌کردوەو شتی وەهای لەخوا ئــەوێ لەبــاتی پزیشکەکەی خۆیان (تارا)ی ناپاکی هاورێی لەگەڵ خۆی ئەهێنێ ئــەم دڵرەقەش خێرا خێرا پزیشکی دێیەکە (کە لەوەپیش لەســەر نەخوشــەکە ئەبێ) هان‌ئەدا کەواز لەتیتانوس بێنێو دەرمانێکی کەی پێ ئەڵێت بیداتێ بەڵام ئەو پزیشکەی پێشوو کاری راست‌بێت گوێ ناداتــە قســەی ، تــا لەدواییدا (ئامار) کەمێك چاك ئەبێتەوە • دوای رۆیشتنەوەی بینویو تارای هاورێی بۆ وڵاتی خۆیان جارێکی کەش ئەگەرێنەوە بە بیانوی هــەواڵ پرسینی ئامارەوە • تارا لەکاتیکا کە پزیشکی دێیەکە لەوێ نابێ فرسەت لــە ئامار ئەهێنێ دەرزیەکی لێ‌ئەداو پەرێشانی ئەکات بەجۆرێك شوێنی ئــەو دەرزیە ئەبێ بە دومەڵێکی پیس بە هەزار حاڵ تا چاك ئەبێتەوە • نەخــێر ئەم جووتە هەر کۆڵ نادەن هەمدیسانەوە بینوی ئەچێتەوە بۆ بومبای بۆ پەروەردەخانەی (هاڤگین) بە دوای میکرۆبێ رشانەوەدا هــەر نــایدەنێ ، هاورێیەکی خۆی کە دوختوری وڵاخ (بیطرە) ئەبێ لەوێ ئەیــکات بــە تکا کار هەر چنگی ناکەوێت ، ئنجا ئەنێرێتە نەخوشخانەیەکی تر هەر لەشاری بومبای بەڵکو لەوێ دەستی‌کەوێ ، بەزمانی لوس بەڵینی هەندێك میکرۆب وەرئەگرێ بەو ناوەوە کەگوایە دوختور تارای هاورێی دەرمانیکی بــۆ نەخۆشی رشانەوە دۆزیوەتەوە ، بێ‌گومان بەمە پاسو خزمەتی خوێنــدنو زانیاریو مرۆڤایەتیش ئەکا ••• خێرا پەیام‌ئەدا بەتارا، تارا بۆ رۆژی حەوتی تەمموزی ساڵی ١٩٣٣ ئەگاتە بومبای ، لەوێ لەنەخۆشخانەکەدا دەســت ئەکا بەتاقی کردنەوە ، پێنج رۆژی پێ‌ناچێت بڵاوی ئەکاتەوە کەوا ئیشێکی کوتوپڕی لێ‌رووداوە پێویستە زوو بگاتە کلکتــاو دوای جێبــەجی‌کردنی ئیشەکەی ئەگەرێتەوە بۆ بومبای بۆ تەواوکردنی تاقی کردنەوەکەی ، بەڵام

ئیستاو ئەوساش نەگەرایەوەو دەنگی نەبوو • کاربەدەستانی نەخۆشخانەکەش نەیانزانی ئەو ئیشەکوتوپڕەی تارا چیبوو کەوا بە گورجی بۆی گەرایەوە ؟ تا دوایی لە محاکەمەکەدا بۆیان دەرکەوت • هەندێك شـایەت لە پاشانـدا شایەتی ئەدەن کەوا بینوییان دیوە لەم دواییەدا لەگەڵ کابرایەکی کورتەباڵای پێست ئەستوری رەشدا زۆر جار پێکەوە بوون ، چەند جـارێك پێکەوە چونەتە تیاترۆ تاکو جارێك لەو جارانە چاویان لە بینویەوە بووە ئامـاری برای پیشانی ئەو کابرایـە داوە ، هەروەهـا رۆژی ٢٥ی تشریـنی دوەم (رۆژێك) بەر لە رۆیشتنی ئامار بەشەمەنەفەر ئەو جوتەیان پیـکەوە لـە ئیستگەی شەمەندەفەری کلکتا دیوە کەوا بە هەموو کەلو قوژبنی ئەو ناوەدا گەراونو تاقیان کردۆتەوە •

دیسانەوە بۆ ئەو ئیوارەیەی کە ئامارو پوریو کەسوکارەکەی نیازی رویشتنیان ئەبێ ــ بینوی ئەو رۆژە زۆر خوشەویستییو پیاوەتی بەرامبەر بە براو پورەکەی پیشان ئەدا ، دوای ئەوەی پرسیاری کاتی رویشتنیان لێ ئەکات بۆ ئیوارە ئەچێ بۆ ئیستگە بە پیریانەوە ، لەولاشەوە چاوێك لـە هاورێکەی هەڵئەتەکێنێ کەبۆ ئەم مەبەسە لەو ناوەدا ئامـادەی کردبوو • کاتێك ئامار ئەگاتە ناو قەڵەبالغی کابراش خۆی ئەگەیەنێتێ لەپڕ دەرزیـەك ئەکات بە قۆڵیاو ئامار هاواری پێ ئەکەوێ • کە لە قەلەبالغیەکەی رزگـار ئەکەنو قۆڵی هەڵئەماڵن ئەبینن شوێنی نوکی دەرزیەك بەقۆڵیەوەیەو ئاوێکی سپیی لینج هەر لە شوێنی دەرزیەکە بە قـۆڵی کراسەکەوەیـەتی • ئـەو دەرزیەش شرنقەی میکرۆبی رشانەوە ئەبێ کەوا ئەو کابرا رەشە لەئاماری ئەدا بە پیلانی بینوی برای •

دوای ئەوەی ئامارو کەسوکارەکەی ئەگەنە (باکور) هەمـو لەتـاوا جێ بەخۆیان ناگرن بەتەواوی لەبینوی دودڵ ئەبن هیجـگاربە هەلسـانو دانیشتنەکەیا کە لەرۆژی رویشتنو رۆژی پێشوتر کە لە (دیوجار) لێی ئەبینن،

هەرچەندە هندوکەکانیش زۆر رێزی گەورەترین نیرینەی ناوخیزانەکەیان لا هەیە بەلاَم بەمە نەیانتوانی خۆیان بگرن • بۆرۆژی دوایی ئامار نامەیەکی بۆدێ لەهاوری‌یەکیەوە بۆی نوسیوە کە پیویستە بە پەلە بگەرێتەوە بۆ کلکتا نەوەك شتێکت لێ بقەومێ • ناچار ئامار دوای سی چوار رۆژ ئەگەرێتەوە گورج خۆی پیشانی پزیشکێك ئەدا بەلاَم دەردەکەی بۆ نادۆزریتەوەو لە نەخۆشیەکەی ناگا ، بۆ سبحەینی تایەکی قورسی لێدێ ناچار پزیشکێکی کە ئەهێنن سەیری خۆینەکەی بکات ، دوای پشکنینی بۆیان دەرئەکەوێت کە ئامار تووشی نەخۆشی رشانەوە بووە ، هەرچەندە پەلە ئەکەن فریای چارەکردنی ناکەون تاکو بەیانی رۆژی چواری کانونی دوەم دوا هەناسەی لێ‌ئەبڕی •

وەزارەتی تەندروستی‌و هەموو پزیشکەکان سەرسام ئەمێنن کەوا نە لە ولاَتی (کلکتا)و نە لە (باکور) نەخوشی رشانەوە نیە ئایە ئەم کوڕە لەکوێوەو لەچیەوە تووشی ئەم دەردە بوە ؟ دوای ئەوەی یەك یەك پارچەکانی ئەم کارەساتەیان دایەوە دەم یەك بەلاَم بەو وردکردنەوەو لیکولینەوەی کە ئەندامی سوراخ‌کردن‌و دادگا ئەیکەن • محکمە بریاری خنکاندی بینوی‌و تارای‌دا • دوای تێ‌هەلّچونەوەی فەرمانەکە ، ئەو بریارە گۆڕرا ئەمجارە فەرمان درا بە بەندکردنی هەردوکیان لە بەندیخانەو بە ئیشی قورسەوە تا مردن (رەنگ هەیە بۆ ئەوە فەرمانی یەکەم جاریان گوڕی بێت نەك زوو لەناو بچن‌و رزگاریان ببێ ) بەلّکو بۆ ئەوەی تا گیانیان لە قەفەزەی سنگیانایە هەر بەسزاو چروساندنەوەی بەندیخانەوە بتلێنەوە •

سەرنجێك لەم کارەساتە :

ئەم روداوە زیاتر وردبینی‌ی لێکۆلەرەوەکان (محققین) پیشان ئەدات کە چۆن دەردی ئەلین (سەری پەتە ئالۆزکاوەکەیان دۆزیەوە ) • ئەویش بەخوراندنی شوێنی ئەو دەرزیەی لە (ئامار) درابوو لە ئێستگەی شەمەنەفەر

بەسەری پەنجەی شەھـادەتی چەپی بینـوی برای ، کە ئەمـە لەئـایینی هندۆکەکاندا بۆ کاری خراپو داوای شەر بەکار ئەهێنرێت نەك بۆ کردەوەی باشو خێر • جگە لەوەی ئەم کارەساتە سووربوونی خاوەنەکانی لەسـەر تاوان پیشان ئەداتو نەگەرانەوە لێی ، بێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەنجـام ، جۆرێکی تایبەتیش لەتاوان کە ئەویش کوشتنە بە نەخۆشی رشانەوە •

بەلاّم نازانم (لەتێهەلّچونەوەی حوکمەکەدا) چۆن بریارەکە لەخنکاندنەوە گۆررا ، چونکە تاوانی هەردوولا (ظروف مشـددە) ئەیـان گرێتـەوە • بینوی برای ئامار بووە هەولّی کوشـتنی داوە کە میراتـەکەی بخـوات ، (تارا)ش پزیشك بووە هەر لەو رێگایەشەوە میکرۆبەکەی وەدەستهێناوە• ئەمانە هەموو وامان لێ ئەکات ئەو بریارەی دوایی بە کەموکورر دابنێین •

# محـاكەمەی ستاڤسكی

( گەورەترین باسی فرۆفێل لە سەدەی بیستەمدا ) •

ستاڤسكی كێیـە ؟ : ئەلكسندر سـیرگی سـتاڤسكی لـەرەگەزی جولەكەكانی روسیایە ، لەشاریك نزیك (كییف) لە روسیا لەدایك بـووەو كوڕی پزیشكێكی دانسازبوو • هەموو لە سالی ١٩٠٠دا روسیا جێ ئەهێڵن ئەچن لە فەرەنسە جێگیر ئەبن •

ستاڤسكی هەر لەمنالیەوە ، بەسەرو سەكوتیا دیـاربووە كە چەنـدە بزێوو چاو نەترساو بووە ، جگە لەوەی زۆر حەزی لەپـارە كردوە • كـە ئەگاتە تەمەنی گەنجیەتی ئەكەوێتـە دەوروخـولو سوڕاندنەوە بـەدوای ئافرەتو ژنی دەولەمەندا بۆ كێشانەوەی پارەكانیان ، تا چەند كەسێـكی دەولەمەند بەم جۆرە لەخشتە ئەباتو دەستی هەندێكی كە ئەبڕێ تـا لـە (تاوان)یكدا ئەگیرێت پانزە رۆژ بەند ئەكرێت ، دوای ئەوە بە سێ سـاڵ (ساڵی ١٩١٥) هەر لەسەر باسی فێڵو لەخشتەبردن شەش مانگیتر ئەكرێتە ژوورەوە •

لە ساڵی ١٩١٧دا شكات لەخۆیو هاورێیەكی هەر لەسەر فروفیـل ئەكرێت بەلام شكاتەكە سەرناگرێ چونـكە دادخوازیەكەیـان بۆ سـاغ نابێتەوە • دیسانەوە لەساڵی ١٩٢١دا دەست بەسـەر هـەرچی ئالتـونو گەوهەریكا كە (مادام جان بلوخ)ی دۆستی لای دانابوو ئەگرێت ، ئنجـا پەلاماری فرمانی بانقەكان ئەدا بە تەنها فێلێك چوارملیۆن فرنك پیا ئەدا ،

لەسەر ئەوە بۆ جاری سێهەم کرایەوە بەندیخـــانە ، ئەوەنـــدەی پێنەچـــوو بەرەڵلاکرا ، گورج دەستیپیکردەوە بەلام ئەمجارە لیسی هاویشتە کومەلە بەرزەکانی پاریس • بەهۆی رێکوپێکی ئەندامو قسەرەوانو یەسکیسوکیو زیرەکیەوە خۆی لەگەڵ گەلێك لە پیاوی گەورەو نـــاسراوا رێکخســـت بەجۆرێك چوە بنجو بناوانی نەهێنی ژنوپیاویانەوە ، ئەم نەهێنیانەی کـــرد بەکوتەکی دەستی بۆ سەرگرتنی فروفێلـــەکانی ، هێنـــای کارخانـــەیەکی بەدکاریو داوێنپیسیی بۆ کردنەوە ناوی‌نا (کادیە روسیل) هەریەکێك لەو ژنو پیاوە گەورانەی ئارەزووی داوێن‌پیسیو خراپەیان بکردایە روویـــان تێ‌ئەکرد ، خۆشی پارەی بەقەرز ئەدانێ بەرامبەر بەوەی چـــەکی لەســـەر رائەکێشان ، کە ئەو چەکانەی ئەبرد بۆ گۆرینەوە لەبانقەکانا بە ئارەزووی خۆی ژمارەکانی زیاد ئەکردن، کاتی حساب خاوەنەکەی نەیئەوێرا لەترسی ئەوەی کەتنەکانی دەرنەکەوی فزەبکات ، تاکو جارێـــك چەکێـــکی (٦٠٠) فرەنکی کردبوو بە (٤٦٠٠٠) فرەنك ، لەسەر ئەوە درا بە محکمـــە ، بەلام کاتێ محکمە بەخۆی زانی چەك ونبوو ئیستـــاو ئەوســـاش نەدۆزرایەوە ، تووەز رای سپاردبوو بۆی بدزن بەوە خۆی رزگار کرد •

لە سالی ١٩٢٥یشدا لە تیاچوونی ئەو بەشانە (سهم)دا دەستی هەبوو کە لە کەشتیی (فالدیفیا) دزرا • هەر ئەو ســـاتە چاویشـــی بڕیبوە دووی ئەوشتانەی دۆستو ناسیاو لایان دانابوو ، بۆ سالی ئایندە ساختەیەکی تری کـــرد •

بەم جۆرە رۆژ بە رۆژ زیاترو چابوکتر تەشقەلـــەی ئەکرد ، تـــاوای لێهات لەماوەی تەنها سالێکدا بایێ چوار ملیۆن دینـــار (چـــەك)ی درۆی دروستکرد ، لە ئەنجامدا کە لە پاداشتی ئەو هەمو گەڕو فێڵو تەفرەدانەدا درا بە محکمە ، نۆزدە جار لەسەریەك محاکەمەکەی بەمرۆو سبەینێ دواخرا، ساڵەها مایەوە تا خۆی بەسەریا رۆیشت •

وتمان ستاڤسكی كابرایەكی چابوكو وریابوو خۆی لەگەڵ گەلێك لەگەورە پیاوانی دەولەتو دەسەلاتدارانی بانقەكانو خاوەن رۆژنامەكاندا رێك ئەخستو پارەی بۆ ئەبەخشینەوە تاكو لەوەزیری ناوخووە فەرمانێكی درابویە لە هەر جیگایەكا لێی قەوماو پێویستی بەیاریەدان بوو ئەبێ پۆلیس فریای بكەوێ •

لە هەمووی سەیرتر ئەوەبوو ئەم بەلایە بیئەوەی سەرمایەیەكی باشی بێ هەر لەخۆیەوە سێ زەرەنگەرخانەی گەوهەری داناو وای لەخۆی كرد خەلك پیارابیەرموون شتی لادابنێن ، ئەمیش زۆر بەئاسایی و بێترس ئەو خشڵو مجەوهەراتەی ئەوانی هەلئەگرت بۆ خۆیو لە شۆینیان زەردو بەردو موروە درۆزنەی دائەنا ، لە ساڵی ١٩٢٨دا كە تازە لەبەندیخانە رزگاری ئەبێ ، لەتاو بێپارەیی رووئەكاتە بانقی شارەوانیی (اورلیان) كە پارەی بە قەرز لەبری ئەو بارمتانەی لای دائەنرا ئەدا ، ستافسكی دوای درۆو دەلەسەو فڕوفێلێكی زۆر نزیكەی (٢٥) ملیون فرەنكی وەرگرت ، بارمتەكانی هەمو ئالتونو گەوهەری درۆبوون كە نرخیان لەنیو ملیون فرنك زیاتر نە ئەبوو ، بەلام كابرایەكی سەرچلی وەك ستافسكی چۆن بەم پارەكەمە واز ئەهێنێ ، لەو كاتەدا هاتو چۆی گازینۆی (بیاریتز)ی ئەكرد كە بەناوبانگ ترین جێگای قومارچیو خاوەن سامانەكان بوو ئەو گازینویەش نزیك شاری (بایۆن) بوو كە بانقێكی تیانەبوو ، ناچار قومارچیەكان كە پارەیان ئەدۆراند دوور ئەكەوتنەوە ئەچون بۆ بانقەكانی شاری (تولوز)و (بوردۆ) قەرزیان ئەكردو ئەگەرانەوە •

ستافسكی حاكمی شاری (بایۆن)ی هەڵفریوان كە پێویستە لە شاری بایۆن بانقێك هەبێ بۆ ئەوەی ئەو قانزاجە زۆرە دەست بیگانە نەكەوێت تا خەڵەتانیو لەخشتەیبرد ، ئەوەندەی نەبرد بانقیان دامەزراند ، بەبۆنەی ستافسكیشەوە كە زۆر كەسی ئەناسی بەشەكانی زوو وەبەنرخێكی باش

فرۆشرا ، هەرچەندە ئەو بەشانە بەقەدەر ئەو ئالتونو گەوهەرانە نەبوون کە لە جیگایاندا بوون بەلکو گەلێك زیاتر بوون کەچی کەسیش هەستی بەمە نەکرد چونکە بەرێوەبەرو کاربەدەستەکانی بانقەکەش هەمــوو هــاوکارو هاورێی ستافسکی خۆی لەدزیو فروفێلابوون ، کاتێك خاوەن بەشەکان بەخۆیان زانی دەستێکیان کەوتە ئەملاو یەکێکیان کەوتە ئەولا •

دوای ئەو هەموو فێڵو ساختانەی ئەم کابرایە کردنیی ئنجا دەنــگی گشتیی فەرەنسە بەرزبوەوەو داوای تۆلەسەندنی کردو پرسیاری کــرد بۆچی تا ئێستا کەس گوێی نەداوەتە ئەم بەدرەفتاریانە ناچار دەولەت فەرمانی گرتنی ستافسکی داو زۆر بەدوایا گەڕان تاکو دۆزیانەوە ، جا لیرەدا هەندێك ئەڵێن پێش ئەوەی بگیرێ خۆی کوشتوە ، هەندێکی کەش ئەڵێن بەتەگبیری وەزیرو پیاوە گەورەکان کوژرا بۆ ئەوەی نەهێنییان دەر نەخات •

هەرچەندە ستافسکی خۆی بەکوشتن رزگاری بوو ، بەلام لەرۆژی بیستوچواری تشرینی دوەمی سالی ١٩٣٥دا دادگــا پێکهــات بۆگشــت هاوریو بەردەستەکانی کە یەکە یەکە ئەمانە بوون :

١ ــ دی بروس : مدیری پێشوی بانقی قەرزدانی شاری ئۆرلیان •

٢ ــ فارو : پسپۆری نرخدانان هەر لەبانقی باسکراودا •

٣ ــ هاتو : هاورێی ستافسکی •

٤ ــ هایوت : بەریوەبەری پێشوی شاتۆی ئیمپراتوریی •

٥ ــ جەنەرال دی فورتو : ئەندام لە ئەنجومەنی گێرانی بانقی ئورلیان •

٦ ــ تیسییە : بەریوەبەری بانقی بایون •

٧ ــ کۆهین : نرخدانەر لە بانقی بایون •

٨ ــ دی جوان : ئەندام لە ئەنجومەنی گێررانی بانقی بایون •

٩ ــ جارا : حاكمی شاری بایون‌و نوینەر لەپەرلەمانداو سەرۆكی ئەنجومەنی گیررانی بانق •

سەرۆكی محكمە مستر (بارنو) دادپرسێكی زۆر وریاو شارەزابوو كەوتە محاكەمەیان‌و لەبەر ئەوەی گوناهباری یەكەم ستافسكی نەمابوو بانگی كردە :ــ

دی بروس : یەكێك لە گوناهەكانی ئەم كابرایە ئەوەبوو كە ٢٥ ملیون فرەنكی بە قەرز دابوو بەستافسكی بە بارمتەی (٥٥) پارچە زمروود كە نرخیان بە (٥٣) ملیون فرەنك دانابوو كەچی لەهەموو جیهاندا (١٥٥) پارچە زمروودنیە كەواتە زانیویەتی ئەو پارچانە زمروودی راستەقینە نین‌و هەمویان بەردی درۆن •

دوای ئەو (فارو) بانگ كرا ، سوێندی خوارد هەر پارچە زمرووتیێك ئەو سەنگاندبنی هەموو ساغ بوون‌و هیچیان درۆنەبوون‌و وتی : رەنگ هەیە ستافسكی لەدواییدا خۆی گۆڕیبنی •

دوای ئەو (هاتو) هات كەدانی بەهیچا نەنا •

ئنجا (هایوت) بانگ كرا كە هاوڕیی ستافسكی بوو لە هەمو كاروباریكیا ئەمیش وەكو ئەوانی بەرو پێی لەهیچ نەنا بەڵام كە سەرۆكی محكمە ئەو سەنەدانەی پیشاندا كە هەموو رۆژێك بەر لەقەرز وەرگرتن لەبانقەكان زمرووتی درۆی پێ‌كریوەو ئەو سەنەدانەی كە لەرۆژی پارە وەرگرتندا داویەتی بە بازرگانە زمروود فرۆشەكان بۆ ئەوەی هی ساغیان لێ‌وەرگرێ‌و هەر ئەوانە بەرێ بۆ بانق بۆ تاقی‌كردنەوە ئەوسا هیچی بۆنەمایەوە زەردەخەنەیەكی وشك گورج لەدەم‌و چاویا كوژایەوە •

كە سەرە هاتە سەر (جەنەرال فورتو) دانی‌ی بە هیچا نەنا وتی: من زۆر بڕوام بە ستاڤسكی بوە كە پیاوێكی ئیشكەرو راستە ، چۆن بڕوام

پێی نابێ ئەو لەگەڵ ئەو هەموو پیاوە گەورانەدا وەکو مسیو لاڤال [1] جگە لەوەزیرو کاربەدەستانی تر تێکەڵاو بوو ؟ .

تیسییە : تۆمانجی ئەمیش ئەوەبوو لەو کاتەدا مدیری بانقی بایون بوو زیاتر لە بایی ٢٣٨ ملیون فرەنك سەنەدی درۆی دەرکردوە بەڵام ئەمیش دانی بەهیچا نەناو کەوتە گێرانەوەی تیکەڵی ستاڤسکی لەگەڵ پیاوە گەورەکاندا تاکوو گوایە جارێك ستاڤسکی پێی وتوە ئەچم بۆ شاری (پواتییە) بۆ ئەوەی وەزیری ئیشوکار (فرانسوا الببر) ببینم ملیونێك فرەنکی بدەمی ، دوای ئەوە وتی : من هەرچەندە بەرێوەبەری بانق بووم بەڵام هەرچیەکم کردبێ لەسەر قسەو داوای (جارا) بوە کە بەریوەبەری ئەنجومەنی گێرانی بانق بوو .

هنری کوهین : ئەم بەپێچەوانەی بەروەکانی پێی لە هموشتێك نا بەڵام وتی تیکەڵاوبوونی ستاڤسکی لەگەڵ ئەو هەموو وەزیرو کاربەدەستانەدا منی لە خشتەبردو سەری لێ‌تێك‌دام هیچ بڕواشم نەبوو ئەو زلزلانە بێڵن کە ستاڤسکی خۆی یاخود دەستو پێوەندی رۆژێکی وەکو ئەمرۆ بەم جۆرە لە محکمەدا بوەستن بۆ محاکمەیان ، چونکە نەبو ستاڤسکی نەیناسیت یا تیکەڵاوی لەگەڵیا نەبوویێت تاکو رۆژێك غیرەتم لەسەر ئەو هەمو قوماربازیانەی ئەم کابرایە جووڵا نامەیەکم بۆ دایەرەی ( ئاسایشی گشتی ) نوسی کەوا هەندیك پەیامی گرنگم لاهەیە ــ قسەم لێ وەرگرن کەچی ئەوەندەی پێنەچوو ستاڤسکی لەسەر ئەوە گەلیك سەرزەنشتی کردم منیش هەرچەندە خۆم لێ‌هەڵە کرد سودی نەبوو چونکە نامەکەمی دەرهیناو پیشانی‌دام ، ئیتر منیش زمانم بەسرا ، جگەلەوە جارێك ستافسکی چەند

---

(١) وەزیری ئەوساو سەرەك وەزیرانی فەرەنسە لەکاتی شەڕی گەورەی دوهەمداکە لەم دوایەدا بەتومانجی بەدنمەکی‌و یاریدەدانی ئەلەمانەکان لەکاتی شەڕا فەرمانی خنکاندنی درا .

پارچەیەك گەوهەری لیٚ کرێم پێیوتم بۆ هەندی لەنوینـەرانی پەرلەمـانی ئەبەم لەوانە تەنها ناوی (فرانسو البیر)م لە بیرماوە ، زۆر جـاریش دیومـە ئیواران لەگەڵ وەزیری بازرگانیدا پێکەوە نانیان ئەخوارد •

دی جوان : ئەمیش پێی لەهیچ نەنا بەڵام کەسەرۆکی محکمە هەندێك لەکردەوەکانی بۆخویندەوەو هەندێکی تری بیرخستـەوە وەڵامـی پـێ نەدرایەوە •

جارا : جاراش بەربەستی هەموو گوناهیکی کرد کە دراوەنەتە پاڵی ، دیتە لەپەرلەمانا فێری دووان بووبوو ، لە محکمەشدا زۆری لەسەر رۆیی بەڵام بە دەنگیکی کاریگەرو ریٚکوپیٚکەوە ، ئەمیـش بـاسی تێـکەڵاوی ستاڤسکی لەگەڵ گەورە پیاوانو کاربەدەستانا کردو وتی : لەبەر ئەوە بوو زۆر بروام پێی بوو •

سەرۆکی محکمە لیٚیپرسی :ـ بۆچی لەکاتی کوبونەوەی ئەنجومەنی بانقدا تۆ هەوالو باسی بانقت بەدرۆ لەبابەت رۆیشتنـی ئیـشو بـرەوی سەنەدەکانتانەوە بۆ خۆیندونەتەوە بۆ ئەوەی ئەندامەکان بڕیاری دەرکردنی سەنەدی تر بدەن ، جگە لەوە نـاوی (دی بروس)ت لەسەر ئـەو نوسراوە لەجیاتی ناوی خوت داناوە ؟ کابرا وەڵامی پێنەدرایەوە •

جیبان : بەریوەبەری هاوکاریەکی (تأمین) بوو ، ئەمیـش هـەروەکو ئەوانی پێشو باسی بێئەندازەیی حورمـەتگرتنی ستاڤسـکی لەشوینـە بەرزەکانی پاریسدا کرد وتی : تاکو وەزیری ئیشوکارو وەزیری بازرگانی نامەیان بۆمان ئەنوسی کە بەشەکانی بانقی (بایون)و (ئورلیان) بکرین تاکو وامـان لیٚهات کەهات ، بـایی ۲۳۸ ملیـون فرەنـك لەبەشەکانی بـانقی (بایون)مان کری•هەر لەبابەت ریٚزگرتنی ستاڤسکیەوە گێرایەوە کەوا جارێك قۆنسۆلی ئەمەریکا لەگازینۆیەك لەگازینۆی قومارچیەکان لەسەر ئەومێزە

خەریکی نانخواردن بوە کەبۆ ستاڤسکی لەوەپێش تەرخـان کراوە ، کـە ستافسکی پەیدا ئەبێ نایەڵن قونسول نانەکەی لەسەر ئەومیزە تەواو بکا ، جێگاکەی پێ ئەگۆیزنەوە •

دی باری : ئەمیش رۆژنامەچیەك بووە بەوە گوناهبار کرابوو کەتکای لەدالیمیەی وەزیری ئیشوکار کردوە بۆ هاوکاریەکانی (تأمین) بنوسێت بۆ ئەوەی بەشەکانی شارەوانیی (ئورلیان)و (بایون) بـکرن ، بـەوەی کـە رۆژنامەکەی خۆی خستوتە ژێردەست ستاڤسکیەوە تکای لە (داریوس)ی روژنامەچیش کردوە کە ئەوەندە لەسەروپۆستی بـانقی (بـایون) نـەداو لەئیشوکاری نەدوێت •

کابرا بەربەستی ئەو هەموو تومانجانەی دایەوەو دانی بەهیچدا نەنا•

بونورو جورجولییە : گوناهی ئەمانیش ئەوەبوو کە حـەقی خویـان بەزیادەوە لە ستاڤسکی وەرگرتـوە ، ئەمـەش وا ئەگەیـەنی هـاوریی فڕوفێڵەکانی بوون ، جگەلەوەی جولییە یارمەتی دەربازبوونی ستاڤسـکی لەکاتێکدا داوە کە فەرمانی گرتنی بۆ دەرکراوە •

مادام ئارلیت ستافسکی : ژنی ستاڤسکی بوو بەوە گوناهبارکرابوو، زانیویەتی ستاڤسکی مێردی ئەم هەموو پارەو سامانەی بە فڕوفێڵ دەسـت کەوتوە ، بۆچی قسەی نەکردوە یا دەولەتی ئاگادار نەکردوەو ئەگەر ئـەم کابرایە ئەو پارانەی بە فڕوفێڵ دەست نەکەوتوە لەکویی بووە ؟ :ــ

بەشێك لەکوشکێکا مانگی بە ٢٠ هەزار فرەنك لەوهەرزانیەدا کەپارە زۆر بەنرخ بووە بەکرێ بگرێـتو ٥٥ هـەزار فرەنـك بـۆ خـواردنو خواردنەوەی ژنەکەی لە سێ مانگا و ٢٠٠ هەزار فرەنك بۆ خۆجوانکردنی هەر لە سێ مانگا خەرجبکات ؟ •

دوای ئەوەی قسەی هەموو گوناهبارەکان تەواو بوو ئنجا پارێزگاریی

پشتیوانه کانیان گوێ لێ‌گیرا که نزیکه‌ی ٢٠ رۆژی پێ‌چوو له رۆژی ١٦ی کانونی دوه‌می سالی ١٩٣٦دا کۆمه‌لی سوێندخۆران نزیکه‌ی (٢٤) سه‌عات دانیشتن بێ‌هه‌لسان تاکو بریاری خۆیان ریکخست‌و دایان به محکمه •

پاش ئه‌وه محکمه فه‌رمانی خۆی به‌م جۆره ده‌رکرد :ـ

دی بروس : به‌ندی ته‌نهایی تاکو (٥) سال •

هاتو ودی‌فورتو : به‌ندی ته‌نها هه‌ریه‌که تا (٢) سال •

هایوت : به‌ندی ته‌نها تاکو (٧) سال •

تیسییه : به‌ندی ته‌نها به ئیشی قورسه‌وه تا (٧) سال •

کۆهین : به‌ندی ته‌نها تاکو (٥) سال •

جارا : به‌ندیه‌تی بۆ دو سال •

هه‌ریه‌که‌ش سه‌د فره‌نك جه‌زا بده‌ن‌و هه‌موشیان پێکه‌وه نزیکه‌ی ملیونێك فره‌نك بده‌ن که له‌ریگای محاکه‌مه‌دا خه‌رج‌کراوه •

دی بونور : بۆ سالیك به‌ندی له‌گه‌ل دواخستنی کردنه ژوره‌وه‌ی • به‌لام ئه‌وانی که هیچیان له‌سه‌ر ساغ‌نه‌بوه‌وه •

ئا به‌م جۆره کۆتایی به گه‌وره‌ترین کاروباری ساخته‌و ده‌ست برین هێنراکه خاوه‌نه‌که‌ی پێش گه‌یشتنی بۆ به‌رده‌می دادگا سه‌ره‌ونگوم کراو کوشتنه‌که‌ی دیزه‌به‌ده‌رخۆنه‌کرا وه‌ك هه‌زاره‌ها ملیون فره‌نك‌و شتی به‌نرخ که ئه‌ویش له‌ژیانیدا سه‌ره‌ونگومی ئه‌کردن‌و ئه‌م ده‌ست به‌و ده‌ستی نه‌ئه‌زانی • ئه‌وه‌ی شایانی باسه ، ئه‌م جوره که‌سانه له‌شوینی وه‌هادا پێ ئه‌گه‌ن ، که‌چینی بورجوازی بۆگه‌ن ئه‌کات‌و شیرازه‌ی حوکم ده‌رئه‌چێت‌و کاربه‌ده‌ستان هه‌رخه‌ریکی تێرکردنی حه‌زو ئاره‌زووی خویان ئه‌بن ، ئه‌م شه‌پۆلی پاشاگه‌ردانیه‌ش زوزو به‌سه‌ر ئه‌وجۆره رژێمانه‌دا ئه‌داو ئه‌یان

گەیەنێتە شەرای مەرگ ئەوسا دەنگی (اصلاح) سەر لەنوێ بەرز ئەبێتەوەو دەرزیەکی بەهێز لەرژیمی حوکم ئەدرێتەوەو بەم جۆرە ...

جا لەساو پەنای ئەم جۆرە رژێمانەدا هەزارەهای وەك ستاڤسکی پەیدا ئەبن ، کە بەخزمەت کردنی کاربەدەستان بەپارەو بەرتیلو قەرزو ئافرەت بۆ خۆیانو پیاو بۆ ژنەکانیان ... بەکرینی فەرمانبەرانی ترو ئەو (تەلیسمانە)ی ئەیانخەنە کار ، ئاوا ئەکەونە شووڵ لێهەڵکێشانو شڵپی شوپێن .. ئەگینا کابرایەکی جەردەی وەك ستاڤسکی کە چەندەها جار میوانی بەندیخانەبوەو لەسەر دەستبرینو پارەی خەڵك خواردن چەندەها جار گیراوە ، چۆن ئەتوانێ ئەو بێحەیاییە بکات ئەگەر (پسوڵە)ی یەکێکی وەك وەزیری ناوەوەی بە دەستەوە نەبێت ، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا هەمووی ، دەستی داد لەدەستی ستاڤسکیو وەزیری ناوەوە درێژترە لە هەموو شوێنو سەردەمێکداو تاوانبار سزای خۆی هەر ئەچێژێت .

# محاکەمەی هەڵگیرسێنەرانی شۆرشەکەی مایسی ٩٤١ لە عیراقـــدا

**شۆرشەکەی مایس چۆن هەڵگیرسا (١)**

کوشتنی بەکر صدقی : سەلاحەدین سەباغ لەم روەوە ئەڵێت : (٢)

(تەها پاشای هاشمی کە لەساڵی ١٩٣٦دا سەرۆکی سەرەوای سوپای عیراق بوو ، هەستا بەرەسمی سەرێکی لەئەوروپاداو بەکر صدقی لەشوێـــن خۆی دانا ، بەکر ئەمەی بەهەل زانیو بۆ یەکەمجار لە مێژووی عیراقـــدا بە راپەرینێکی سوپایی وەزارەتی دەرپەڕاندو جەعفەر پاشـــای وەزیـــری بەرگریی کوشت .. مەلیك غازی ئەم جولانەوەیەی پێخۆشبوو .. ئیتر لەوکاتەوە سوپا دەستیکرد بە لووتژەنە کاروباری دەوڵەتو پێکهێنانی وەزارەتەوە ، بەتایبەتی هەڵبژاردنی وەزیری بەرگری ئەبوایە لەسەر قسەی سوپا بوایە ، هەرچەندە ئەمە ، لەولاتە سەربەستەکاندا روو نادات ، بـــەلام لەو ولاتانەدا کەژێردەستەی بێگانەن ئەمە شتێکی پێویستە ، بۆ ئـــەوەی

(١) لەناو کوردەواری لای خۆماندا هەر بە (شەڕەکەی رەشید عالی) نـــاوی دەرکردوە . کتێبو سەرچاوەی زۆر لەبابەت ئەم شۆرشەوە هەیـــە ، بەلام من ئەو سەرچاوانەم گرتـــوە کە پەیوەندییـــان بـــەرووی باسـایی باسەکەمانەوە هەیەو بەتایبەتی ئەوانەی چنگم کەوتوون وەك :
— اسرار (٢) مايس ١٩٤١ والحرب العراقيه الانكليزيه — يونس بحري مطبعة الحرية ١٩٦٨ .
— الكتاب الابيض . نجم‌الدين السهروردي . دار الزمان ١٩٦٦ .

(٢) فرسان العروبة في العراق (او مذكرات صلاح‌الدين الصباغ) .

دەسەڵاتی ئیمپریالیزم نەهێڵێت ... سوپا وردە وردە یەکی گرت ... لە ١٩٣٧دا بەکر صدقی کوژرا ، جەمیل مەدفعی وەزارەتی دامەزراند ، بەڵام لەبەر کردەوەکانی وەزیری بەرگری (سەبیح نەجیب)ی سەر بەئنگلیز سوپا داوایکرد تەها هاشمی کە سوپا خۆشی ئەویست ، ئەو وەزارەت پێك بهێنێت ، بەڵام تەها پاشا نەیکرد ، ناچار نوری سەعید وەزارەتی پێكهێناو تەها پاشا بووبە وەزیری بەرگریو حسین فەوزی بووبە سەرۆکی سەرەوای سوپاو منیش یاریدەدەری ئەوو بەرێوەبەری لقیەك واتا کارگێری (حرکات)یش بووم ، ئەوساکە رشید عالی سەرۆکی دیوانی مەلیك غازی بوو • مەلیك غازیو نوری سەعید یەکتریان خۆش نەئەویست، جگە لەوەی مەلیك رقی لەئنگلیز ئەبووەوەو لەو ئیستگەیەوە کە لە کوشکەکەیدا داینابوو ، لەسەر مەسەلەی فەلەستینو وڵاتانی تری عەرەب هێرشی ئەبردنە سەر ئەیویست کوێتیش بخاتە سەر عیراق •

دوای ئەمانە ئەڵێت [١] :ـ

لە (٥)ی نیسانی ١٩٣٩دا ، مەلیك غازی بەدەسیسەی ئنگلیزەکان کوژرا ، عەبدول ئیلاهی ئاموزایو ژنبرای کرابە (وصی) چونکە زیاتر لەئنگلیزەوە نزیك بوو • کە ئنگلیز لە ئەیلولی ١٩٣٩دا جاڕی شەری دژی ئەڵەماندا ... نوری بە ئاگاداریی عەبدولئیلا پەیوەندی سیاسی عیراقی لەگەڵ ئەڵەمانیادا بڕی ، بەبێ ئەوەی پرس بە ئەنجومەنی نوینەرانو کەسیتر بکات ، هەربەوەوە نەوەستا نیازی ئەوەی بوو ، عیراق شانبەشانی ئنگلیز بخاتە شەڕەوە یا سوپا بنێرێت بۆ دەشتی لیبیا ، بەڵام قبوڵ نەکرا ... ئەمەو کوشتنی روستەم حیدر کە وەزیری مالیەی بوو ، بەدەسیسەی ئینگلیزەکان،

---

(١) لەکتێبی (فرسان العروبة فی العراق) یاخود یادداشتی سەلاحەدین سەباغ. هاورێکانی فهمی سعیدو کامل شبیبو محمود سلمان کە هەر چواریان پێشەوا (قادة) بوون لەسوپادا .

نوری سەعیدی تەنگەتاو کرد ، بریاری‌دا دەرچێ‌و هەر ئەویش رەشید عالی هەڵبژارد بۆسەرۆکی وەزارەت ، تەها پاشاش وەزیری بەرگری‌و خۆشی وەزیری دەرەوە لەگەڵیان ... هەرچۆنێك بوو گەیلانی سازکرا کە داواکە بهێنێتەجێ ... ئەوەبوو جگە لەوانەی پێشوو باسمان کردن ، ناجی شوکت بەوەزیری ناوخوو ناجی سویدی بە وەزیــری دارایی دانــران ... واتــا وەزارەتێکی گەلێك بەهێز بوو ... بەڵام ئەوەندەی نەبرد ناخۆشی کەوتــە بەینی نوری سەعیدو عەبدول ئیلا لەلایەكو بەینی گەیلانی لەلایەکی ترەوە.. بەجۆرێك (وصی) داوای دەرچوونی گەیلانی‌و نەمانی وەزارەتەکەی کرد.. گەیلانیش ئەیووت : من بەتکاو پارانەوەی خۆتان هاتوم .. ئــاوا بــەم شێوە ناشیرینە دەرناچم ... هەندێك لەوەزیرەکان بەقســەی ئنگلیزیــان کردو تەها هاشمیش بێ‌لایەن بوو ... هەموو دەرچوون ، بەڵام گەیلانــی هەر دەرنەچوو .. میللەت‌و زوربەی عەشــایەرەکەی لەگەڵدابــوون ... بەهــۆی ســەرۆکی ئەنجومــەنی ریش‌سپیــەکانەوە ... [1] توانیمــان (وصی) سازبکەین کە ئەو دوو وەزیرەی گەیلانی هەڵبــژاردن لەشــوێنی (نوری‌و ناجی شوکت) کە بریتی‌بوون لــە (یونس سبعاوی‌و علی محمــود شێخ علی) کە بریاریان لەسەربدا ... تاکو پێش‌ئــەوە (وصی) ســەرۆکی سەرەوای سوپاو ئێمە (واتا پێشەواکانی سوپای) [2] بانگ‌کرد .. (وصی)

(١) مەبەسی لە (سەید محەمەد سەدرە)ە کەبووبە سەرەك وەزیرانیش .

(٢) ئەو پێشەوایانەی کە ئەو دەمە دەستیان ئەرویشت‌و کاریان ئەکردە سەر سیاسەتی وڵات ئەمانە بوون :

ـ ئەمین زەکی سلیمان ، کوردێکی عەرەب خۆشەویست‌و بەئایین . دژی ئیمپریالیزم ، خۆی لەپێشدا پێشەوای فیرقەی دوهەم بوو ، بەڵام دوای (فریق رکن) حسین فەوزی بووبە جێگری سەرۆکی سەرەوای سوپا . لەراستیدا ئەم پیاوە تەنها رواڵەتیك بوو ئەگینا دەسەڵاتــی تەواوی نەبوو .

ـ سەلاحەدین سەباغ وەك خۆی لە یادداشتەکەیدا ئەڵێت لە بنچینەدا لەبنەماڵەی (صباغ)ی شاری صیدای لوبنانەو کوری علی کــوری

بەتورەبیەوە لێمان نزیك بوەوەو پێشوازی کردین ، رووی کردە سەرۆکی سەرەوای سوپا وتی : ئەمە چیە ؟

ئەویش وەلامی دایەوە : کەوا هیچ نی یەو ئەگەر رێگامـان ئەدەیـت

---

ابراهیم کوری مستەفا کوری یوسف کوری حاجی رضوان صباغ کەلە دمیاطی میسرەوە هاتۆتە لبنان ، باوکی سەلاحەدین لەسەدەی پێشودا هاتوتە موصلو لەوی دانیشتوەو ژنی هێناوە. سەلاحالدین لە موصل سالّی ١٨٩٩ هاتوتە دیناوە لە موصلو بیروت خویندنی تەواوکردوەو لەقوتابخانەی (حربیەی استانە) خویندنی سوپایی تەواو کردوەو لە شەری گەورەی یەکەمدا بەشداری کردوەو ملازمی دوهەم بوە لە حکومەتەکەی فیصلدا لە سوریا ، دوای شۆرشەکەی عیراقو دامەزراندنی حکومەت ، سالّی ١٩٢١ لەگەلّ چەند ئەفسەرێکی تردا نیرراوە بۆ عیراقو داخلی ئەو دەورەی ئەفسەرانە بوە کە ئنگلیزەکان کردیانەوە . یەکەم مامۆستای سواری بوە لە سوپای عیراقدا ، دوای ئەوە چۆتە ئەو دەورانەوە کە لە هندستانو ئنگلتەرە پێك هاتوون لەدوایدا لەدانشگای ئەرکانی شەر لەبەغداو دانشگای ئەرکانی ئنگلیزی لەکامبرلیو لەدەورەی ئەفسەرانێ پێشەوە لە (شیرلسن) دەرچوە . دوایئەوە بە مامۆستای کۆلێجی سوپاییو کۆلیجێ ئەرکان ، دامەزراوە ، ئنجا بووە بە سەرۆکی هێزی ئاسمانی ، دوای ئەوە یاریدەری سەرۆکی ئەرکانی سوپاو کارگێری حرکاتو لە سالّی ١٩٣٧دا بوە بە پیشەوای فیرقەی سێ . دوای ئەوەبوە بە پێشەوای فەیلەق کە لەفیرقەی یەکو سێو فیرقەی زرەیلی پێك هاتبو ، ئەمیش لەکاتی شەرەکەی بەینی عیراقو ئنگلیز . سەباغ لە هەرسێ پیشەواکانی (ئەمین زەکی سلیمانو کامل شبیبو فەهمی سەعید) بەدەسەلاتتربوو .

— کامل شبیب : سەلاحەدین سەباغ لە (فرسان العروبە)دا ئەلّێت : لە ١٨٩٥دا لە بەغدا هاتۆتە دنیاوە ، ملازم بوە لە سوپای عوسمانیو سوریاو لەدوایدا هاتۆتە سوپای عیراقەوە لە کۆلیجی ئەرکانی عیراق دەرچوە ، لە سالّی ١٩٤٠دا گەیشتە پلەی پێشەوای فیرقەی یەك ، لەرەگەزو هەستدا عەرەبەو دژی ئیمپریالیزمو ئنگلیزە ، بەلاّم خۆپەرستو خۆ خۆشەویستە ( سەباغ وا دیارە زۆر رقی لێی هەستاوە) ئەلی : خیانەتی (مبادیء)ی کردو بیرو بڕواکانی

ئەڵێن گەیلانی تکاتــان لێ ئــەکات کە لوتفتان هەبێت ••• بەتورەییەوە وەڵامی دایەوە کەوا ریگاتان نادەم ئەم باسە لەگەڵ من بکەنەوە ••• پشتی لێ هەڵکردین و رویشت ، دوای تۆزێك محەمەد سەدر هاتە ژورەوە وتــی ئەوە چی یە ؟ ئیمەش شتەکەمان عەرز کرد تکاشمان لێ کرد کەئاویك بــەم ئاگرەدا بکات ، وتی باشە من جێبەجێی ئەکەم ئێوە برۆن •• ئەوەبــوو لەدواییدا وەلامی لێ گیرانیەوە کە (وصی) ئاشت کردۆتەوە ••• ئیمــەش چوین دەستی (وصی)مان ماچ کرد ، بۆ سبەینی چوین بۆ سوپاسی سەیــد

---

لەبیر خۆی بردەوە چونکە ترسنۆك و خۆپەرست بوو کە ئەمانــە بوون بەهۆی ئەوەی لەشەرەکەمانــدا دژی ئنگلــیز بوەستــین و تیابشکێین (فرسان العروبە ل ٢٢) .

- فەهمی سەعید . (سەباغ) زۆری لێ رازیەو ستایشی ئەکات : ئەڵێ لە قەبیلەی (عنبك)ی نزیك بعفوبەیە ، بەڵام لە لایەکی ترەوە ئەڵێت لە سلێمانی لە ساڵی ١٨٩٨دا لەدایك بوەو عەرەبە ... دیسانەوە (سەباغ) ئەڵێ : زۆر ئازابوەو بروای بەخۆی بوە کە ئەمە خستیــە هەڵەیەکی (سوقی) گەورەوەو پێچەوانەی فرمانی من جوڵایەوە ، کە ئەوە بووبە هۆی شکاندنی سوپاکەی عیراق لە (سن الذبــان). فەهمی ملازم بوە لەسوپای عوسمانی و سوریاداو لەدواییدا هــاتە سوپای عیراقەوە . لەکاتی شەری بەینی عیراق و ئنگلیز پێشەوای فیرقەی سێ بوو . لە دەرچوانی کۆلێجی ئــەرکانی عــیراق بــوو (فرسان العروبە ل ٢٢) .
- مەحمود سەلمان : ساڵی ١٨٩٨ لە بەغدا هاتۆتە دنیاوە . ملازم بوە لە سوپای عوسمانی و سوریاداو لەدواییدا هاتۆتە سوپای عیراقەوە. (مرافق)ی مەلیك (فیصل)و (غازی) بوە . لە سەرەتادا لەبەشی سواری دا دەستی پێ کرد ، تاکو بووبە (آمر کتیبە) لە دواییدا واتا لە ساڵی ١٩٤٠دا بووبە پێشەوای هێزی ئاسمان . یەکێك بوو لەوانەی داوای دانانی عەبدول ئیلاهیــان بــە ( وصی ) کردو دژی (بەکر صدقی) بوو (فرسان العروبە ل ٢٥) .
- یونس سبعاوی : لە عەشــیرەتی (طی) ، لە قوتابخانــەدا هەمیشــە یەکەم بوە تاکو کۆلیــجی (حقــوق)ی تــەواوکردوەو نوینــەربوە لەپەرلەماندا . لەتەمەنی (٣٥) ساڵی دا بووبــە وەزیــر لەهــەردو وەزارەتەکەی رەشید عالی دا (فرسان العروبە ل ١٥) .

سەدر لەماڵەوە ••• جا ، کە سەید سەدر لە شایەتیەکەیدا ئەڵێت ئێمە بە دەمانچەوە چوینەتە لای (وصی)و هەڕەشەمان کردوە ، [1] هیچی ڕاست نیە ، نە دەمانچەمان پێبوەو نەئەویش لەگەڵ (وصی)دا ، ئێمەی لەوکۆبونەوەیەدا دیوە ••• دوای ئەو ڕێككەوتن‌و ئاشتیەیە ••• زۆری پێنەچوو وتیان وصی ڕای‌کردوە بۆ دیوانیە تاکو لەویوە فیرقەی چوارو عەشایەر هەڵفریوێنێ ••• ئەمە وای لەگەیلانی‌کرد کە (استقالە) بەبروسکە بە (وصی)بدا لەدیوانیە ، ئەویش هەر لە دیوانیەوە تەها هاشمی بانگ کردو داوای لێ‌کرد وەزارەت پێك بهێنێت ، هاشمی لەمانگی کانوونی دوهەمی ١٩٤١دا وەزارەتی پێك‌هیناو تا مانگی نیسانی ئەوساڵەی خایاند ، تەها پاشا پیاوێکی خۆشەویست بوو لای گەل‌و سوپا ••• بەڵێ (وصی) ئێمەی بەوە گوناهبار کردوە ، گوایە تەنگمان پێ هەڵچینوە ، بۆیە ئەویش خۆی دەرباز کردوە بۆ دیوانیە • جا ئەگەر ئەمە وابوایە ، ئێمە نەمان ئەهیشت بگاتە دیوانیە ، هەر لەپێشەوە ئەمان نارد لەکۆشکەکەی خۆیدا بیگرن ، یاخود بیخەنە ژێر چاودێریەوە • ئەمەیان وەها ، لەکاتی تەها پاشاشدا ، زۆر تکای لە وصی کرد کە ئێمە بەرێتە لای دەستی ماچ بکەین‌و ئاشت‌بێتەوە لەگەڵمانداو هیچ لەدڵیدا نەمێنێت ، بەڵام بێ‌سوود بوو ، وصی ئەیووت من نەسوپاو نە ئەو پێشەوایانەی سوپام خۆش ناویت‌و نامەوێ بیان بینم [2] •

کەوابوو ئێمە تا تەها پاشا لەسەر حوکم بوو چاومان بەچاوی (وصی) نەکەوت ، هەرچیەك لەم کاتەدا دراوەتە پاڵمان بەرامبەر بە (وصی) گشتی هەڵبەستی ناحەزەکانمانن •

کە وەزیری دەرەوەی بەریتانیا مستر ایدن هاتە قاهیرەو وەزیری دەرەوەی خۆمانی لەوێ دیبوو ئەمانەی لێ داواکردبوو :

---

(١) لە لاپەڕەکانی دواوەدا ئەمانە زیاتر روون ئەبنەوە ـ سەرچاوەی پێشوو
(٢) سەرچاوەی پێشوو .

١ــ عيراق پەیوەندیی سیاسیی لەگەڵ ئیتالیادا ببڕێت ٠
٢ــ ڕێ بدرێت سوپای ئنگلیز لەخاکی عیراقدا کۆببێتەوە ٠
٣ــ دەربڕینی ناحەزیی ئنگلیز بەرامبەر بەپێشەواکانی سوپای عیراق ٠

جا بۆ ئەوەی (وصی)و پیاوەکانی تری ئنگلیز ئەم فرمانانەی ئاغایان بهێننەدیی ، (وصی) کەوتە برروبیانوو لەتەها پاشا ، بەتایبەتی ویستیان ئالوگۆڕێك لەبەینی پیشەواکانی سوپادا بکەن ٠ ئیتر تەها پاشا (استقالە)ی خۆی پیشکەش‌کردو سوپاو گەل ، ناوی ڕەشید عالی‌یان هینایەوە ناوناوان٠ (وصی) ڕای‌کردەوە بۆ ناو سوپای ئنگلیز لەحبانیە [1] ٠

من لە وەڵامی بەیانەکەی وصی‌دا ئەلیم : وصی‌و نوریو جودت‌و جمیل کە هەموو سەر بە ئنگلیزبوون [2] ئەگەر بمان‌ویستایە بیان‌گرین ، بە ئاسانی ئەمەمان بۆ ئەکرا چونکە لەبەر دەستماندا بوون جگە لەوەی گەل‌و سوپامان لەگەڵ بوو ٠

هەروەها (وصی) لەبەیانەکەیدا ئەڵێت کەوا خۆی گەیاندوتە ماڵی (امیرە صالحە)ی پوری کە لەناو بەغدادابوو بۆ خۆ دەربازکردن، لەوێوە خۆی گەیاندۆتە لەشکرگای ئنگلیز لەرۆژراوای بەغدا [3] جا ، ئەگەر وەك ئەڵێت : ئێمە دەوری کۆشکەکەیمان گرتبایەو دەستمان بەسەر بەغدادا بکێشایەو تانك‌و هێزمان لەم سەرەو سەری پردەکان دابنایە ، (وصی) چۆن لەکۆشکەکەی خۆیەوە بەسەر پردێکا ئەپەڕیەوە بۆ ناو بەغدا بەرەو ماڵی پوریو لەوێوە جارێکی‌تر ئەپەڕیەوەو بەرەو لەشکرگای ئنگلیزەکان (لەحبانیە) خۆی دەرباز ئەکرد [4] ٠

(١) سەرچاوەی پێشوو .
(٢) مەبەسی لەنوری سەعیدو عەلی جەودەت ئەیوبی‌و جەمیل مەدفەعی‌یە کە هەموو هەر یەکە چەند جارێك سەرەکی وەزیران بوون .
(٣) واتا لە حبانیە .
(٤) سەرچاوەی پێشوو .

سوپا ، دوای راکردنی (وصی) بۆ (حبانیه) ، لەویوە بۆ بصره ...
داوای لەرەشید عالی کرد کە وەزارەت پێك بهێنێت ، ئەمە لەکاتێکدا کە شەری بەینی عیراق‌و ئنگلیز لەمرۆو سبەینێ‌دا بوو کە هەلگیرسێت ، ئیتر کە رەشید عالی بوو بەسەرۆکی وەزیران زۆری نەبرد ئەم بەیانەی دەکرد :

**بۆ گەلی عێراقی بەرێز (١)**

گەلی عیراق ئەزانێت ، کەوا حکومەت زۆر تەقەلای‌دا ، کە کارێکی وانەکات ، ببێ بەهۆی لادان لەپەیمانی بەینی عیراق‌و بەریتانیا ، بەلکو هەر تێکوشاوەکە یارمەتی‌بداو رێگا خۆش بکات‌و خۆی لەشەرو بەیەکدادان لەگەل حکومەتی بەریتانیا دوور بخاتەوە ، بەلام بەریتانیاییەکان ، کردەوەی وایان ئەنواند کە هیچ لەگەل ناوەرۆکی پەیمانەکە رێك نەئەکەوت‌و مافی ولاتی عیراق‌و ئاسایشیان پێ‌شێل ئەکرد ، ئەمە وای لە حکومەت کرد ، کە بە ئەرکی سەرشانی خۆی بەرامبەر بەگەل هەستێ‌و چی‌پێویستە لەرووی بەرگری‌کردن لەولات بیکات . ئێمە چەند بەهێمنی‌و لەسەرخۆ جولاینەوە سوودی نەبوو ، چونکە بەریتانیا وەك دوژمنێك بەرامبەرمان وەستاو هێزەکانی لە (حبانیه) تەقەیان لەو هێزانەی عیراق کرد کە لەو ناوەدابوون ، ئەمەش وای لەو هێزانەی ئەو شوێنانەمان کرد کە بکەونە بەرگری خۆیان‌و بەتەقە وەلامیان بدەنەوە .

بەم جۆرە ، وا شەر دەستی پێ‌کردو هەر ئێمەش سەرئەکەوین ، حکومەتیش داوا لە گەلی عیراق ئەکات ( کە هەمیشە ژیری‌ی خۆی لەرووی رامیاری‌یەوە لە ناخۆش‌ترین کاتدا دەربڕیوە ) بروای بە سوپا نیشتمانیەکەی هەبێت کە بۆ پاراستنی‌و لات‌و ئاگاداری‌ی کەرامەت‌و مافی گەل راپەریوەو لەهەمان کاتدا خۆیان بگرن‌و هیچ کارێکی ئەوتۆ نەکەن کە دەست درێژی

(١) لە (الکتاب الابیض) ، نجم‌الدین سهروردی چاپخانەی (دار الزمان ـ بغداد ) ١٩٦٦ .

لێبوەشێتەوە بۆ سەر میوانە بێگانەکانمانو بەبێ دەنگ دانیشنو دلنیاش بن لەسەرکەوتن •

بەغدا رۆژی ٢ی مایسی ١٩٤١ •

رەشید عالی گەیلانی
سەرۆکی وەزیران

دوای ئەم بەیانە کورتەی سەرۆکی وەزیران بە پیویستی ئەزانین بێینە سەر ئەو خالانەی یەکسەر بوون بە هۆی هەلگیرساندنی شەرەکەی مایس •

**هۆیەکانی شەری مایس ١٩٤١ :**

هۆی هەلگیرساندنی شەری مایس زۆر شتەو لەگەلیك کتێبو سەرچاوەدا روونکراوەتەوە [١] ، بەلام هۆیەکسەریەکانی بەکورتی ئەمانەبوون [٢] :

یەکەم : ئنگلیزەکان لوتیان ئەژەنە هەموو کاروبارێکی عیراقەوەو حکومەتەکانی عیراقو عەبدول ئیلاهیان کردبوو بە دەسکەلای دەستی خۆیان ، چییان بویستایە پێیان ئەکردن •

---

(١) وەك : ـ الاسرار الخفيه لحركات السنه ١٩٤١ ـ عبدالرزاق الحسنى .
ـ اسرار (٢) مايس ١٩٤١ والحرب العراقيه الانكليزيه ـ يونس بحرى . مطبعة الحرية ـ ١٩٦٨ •
ـ الكتاب الابيض . نجم‌الدين السهروردى . دار الزمان بغداد
ـ حوادث العراق فى سنة ١٩٤١ ت ١٩٦٦ جعفر خياط .
ـ حركات مايس ٩٤١ ت ، العقيد ابراهيم عبدالغفور .
ـ الفتنة العمياء .
ـ مذكرات طه الهاشمى .
ـ حركة رشيد عالى الكيلانى ـ عثمان كمال ...

(٢) لە (الكتاب الابيض)و (اسرار ٢ مايس ١٩٤١) وەرگيراوە .

دوهەم : دەرچوونی ئنگلیزەکان لەسنوری ئەو پەیمانەش کە خۆیان دایان نابوو ، هەروەها پێ شێل‌کردنی یاساکانی عیراق •

سێهەم : یارمەتی نەدانی عیراق ، بەتایبەتی لەچەك‌و جبەخانەدا وەك لەپەیمانەکەی بەینی هەردولادا هەبوو •

چوارەم : زۆرلێکردنی ئنگلیز لەعیراق کەپەیوەندی لەگەڵ ئەلەمانیادا ببڕیت‌و خۆشی بهاوێتە ئاگری شەڕەوە ، بێ‌ئەوەی عیراق هیچ بەرژەوەندیەکی لەو شەڕەدا هەبێت ، ئەمە لەکاتێکدا کە هتلر بەرامبەر بە عیراق‌و عەرەب هیچ دوژمنایەتیەکی نەگرتبوو دوستایەتی نەبیت ، یاخود ئەیویست پەیوەندی لەگەڵیاندا پەیدابکات‌و یارمەتیان بدا •

پێنجەم : جموجوڵی هێزەکانی ئنگلیزو فڕۆکەکانی بە ئاسمانی عیراقداو ناردنی هێزی سوپایی بۆ (سن الذبان) ، هاتو چۆی ئەفسەری (استخبارات) بەشێوەیەکی ئەوتۆ رقی گەلی عیراق هەستێنێ بەجۆرێك دژی پەیمانەکەی بەینی هەردولاش بێت •

شەشەم : پێگەیشتن‌و هاتنی چەند ئەفسەرێکی ئەوتۆ لەسوپای عیراقدا ، کەدوای بەکر صدقی کاروباریان گرتەدەست‌و گەیشتنە پلەی پێشەوایانی سوپاو نەتەوایەتی عەرەب لەخوێن‌یاندا قوڵپی‌ئەدا ، ئامادەبوون گیانی خۆیانی بۆبکەن بە قوربان •

حەوتەم : گەلێك شتی تر کەلێرەدا ماوەی باس‌کردنیان نی‌یە •

لە رۆژی ٢٨ مایسی ١٩٤١دا ، لەکاتێکدا کە هێزەکانی ئنگلیز ، (دوای بەرگریەکی پاڵەوانانەی سوپا تازە پێ‌گەیشتوەکەی عیراق ) نزیك بەغدابوونەوە ، (شریف شرف) کەلە شوینی عەبدول ئیلا بوبوو بە (وصی) لەگەڵ رەشید عالی‌و ئەندامانی حکومەت‌و پێشەواکانی سوپا بەغدایان بەجێ هیشت‌و دایانە دەست لیژنەیەکی سێ‌کەسی کەبریتی بوون لە

(ارشد العمری) ئەوسا (امینی عاصمە) بوو بە سەروکی لیژنەکەو (حسام‌الدین جمعە) بەڕێوەبەری گشتی پۆلیس‌و (خالد الزهاوی) کە متصرفی بەغداو زەعیم رکن حمید نصرت ئەندامی لیژنەکە بوون ئەمانەش لیژنەی ئاسایشی ناوخۆیان پێ ئەووتن ، کە ئەوانیش لە (۳۱) مایسی ئەوساڵەدا مەرجەکانی شەڕوەستان‌و رێك‌کەوتنیان مۆر کرد [١] •

وەك‌وتمان پیاوە سیاسیەکان‌و پێشەواکانی سوپا ، عیراقیان بەجێ‌هێشت‌و رۆژی ۲۹ی مایس لەسنوری ئێران وەك پەنابەری سیاسی ، چوون بەودیوا، لەوانە مفتی فەلەستین حاجی ئەمینی حوسەینی کە بەینێك بوو هاتبووە عێراقەوە بەهۆی بالیوزخانەی ژاپۆنەوە لەتاران خۆی گەیانده تورکیا لەویوە بۆ ئیتالیا ، هەروەها رەشید عالی توانی خۆی دەرباز بکات بەرەو ئەلەمانیا ، ئەوانی‌تر وەك شەریف شەرەف‌و عەلی مەحمود شێخ عەلی‌و ئەمین زەکی (سەرۆکی سەرەوای سوپا)و سەلاحەدین سەباغ‌و کامل شبیب‌و فەهمی سعیدو محمود سلمان‌و یونس سبعاوی‌و صدیق شنشل‌و چەند کەسێکی‌تر ، کەئەوانیش دوای داگیرکردنی ئێران لەلایەن ئنگلیزەکانەوە دەردەست‌کران نێرران بۆ (رودیسیا) لەخوارووی ئەفەریقا ، سەلاحەدین سەباغ نەبێت کە لەئێرانەوە وەك خۆی لەیادداشتەکەی‌دا ئەلیت ، تاك‌و تەنها ، بەپێ‌و بەناو مەترسی‌ی ریگاو شاخ‌و بەفرو درندەو پیاو خراپدا کەوتە رێ تا بەکولەمەرگی خۆی گەیاندە تورکیا •

دوای‌ئەوە سەلاحەدین سەباغ لە یادداشتەکەیدا ئەڵێت [٢] :

لەبەینی نیسان‌و حوزەیرانی ١٩٤١دا (شەریف شرف)ی خالی عەبدول‌ئیلا بووبە (وصی)و وەزارەتی گەیلانی پێك هاتوو شەری بەینی عیراق‌و ئنگلیز دەستی پێ‌کرد • عەبدول ئیلاو نوری سەعیدو جەمیل مەدفەعی‌و عەلی

---

(١) الکتاب الابیض .

(٢) لە (فرسان العروبە فی العراق)دا .

جەودەت بەفڕۆکەیەکی ئنگلیز خۆیان گەیانــدە بەسرەو لەوێــوە بــۆ دو (پاپۆری جەنگی)ی بەریتانیا کە لەئــاوی بــەسرەدا لەنگەریــان گرتبــوو عەبدول‌ئیلا لەبەسرە دەستی‌کرد بە نامەناردن بۆ ســەرۆکەکانی عەشــایەرو موتەسەریفەکانی ئەوناوە ، جــگە لەوەی ئێستــگەیەکی ئنگلــیزەکانیش لەشۆێنێکی نەزانراوەوە بەناوی‌ئەوەوە قسەی ئەکرد ... کە رۆڵەکانــی گەل بەمەیان زانی ، دەستیــان‌کرد بــە خۆپیشانــدان دژی عەبدول‌ئیــلاو بەداوین‌پیس‌و بەدنمەکیان ئەدایە قەڵەم . حکومەتی رەشید عالی ئەندامەکانی هەردوو ئەنجومەنی نوێنەران‌و ریش‌سپیانی کۆکردەوەو هەموو دەنگیــان لەسەر لابردنی عەبدول‌ئیلاو دانانی (شەریف شرف) لەشوینی‌دا . عەبدول‌ئیلا دوای ئەوەی دەرۆژ لە پاپۆرێکی دەریایی ئنگلیزدا مایەوە ، ئەوسا بەبیستنی لابردنی ، بەسرەی بەجێ‌هێشت بەرەو فەلەستین‌و لەوێــوە بــۆ لای مــیر عەبدوڵلای مامی لە (شرقی ئوردون) ... رویشت .

دوای ئەوە سەباغ ئەڵێت : زۆر لەدەوڵەتانی وەك ئەلمانیــاو ئیتالیــاو یابان‌و رومانیاو بلغاریەو مجر دانیان بەو حکومەتە نوێ‌یەمان‌دا نا کە رەشید عالی پێکی هینایەوە دوای هاتنی (شەریف شرف) ، تەنها ئەمەریکاو ئنگلیزو هەندێ دەوڵەتی تر نەبێت کە ئەوان دانیــان بە حکومەتەکەمــاندا نەنــا . ئنگلیزەکانیش بیانویان ئەوەبوو کەوا تاکو ئێمە پەیوەندی لەگەڵ دەولەتەکانی ( محور ) نەبڕین‌و ڕێگا بەسوپای بەریتانیا نەدەین بێنە عیراقەوە ، ئــەوان دان‌مان پیدا نانین .

ئنجا سەلاحەدین سەباغ دوای ئەوەی باسی کۆبونــەوەی هێزێــکی زۆری ئنگلیز ئەکات لە عێراقدا کە لەدەرەوە بۆی هاتن ئەڵێت : سەیرمــان کرد ، واشەر یەخەی گرتوین ، فرمان بۆمن دەرچوو ، بووم بە پێشــەوای (جبهە)ی رۆژاوا ... شەر نزیــکەی مانگێــکی برد ... لەبــەر ئــەوەی

ئەمانزانی کە ئێمە بێهێزینو بۆ ئەوەی خوێن نەرژێتو گیـانو موڵكو ماڵ بپارێزین وازمان هێنا ، خۆ ئەگەر بمانویستایە لەسەرجەنگ برۆیـن ئەمان توانی شەش مانگێك دەربەرینو خۆمان بگرین ، بەڵام خۆشەویستی‌ی نیشتمان رێ‌ی ئەمەی نەئەداین ... گەیلانی‌و ئەندامەکانی وەزارەتەکەی‌و پێشەواکانی سوپا ، هەمو رووومان کردە ئێران ... ئنگلیزەکان گەرانەوە عیراق‌و پیاوەکانی خۆیان گێرایەوە سـەر حوکـم ، لەژوور هەموویـانەوە عەبدول‌ئیلا ، هەردوای ئەوە ئنگلیز سوریاو ئێرانیشی داگیر کرد ، هەندیکمان لە ئێراندا لەلایەن ئنگلیزەکانەوە گیرانو نێررانەوە عیراق کە یا خنکاندیانن یاخود بەبەندی هێشتنیانەوە ، هەندێکیشیان ناردنە خواررووی ئەفریقا ... منیش تۆ مانگ بە بەبرسیەتی‌و ئەوپەری هەژاری لە ئێراندا بەسەرماو بەفری شاخەکاندا شەقاوم ئەنا تاکو لـە دووی مـانگی نیسـانی سـالی ۱۹٤۲دا ، هەرچۆنێك‌بوو خۆم گەیاندە تورکیا .

( بەرگری سەلاحەدین سەباغ لەیادداشتەکەیدا ) (۱)

سەبـاغ ئەڵێت :

پێش‌ئەوەی ئەو گوناهانەی دراونەتە پالم پوچ بکەمـەوە کەپـررن لەدرۆ دەلەسە ئەڵێم : من پارێزەر نیم ، پارەشم نی‌یە پارێزەر بگرم تـاکو بەرگریم بکات ... بەلام بڕوام وایە کە دادگا پارێزەری راستگۆیـانە ، ئنجا ئەڵیم :

۱ــ پیش پێنج مانگ دادگای تورکیا داوای عیراقی گێڕایـەوە کـە بمدەنەوە دەستیان تاکو بمخنکێنن ، چونکە کارەکەی منیان بەکردەوەیەکی سیاسی دانا ، پیاوەکانی ئنگلیز کە ئەم وەلامەیان پێ‌گەیشت ، دەستیان‌کردەوە

(۱) ئەم بەرگری‌یەی سەبـاغ لەدورەوەیـە ، دوای ئـەوەی کە لەپـاش‌ملە تاوانبارکراوەو حوکم‌دراوە . سەیری لاپەرەکانی لە ۲۷۰وە تادوایی لـە (فرسان العروبه فی العراق) بکە .

به ئاراستەکردنی هەر ئەو گوناهانەی جاری پێشوتر ئاراستەیان کردبووم ، جا ئایا یاسـا رێی ئەوە ئەدا کە فرمـانی خنکاندن لەسـەریەك تومـەت دوجار دەربچێت ؟

٢ــ لە ئێستگەی بیروتو بەغداو لەروژنامەکانی پێش دوو هەفتەدا ئەمە بلاوکرابوەوە :ــ

بۆ عقیدروکنی (متقاعد) سەلاحەدین سەباغ

پێویستە لەبەر دەمی ئەم دادگایەدا بوەسـتی ، تاکو وەلامـی ئـەو گوناهانە بدەیتەوە کە دراونەتە پالت ، بەگوێرەی مادە ( ٣٠ و ٤١ ) لە یاسای سزای سوپایی • جا ئەگەر تا (٣٠) رۆژ لـەرۆژی بلاوکردنـەوەی ئـەم بانگەوازەوە نەهاتی ، لەپاشملە دادپرسینەوەت دەست پێئەکات ، فەرمانی سەندنەوەی هەموو مافێکی شارستانیت دەرئەچێتو دەستبەسەر هەمـوو ماڵو ملکتا ئەگیرێت ، گشت فەرمانبەرانیش رائەسپێررین کەبتگـرن ، جگەلەوەی گشت کەسێکیش ناچارە بەگوێرەی یاسا ، ئەوانەی کەشوینت ئەزانن ، سوپـا ئاگاداربکەن بەپێی مـادە (٥٨) لەیاسـای چۆنیـەتی دادپرسینەوەی سوپا •

زعیم روکن •
سەرۆکی دادگای سوپایی فیرقەی یەکەم •

ئەم بانگەوازە کاتێك بلاوکرایـەوە کە دادگـای تورکـیا وەلامـی نەدانەوەی منی دایەوە بە عیراق ، ئەمەش بۆ ئەوەبوو کە بگیرێمو ملم بکەن بەپەتەکەوە •••

٣ــ مادە نۆی یاسای سزای تورکیا ئەلێت : (ئـەگەر دەولەتێـکی

بێگانه داوای گوناهباریکی سیاسیانکردەوه که هاتۆتــه تورکیــاوه ، نایاندرێتەوه ...

٤ـ ئێمه حکومەتی نوری سەعید له عیراقدا ، هەروەها (وصایەت)ی عەبدولئیلا له عیراقدا ، به شەرعی نازانین .. زۆر لەدوڵەتانیتریش جگه لەدەوڵەتەکانی (محور) دانیان پێدا نەناون ... واتا (شەریف شرف) (وصی شرعی)یەو حکومەتی گەیلانی حکومەتی شرعییە چونکه لەسەر خواستی میللەت هاتوون ...

دوای ئەوه سەلاحەدین سەباغ ، ئەو تومەتو گوناهانه وردئەکاتــەوه که دراونەته پاڵی ئەڵێت :

ئەم گوناهەی دوایی بریتیه لــەسێ بیانووی درۆ کــه گوایــه مــن دەستدرێژیم کردۆته سەر عەبدولئیلا :

١ ـ گوایه من قسەی رەقم لەروویا کردوەو هەرەشەم لێکردوه .

٢ ـ گوایه منو هاورێکانم دەمانچەمان هەڵگرتوه کەچوینەته لای (وصی) که ئەمەش تەنها لەقسەکانی سەرۆکی ئەنجومەنی ریشسپیەکاندا هاتوه.

٣ ـ گوایه سەرۆکی ئەنجومەنی ریش سپیان به ئیمەی وتوه کەوا میللەت سەرچاوەی هێزه نەك سوپا ...

ئەمەبوو گوناهەکەی ئەمدواییه ، بەڵام گوناهەکانی یەکەم جار بەقسەی سەبــاغ خۆی ئەمــانەبوون که لەســەر ئــەوەش فرمــانی خنکاندنیــان لەپاشملەدرا ، ئەڵێت گوایه :

١ ـ نەمان هێشتوه ئەوکەسانه یاخود ئەو وەزارەتانه بێنه ســەرکار کــه سەر به ئنگلیز بوون .

٢ ـ (وصی) پێشومان لابردوەو یەکێکی ترمان لەشوینی داناوه .

٣ ــ سەرۆکایەتی سوپاو گەلمان کردوە بۆ شەر دژی ئنگلیز .

دادگای سزا لەسیواس رۆژی ١٠ی حوزێران ١٩٤٢ گۆیی لەقسەکانم گرتو لەگەڵ ئەو گوناهانەدا کەدراونەتە پالم ، بەراوردی کردن ، فرمانی دەرکرد کە گوناهەکانم رامیارین‌و بریاری نەدانەوەی بە عیراقدا ... عیراق وازی نەهێنا جارێکی‌تر گوناهی دایەوە پالم کە ئەویش دەست درێژکردنــە سەر (وصی) بوو ، بۆ ئەوەی گوناهەکەم لەشێوەی (سیاسی) بەدەربێت... ئەم رێگایە کە گرتویانە زۆرداری‌و ناپاکی‌یان ئەگەیەنێت ، ئەبوایە تەریــق بونایەتەوە کە بەم شێوەیە داوای من لە تورکیا بکەنەوە ... نازانم ئــەم گوناهانە بەگوێرەی یاسان یان‌نا چونکە من شارەزای یاسانیم ، بۆیە ئەمــە ئەدەمە دەست دادگا ... ئەگەر یەکێك بوومایە سەر بەئنگلیز ئێستا لەماڵی خۆماو لەناو ماڵو منداڵمدا ئەبووم ، مانگانەی زۆرم ئەخستە گیرفانم ، بەڵام ئێمە خۆمان‌کرد بەقوچی قوربانی ، پێش نۆمانگ دەروێش پۆش چیــاکانی ئیرانم بەهەژاری ئەبڕیی ، بەناو سوپای ئنگلیزو روسدا خۆم دەربازکرد تا گەیشتمە تورکیا ... من نەگوناهباری عادی‌و نەگوهباری سیاسیم ، چونکە دەست‌درێژیم نەکردۆتە سەرکەس ، تەنها ئەوەندە هەیە سەربازێکم نیشتمان پەروەرو دژی ئنگلیز...بیری رۆشنم‌و کردەوەی پاکم، رێی ئەوەم نادەنی نەخۆم‌و نەبهێلم هاورێکانم دەست‌درێژی بکەنە سەر عەبدول‌ئیلا ... چونکە رودانی کاروبار لە عیراقدا کەلە شەش ساڵ لەوەپێشەوە بۆمان مــابوەوە ، پێویستیان بەوە نەدەکرد ، کە ئەوەش لە کۆدەتاکەی (بەکر صدقی)یــەوە دەستی پێ‌کرد [١] .

بەکورتی : کاربەدەستانی عێراق پێش پێنج مانگ لە تورکیا داوایان کردمەوە تاکو لەسەرم بدەن ، بەڵام قسەکەیان خرایە پشت‌گوێ ، چونــکە

---

(١) فرسان العروبه .

من له توركیادا په‌نابه‌ری سیاسی بووم • دوای ئه‌وه‌ی به‌م جۆره‌ش ده‌ست به‌رووبانه‌وه نرا ، ئنجا گوناهێکی که‌یان دامه‌پاڵ که له‌باری سیاسی ده‌رچێت‌و ببێت به گوناهیگی ئاسایی که گوایه من‌و هاورێکانم زمان درێژیمان به‌رامبه‌ر به (وصی) کردوه ، که ئه‌مه‌ش وه‌ك له‌مه‌وپێش وتم درۆیه، ئنگلیزو پیاوه‌کانی ئه‌مه رێك ئه‌خه‌ن چونکه له‌خۆیان ئه‌ترسن ، ئه‌زانن ئه‌گه‌ر ئێمه بمێنین ، هه‌میشه گه‌ل‌و سوپامان له‌گه‌ڵدان‌و دژی شکاندنی په‌یمانه‌که‌ی به‌ینی عیراق‌و ئنگلیزین • ئێمه به‌رگری‌ی گه‌ل‌و نیشتمان‌و حکومه‌تی شرعی‌مان کردوه ، ئێمه خوێنمان له لووتی یه‌ك که‌س نه‌هێناوه ، ده‌ست درێژیمان نه‌کردۆته سه‌رکه‌س ، له‌به‌ر ئه‌وه هه‌رچی شتێك دراوه‌ته پاڵم‌و هه‌رشتێك له‌دژی من رێك‌خراوه ، هه‌ربه‌یانێك ده‌رچوه ، به‌تایبه‌تی به‌یانه ره‌سمیه‌که‌ی (وصی) هه‌مووی درۆن‌و ئه‌یانه‌وی دادگه‌ری توركیا بخه‌ڵه‌تێنن که بمده‌نه‌وه ده‌ستیان ، ئه‌گه‌ر له‌گه‌ڵ ئنگلیزدا بومایه رۆژم به‌م رۆژه نه‌ئه‌گه‌یشت ، ئێستا له‌پله‌ی به‌رزو شوێنی خۆشدا ئه‌بووم • به‌ڵام خۆم‌و هاوریکانم هه‌ریه‌که خۆمان‌و ماڵ‌و منداڵمان به‌لایه‌کدا بێجگه له‌وانه‌ی ملیان کرا به‌په‌تا ، بێ‌نان‌و به‌رگ به‌کوله‌مه‌رگی ئه‌ژین ، هه‌مووی له‌رێی نیشتماندا [1] •

پاره‌م نیه پارێزه‌ر بگرم ، هێزی ئنگلیزیشم له‌دواوه نی‌یه بم پارێزێت ، هیچ هێزێکم له‌گه‌ڵدا نیه خوای گه‌وره‌و عداله‌تی ئه‌و کاره‌نه‌بێت که سه‌ری خۆمم له‌رێدا پێشکه‌ش کردوه [2] •

**بریاری دادگای سزا له‌توركیا :**

عقید سه‌لاحه‌دین سه‌باغ که ئیستا له‌سیواس ده‌س به‌سه‌ره‌و که پێشه‌وای فیرقه‌ی سێ‌هه‌م بوو له‌سوپای عیراقدا له‌کاتیکدا که رشید عالی گه‌یلانی

---

(۱) سه‌رچاوه‌ی پێشوو .
(۲) سه‌رچاوه‌ی پێشوو .

سەرەك وەزیران بوو ، ئەو پیاوەی کەویستی سیاسەتی عیراق بەگوێــرەی پەیمانەکەی بەینی ئنگلیزو عیراق بەریوە بەرێــتو دژی ئنگــلیز وەســتاو هێزی چەکداری بەرامبەریان بەکارهێناو حکومەتی هەڵگیرایەوە ، لەدواییدا لەشەردا شکاو خۆی کێشایە دواوە • جا ، بەگویرەی ئەوبریارەی لەرۆژی ١٩٤٢/١/٦دا لە ئەنجومەنی عورفی سوپاییەوە لەبەغدا درچوەو فەرمــانی خنکاندنی ئەم پیاوەی بەگوێرەی مادە (٨٠) لە یاسای سزای بەغدادی داوە، لەسەر ئەوە حکومەتی ئێستای عیراق بەنوسراوی ژمارە ١٧٨/٤٨٦ی رۆژی ٩٤٢/٦/٢ داوای لە وەزارەتی دادی تورکی کردوە کە نــاوبراوی بــۆ بنێرێتەوە تاکو بیخنکێنێ •

ئێمەش بەگوێرەی مادەی (٩) لەیاسای سزای تورکیو بەگویــرەی ئەو دەسەڵاتەی یاسا داویەتی بەدادگاو بەگویرەی کاغــەزەکانی پێشوو ، بریارمانوایە کە پێشەوای (فیلق) لە حکومەتەکەی رەشید عالی گەیلانیدا ، بە پەنابەرێکی سیاسی دائەنرێتو مادە (٩)ی یاسای سزای تورکیا رێی دانەوەی نادات [1] •

داواکەری گشتی : بهاء سویسال
١٩٤٢/٦/٩

دوای ئەوە لەنامەکەی سەلاحەدین سەباغدا بۆ کورەکانی نزارو ربیعەو انماردا دەرئەکەوێت کەلەپاشدا تورکەکان داویانەتەوە دەست حکومــەتی عیراق ئەڵێت [2] :

تورکەکان بێئەوەی گوێبدەنە پەیمانی شەرەفو یاسای وڵاتەکەیان، بەیارمەتی هێزی سوریا ، لەسەر سنوری سوریــاو لەمەیــدانیی (اکبس)

---

(١) سەرچاوەی پێشوو .
(٢) سەرچاوەی پێشوو .

دایانمەوە دەست ئنگلیز ، پیاوەکانی سوریاو عەرەب زۆرباش ئەیزانن ئەگەر من هەر بەتەنها عیراق پەرستبومایە ئێستا لە عبدولئیلاهو نوری سەعید، لای ئنگلیزەکان زیاتر ئەبووم ، بەڵام خۆ فیداکردنم لەرێی سوریاو فەلەستینی خۆشەویستدا گەیاندمیانە ئەم رۆژە • پیاوە نیشتمانپەروەرکانی سوریا وەك (قوتلی) و (مردم) و (جابری) ئەمە زۆر باش ئەزانن ، چونکە ئەوان لەکاتی تەنگانەو لێقەومانا روویان ئەکردە عیراق لای سەلاحەدینو هاورێکانی ، نەك روبکەنە نوریو عبدولئیلا • کورەکانم : خەفەت مەخۆن ، شوینی باوکتان بگرنەوە ، خوا ئاگادارمان بێت رۆلە جگەرگۆشەکانم • هەربژی عەرەب •

مەیدانی اکبس : باوکتان سەلاحەدین سەباغ رۆژی یەك شەممە ۳۰ ایلول ۱۹٤٥ •

ئەو فرمانانەی بەسەر رەشید عالیو سەلاحەدین سەباغو هاورێ کانیاندا لەلایەن ئەنجومەنی عورفی سوپاییەوە لە لەشکرگای رەشید لەپاشملە کە لەرۆژی شەشی کانونی دوهەمی ساڵی ۱۹٤۱دا درا بەم جۆرەبوون :

یەکەم : فرمانی خنکاندنی رەشید عالی گەیلانیو علی محمود شێخ علیو یونس سبعاویو فریق امین زکیو عقید سەلاحەدین سەباغو فهمی سعید ومحمود سلمان درا •

دوهەم : فرمانی ئیش بەچەوساندنەوەوە بۆ ماوەی پانزە ساڵ بەسەر ناجی شوکتو دو ساڵ بەندیەتی قورس بەسەر دکتور محمد حسن سلمانو پێنج ساڵ صدیق شنشلدا درا •

دوای ئەوە لە (١٥)ی ئازاری ساڵی ۱۹٤۲دا ، دەنگی بەدەستەوەدانی شۆرش گێرەکانی جولاّنەوەی مایس لەلایەن ئنگلیزەکانەوە ، بڵاوکرایەوە،

---

(١) لەکتێبی (اسرار (٢) مایس ۱۹٤۱) ل ٢٤٦ .

لەچواری مایسی هەر ئەوساڵەدا سەرلەنوێ ئەنجومەنی عورفی سوپاییان بۆکۆبوەوە بەو جۆرەی کەباسی ئەکەین ، لەم محاکەمەیەدا سەلاحەدین سەباغ ئامادە نەبوو ، چونکە خۆی نەدابوو بەدەستەوە ، بەڵام وەك وتمان ئەو فرمانی خنکاندنی درابوو …

جگە لەو کەسانەی ناومان بردن ، دیسانەوە ئەم نیشتمان پەروەرانەش هەر بە شۆرشەکەی مایس گوناهبار کرابوون :

شەریف شرف ، ناجی سویدی ، رەؤوف بحرانی ، موسی شابەندەر ، محمد علی محمود ، داود سەعدی ، عەبدول جەبار محمود شێخ علی ، عەبدولقادر گەیلانی ، عەبدولواحد حاجی سکر ، مشیر مزهر فرعون ، فریق مزهر فرعون ، مدلول عباس ، یحی ثنیان ، عەبدولعەزیز برکات ، خاشع راوی ، شاکر علی تکریتی ، محمود درە ، محمد طریحی ، فارس ناصر حسن ، توفیق مختار ، حسین جمیل ، کامل چادرچی ، جمال مفتی ، حازم مفتی ، عەبدوللا باشعالم ، عەبدول منعم غلامی ، زکی خطاب ، فائق سامرائیو هەندێکی تر (١) .

ئنجا بۆ ناو پەڕەکانی محاکەمەی ئەونیشتمانیانەی کەبەر دەست کەوتنەوە .

**بریاری تاوان دانەپال (٢)**

ئەنجومەنی عورفی سوپایی رۆژی ١٩٤٢/٥/٤ لە لەشکرگای (وشاش) بەسەرۆکایەتی عقید مستەفا راغبو ئەندامەکان حاکم عەبدول عەزیز خیاطو حاکم خەلیل ئەمینو عقید محمد علی سعیدو رئیسی ئەوەڵ عەبدوللا رفعت

---

(١) سەرچاوەی پێشوو . ل ٢٤٧ .

(٢) مدیریە الدعایە العامە ـ احکام المجلس العرفی العسکری فی فتنە شهری نیسانو مایس سنە ١٩٤١ ـ المکتبە الوطنیە رقم ٧٠٤ و ٩٥٦ ع ٨٢٢ .

نعسانی کۆبونەوە • بەناوی خاوەن شکۆ مەلیکی عیراقەوە ئەم بریارەیـان دەرکرد :

لەرۆژی ٦/١/١٩٤٢دا ، ئەنجومەنی عورفی سوپایی لە لەشکرگـای رەشید کە کۆبوبوەوە ، هەندێك بڕیاری پاش ملەی دەرکردبو بە گوناهبار کردنی علی محمـود شێـخ علی‌و یـونس سبعـاوی‌و فریق ئەمـین زەکی سلیمان‌و عقید فهمی سعیدو عقید محمود سلمان ، بەگویرەی بڕگەی یەکەم لەمادەی (٨٠) لە (ق• ع• ب• یاسای سزای بەغدادی) و گوناهبار کردنی صدیق اسماعیل شنشل بەگویرەی بڕگەی دوهەم هەر لەمادەی نـاوبراوی سەرەوە • فرمانی خنکاندنی علی محمود شێخ علی‌و یونس سبعاوی‌و فریق ئەمین زەکی سلیمان‌و عقید فهمی سعیدو عقید محمود سلمانی دەرکرد بەلاّم فرمانی خنکاندنی فریق ئەمین زکی سلیمانی گۆڕیی بە (بەندکردنی هیجگاری لەگەڵ ئیشی قورسدا ) لەبەر هەندە هۆیەك •

بریاری گوناهبارکردن‌و حوکمە پاش‌ملەییەکان لەرێگای رۆژنامـەو ئێستگەوە بە حوکم‌دراوەکان گەیاندرا ، چونکە راکردوبـوون‌و لـەکاتی محاکمەدا حازر نەبوون‌و خۆیان نەدابو‌و بە دەستەوە •

ئەو تاوانانەی درابونە پاڵ ئەو گوناهبارانە ، ئەوەبوو کەوا لـەگەڵ چەند تاوانبارێکی تردا کە رایـان‌کردبوو ، تـاقمێك چەتـەی پڕچەکیـان پێك‌هێناو بەسەرۆکایـەتی هەندێکیـان‌و بەهـێزی چـەکدارەوە دەورەی کۆشکەکەی خاوەن شکۆ عەبدول‌ئیلاهی (وصی)یان‌دا ، تـاکو کەتنێـکی پێ‌بکەن‌و ناچاری بکەن کەولاّت بەجێ‌بهێڵێت‌و حکومەتی تەها هاشمی‌یـان خست •

بەهێـز بەربەرەکانی بەجی‌هێنانی مادەکانی دەستورو یاسایان کـرد ، حکومەتیان گۆڕی ، پەرلەمانیـان بەزۆر کۆکردەوەو ناچاریـان‌کرد کـە

(وصی) شەرعی لابەرێتو یەکێکیتر لەجیگای ئەو بە (وصی) نا شــەرعی دابنێت ، ئەمانەیان هەموو لەمــانگی نیســانو مایسی ١٩٤١دا ، بەنــاوی حکومەتی نیشتمانی بەرگریەوەو ئەو وەزارەتە ناحەقەی کەهــاتە شــوێنی ئەکرد •

دوای بلاوکردنەوەی ئەو حوکمانەی لەپاشملە دران بەو شێوەیــەی وتمانن ، حکومەت توانی هەندێك لەو گوناهبارانە بگرێتو بیاندات بــە ئەنجومەنی عورفی سوپایی بۆ محاکمەکردنیان تــاکو حوکمە پاشملەکــان پوچ بکرێنەوە ، چونکە تاوانبارەکان لەکاتی خۆیدا هێنرانەوە پێش ئەوەی حوکمەکانی پێشویان بە (قطعی) وەرگەرێت ، ئەو تاوانبارانەش علی محمود شیخ علیو یونس سبعاویو فریق ئەمین زەکی سلیمانو عقید فهمی سعیدو عقید محمود سلمانو صدیق شنشل بوون •

ئەنجومەنی سوپایی عورفی دەستی کرد بە محاکمەی ئەو کەسانــەو داواکەری گشتی (حمدی صدرالدین) ، ئەویش ئامادە بوو • دەستکــرا بەخویندنەوەی شەهادەتی شایەتەکان کە لەوەپیش لەدژیان کۆکرابونــەوە ، لەپیش هەموياندا قسەکانی (دایکی مەلیك)و (وصــی) وتەهــا هــاشمیو راپۆرتی گوناهباری راکردو محمد حسن طریحیو دوو نامەکەیی کامل شبیب دوای راکردنی کە لەتارانەوە ناردبوونی ، ئنجا قسەی شایەتیترو راپۆرتو بروسکەو نامەیتر کە پەیوەندیان بە داواکەوە هەیە ، گشتیان خۆیندرانەوە• دوای ئەوە هەندێك لەو شایەتانە سەرلەنوێ هێنرانەوە کە لەوەپێش شایەتیان دابوو ، جگە لەچەند شایەتێکی نوێ کە هێنران بۆ گوێگرتن لەشایەتیان وەك : جمیل مدفعی ، علی جودت ئەیوبی ، سەید محەمەد سەدر ، توفیــق سویدی ، داود حەیدەری ، سەید عەبدول مەهدی ، صالح جبر ، صــادق بصام ، صالح باش ئەعیان ، طاهر صابونجی ، أحمد جلیلی ، ارشد عمری،

(٢) الاشغال الشاقه المؤبده .

زەعیم نورالدین محمود، عبدالجبار ئەمین ، حسام‌الدین جمعه ، جلال خالدو ئەفسەران ایوب صبری ، عطا صالح ، خیراللـــه حسن ، عەبـــدول حەلیـــم عەبدول غەفورو جمیل خشالی •

جگە لەوانە رێی ئەو گوناهبارانە درا ئەوانەی کە ئەیانەوێت پارێزەر بۆ پاراستنی مافی خۆیان بگرن ، ئنجا داواکەری گشتی داوای تاوانبارکردنی یونس سبعاوی‌و فهمی سعیدو محمود سلمانی بەگوێرەی بڕگەی یــەك لەمادە (٨٠)ی یاسای سزای بەغدا کردو سیانـــەکەی تر بەگوێرەی برگەی دوو لەمادەی ناوبراو • دوای ئەوە داوا لە گوناهباران و پارێزەرەکانیـــان کرا کەقسە بکەن ، هەر کەسە یا خۆی یاخود پارێزەرەکەی بەرگری کردو قسەی چی بوو کردی •

ئنجا سەیری هەمو ئـــەو بەلگانـــەکران کـــە لـــە دژی گوناهبـــاران گردکرابونەوە کە بەکورتی ئەم چەند خالە بوون :

یەکەم : لوت‌ژەنە ناو کاروباری سیاسەتی ناوەوەو دەرەوەی دەولەت لەلایەن پیشەوا سوپاییەکانەوە کە فهمی سعیدو محمود سلمان‌و سەلاحەدین سەبـــاغ‌و کامل شبیب بون • لەمەدا دوای دەست‌کەوتنی تایبەتی‌و خۆنواندن‌و ناوی بۆش کەوتبوون ، شوێنە سوپاییەکانیان بەکار ئەهێنا کەکاری پێ‌بکەنە سەر ژێردەستەکانیان‌و خەلکی تر ، ئەمە لەکاتیکدا کە ئەبوایە پارێزگـــاری نیشتمانیان بکردایە ، نەك تووشی تەنگ‌و چەلەمەی بکەن • وەزارەتیـــان ئەهێناو وەزارەتیان لائەدا ، تاکو دەستیان گەیشتە سەرۆکی هەرە بـــالای دەولەت بێئەوەی رێزی (تەخت) [1] بگرن ، لەسەرکێشی خۆیانـــدا هـــەر بەردەوام بوون ، گوێیان لەقسەی دلسوزەکان نەئەگرت ، تا ولاتیان لەژێر

---

(١) عرش •

پەردەی نەتەوایەتی‌و نیشتمانپەروەری‌دا ، تووشی ئەو هەرایە کرد کە تێوەی گلا ٠

دوهەم : وەك لە (مفکرە)کەی سەلاحەدین سەباغدا دەرکەوت کەدوای راکردنی لەقاسە ئاسنەکەی ژورەکەیدا دۆزرایەوە ، ئەو سەرکێشانە ویستویانە ئەو پیاوە گەورانەی ولآت بگرن‌و دوریان خەنەوەو محاکەمەیان بکەن‌و بیانچەوسێننەوە وەك :

- محاکەمەی باقر حسنی فەرمانبەر لەبارەگای شاهانە ٠
- محاکەمەی ئەفسەر عبید عبدالله ، هاوەڵی (وصی) ٠
- دوورخستەوەی (شریف فوازو شریف حسین) بۆ ئوردن ٠
- محاکەمەی عەبدول مەهدی وەزیری اقتصادو هێشتنەوەی لەبەغدادا دەستبەسەر ٠
- دوورخستنەوەی جمیل مدفعی‌و علی جودت‌و جلال بابان‌و عزیز یاملکی٠
- محاکەمەی محسن ابوطبیخ‌و رایح عطیە ٠
- لابردنی صالح جبرو تحسین علی لەسەر ئیش ٠
- ئەمە جگە لەوەی کە ئەیان ویست دەست لە (وصی) و نوری سعید بوەشێنن ، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەوان زوو بۆی دەرچوون نەیانتوانی هیچیان لێ‌بکەن ٠

سێهەم : ئەم تاوانبارانە هێجگار لەوەزارەتەکەی رەشید عالی گەیلانی‌دا پێ‌یان ئەوەندەی‌تر لێ هەڵبڕی ، بەوەدا کە گەیلانی پەتی بۆ شل‌کردبوون ، ئەمانە بەئاشکرا دژی پەیمانەکەی بەینی عیراق‌و بەریتانیا ئەجولآنەوە ، دەولەتی هاورێ‌و هاوسوێندی عیراق کە بەریتانیا بوو ، زیزیان ئەکردو خۆیان لەدەولەتێکی‌تری بێگانە نزیك ئەخستەوە کە ئێمە هیچ بەرژەوەندییەکمان لەگەڵیدا نیە ٠ ئەم کردەوانەیان بووبە هۆی دەرچونی

وەزیری دەرەوەو وەزیری ناوەوە لەوەزارەت ، بەلاّم تاوانباران دوکەسی تریان بەسەر حکومەتدا سەپاند ، لەجیاتی نوری سەعیدو ناجی شوکەت کە ئەوانیش علی محمود شێخ علیو یونس سبعاوی بون ، لەسەر ئەمە هەڕەشەیان لە (وصی) کرد کە پیویستە فرمانی دانانی ئەو دو وەزیرە مۆر بکات ، ئەویش لەهەوەڵەوە نەیکرد ، بەلاّم بۆ سبحەینی ناچاربوو بە مۆرکردنی ، لەمەدا سەید محمد صدر ئاگادارە وشایەتی داوە کە بە زۆرو هەرەشە پێیان مۆرکردوە ٠

چوارهەم : رەشید عالیو گوناهبارەکانی تر ، داوایان لە (وصی) کرد کە فرمانی هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان بدات، (وصی) لەبەر ئەوەی ئەم کارەی بەراست نەئەزانی ، لەبەر ئەوە فرمانەکەی دەرنەکرد ، بەڵکو رۆژی ٩٤١/١/٣١ پایتەختی بەجێهێشتو چو بۆ دیوانیە ، ناچار رەشید عالی بەبروسکە وازهێنانی خۆی لەوەزارەت پێشکەش (وصی) کرد ، ئەویش داوای لەتەها هاشمی کرد کە وەزارەت پێك بهێنێو خۆشی گەرایەوە بۆ بەغدا ، بەلاّم ئەمان هەر کنەیان لەوەزارەتی تەها پاشادا ئەکرد ، نەیان ئەهێشت ئیش بکەن ، حکومەت ناچار فرمانی گواستنەوەی کامل شبیب لەفرقەی یەکەوە لەبەغدا بۆ فیرقەی چوار لەدیوانیەو گواستنەوەی بارەگای فیرقەی سێ کەپێشەواکەی سەلاحەدین سەباغ بوو دەرکرد بۆ بعقوبە ٠ ئەمانە ئەم فرمانەیان نەهینایە دیو لەگەڵ رەشید عالیو ئەوانی تردا هەموو شەوی ٩٤١/٤/١ لە لەشکرگای رەشید کۆبونەوە ، تاکو وەزارەت بخەن ، دوای ئەوەی سوپایان خستە ژیر (انذار)و خەتی تەلەفونو رێگاکانیان هەموو بڕی ٠ تەها پاشایان ناچار ئەکرد کەواز بهێنێ ، هێزیان نارد دەوری کوشکی (زهور)و کۆشکی (رحاب)یاندا ، (وصی) زانی مەبەسیان خراپەو ئیش لەبار نیە[١] هەر بەو شەوەو بەجلی شەوەوە خۆی دەربازکرد بۆ مالی

(١) لەیادداشتەکەی سندرسن (پزیشکی تایبەتی کوشکی شاهانە) کە لە ←

(صالحه)ی پوری ، بۆ بەیانی خۆی گەیاندە حبانیەو لەوێــوە بــۆ بصره•
ئنجا داوایان لە تەها پاشا کرد کە لەگەڵ رەشید عالی پێکەوە چارەسەرێکی
باری سیاسی بکەن ، چونکە سوپا بروای بەگەیلانی‌یە ، بۆ ئەم مەبەســە
بەیانی رۆژی دووی نیسان ۱۹٤۱ رەشید عالی‌و سەلاحەدین سەباغ‌و ئەمین
زەکی‌و توفیق سویدی هەمو لەمالی تەها پاشا کۆبوونەوە رەشید عالی‌و
سەلاحەدین دەستیان کرد بەقسە پێوتنی (وصی)و هەرەشەکردن، هەرچەندە
توفیــق سویــدی تێی گەیاندن کە ئەم جولانەوەی ئەمانە دەستــوری
نی‌یەو بەلکو تاوانەو ئاسایشی ولات ئەخاتە مەترسیەوە ، جــگە لــەوەی
ئەنجامی ئەم‌کردەوانە ئەبێت بەهۆی زیزبوونی ئنگلیز، بــەلام قســەکەی
بێ‌سوود بوو ، تا ئیوارەی رۆژی ۱۹٤۱/٤/۳ ، سەرۆکی سەرەوای سوپــا
ئەمین زەکی سلیمان بەیاننێکی لەرادیــودا بلاوکــردەوە ، کــەوا (وصی)
رای‌کردوەو باش‌ترین کەس کە سوپا بروای پێ‌یەتی ، رەشید عالی‌یە ، (ئەمە
لەکاتێکدا کە هێشتا حکومەتی تەها هاشمی هەرماوە) ، دوای ئەم بەیانە رەشید
عالی بەشێوەیەکی دژ بەدەستور بلاوی‌کردەوە کە بۆبە سەرۆکی ومزارەت،
جگە لەوەی جاری پێك‌هێنانی (حکومەتی بەرگری نیشتمانی) بەسەروکایەتی
خۆی‌و ئەندامان سەروکی سەرەوای سوپاو پیشەواکانی فیرقەکانو عــلی
محمود شێخ علی‌و یونس سبعاوی دا • بەم جۆرە هەموو جولانەوەیەکــی
ئەم تاقمەدژی دەستور بوو ، ئەمیان دائەناو ئەویان لائەبردو خەلکیان ئەگرت،
بەوەوە نەوەستان بروسکەیەك بەئیمزای ئەمین زەکی نێررا بۆ بەسرە کــە
(وصی) بگرن‌و پەت پەتی پێ بکەن، ئەویش ناچار بەسرەی بەجێ‌هێشــت

ژمارەیەکی ( افاق عربیە) دا بلاوکراوەتەوە ئەلێت :
بالیۆزی ئەمەریکا (وصی) خستە ئوتوموبیلەکەی خۆیەوەو لەبەر پــێی
خۆیدا داپۆشی تاگەیاندیە حبانیــە .

خۆی گەیاندە پاپۆرێك [1] نزیکەی بیست رۆژی تێدامایەوە چاوەروانی توانینی گێرانەوەی باری یاسایی جارانی ولآتی ئەکرد ... هەر لەم بەینەدا ، واتا لەرۆژی دەی نیسانی ١٩٤١دا ، ئەمانە ، بەزۆری سوپا پەرلەمانیان کۆکردەوە ، هەربەزۆر بریاریان بەدانانی (شریف شرف) بە (وصی) پێدەرکرد لەجیاتی (وصی) شەرعی کە ئەمیر عەبدولئیلاهە ، ئنجا بریارێکیان بە شەریف شرف دەرکرد کە وەزارەتی تازە بەم جۆرە دابمەزرێت:

| | |
|---|---|
| رەشید عالی گەیلانی | سەرۆکی وەزیرانو وەزیری ناوخۆ |
| ناجی سویدی | وەزیری دارایی |
| موسی شابەندەر | وەزیری دەرەوە |
| ناجی شوکت | وەزیری بەرگری |
| علی محمود شێخ علی | وەزیری عدلیە (داد) |
| یونس سبعاوی | وەزیری ئابووری |
| محمد علی محمود | وەزیری اشغالو مواصلات (ئیشو ریگاو بان ) |
| محمد حسن سلمان | وەزیری معارف (زانیاری) |
| رؤوف بحرانی | وەزیری کاروباری کۆمەلایەتی |

ئنجا ئەمانە شەریان بە هێزەکانی بەریتانیای هاورێی عیراق ئەفرۆشت کە لە (حبانیە)و (سن الذبان) بوون ، تا شەریان هەلگیرسان ، بەوە پێچەوانەی ناومرۆکی پەیمانەکەی بەینی عیراقو بەریتانیا جولآنەوە ، بەم جۆرە ئەو شەرەیان هەلگیرساند کە بووبە هۆی کوشتنو گرتنو مالوێرانکردنی چەندەها کەس جگەلەو زیانەی لەدەولەتیاندا کەبایی

(١) بریاری (تجریم) دانبەوەدا نانێت کە ئەمە زرەپلیەك یاخود (بارجە)یەکی ئنگلیزی بوو ، هەر بۆ ئەم مەبەسەش ئامادە کرابوو ، ئەو چەند رۆژە لە دەریادا لەنگەری گرتبوو .

(١٩٠/٤٣٦/٦٠٢/١) دینار بوو ، ژمارەی کوژراو (٦٨٠) کەس ، بریندار (٧٩٦) ، ونبوو (٥٧١)کەس ، ئنجا کە ئەمانە هیچیان بۆنـەکرا ، هەمـوو رایانکردو ولاّتیان بەشیرازەیەکی پچڕاوەوە بەجیٚهێشت ، دوای ئـەوانو لەرۆژی ٣٠ مایسی ١٩٤١دا سەبعاوی خۆی بە حاکمی سوپایی بەغدا سەپاند، بەلاّم لیژنەی ئاسایشی بەغدا کەدوای راکردنی تاوانباران لەدڵسـۆزەکانی ولاّت پێك هاتبوون ، ئەوان سبعاوی خـۆیو کارگـێری ئاژانسـەکەی صدیق شنشلیان گرتو داوایان لیٚکردن کە بەغدا بەجـێ بهـێڵن • دوای گەرانەوەی ئاسایشو بلاّوکردنەوەی (هدنە) [١] ، لەرۆژی یەکی حوزەیرانی سالّی ١٩٤١دا ، (وصی) تەشریفی هێناوەو داوای لە جەمیل مدفعی کـرد کەوەزارەت پێك بهێنێت •

دوای ئەوە بریارەکـە [٢] دێتـە سـەر دانپیانـانی هـەر یەکێـك لەگوناهبارکراوان بەگوناهەکانیاندا ، ئەلّێت گوایە ئەمین زەکی سلیمـان دانی ناوە بەو هەمو شتانەی دراوەتە پالی ، بەلاّم بیانوی ئەوە بوە کە گوایە لەترسدا ئەوەی کردوەو وتوویەتی کە ئەو وەك روالّەتێك بوە ، هەموو شتێك هەر سەلاحەدین سەباغ بوەو هەر ئەو شتبوە •

بەرامبەر بە محمود سلمانیش ئەلّێـت کە خـۆی دانی بەوەدانـاوە کەراستە زۆرجار سوپایان خستۆتە ژێر (انذار)ەوەو هەرچواریان پێـکەوە بریاریان دەرئەکرد ، هەرچەندە سەلاحەدین جار جار بەدزی ئەوانـەوە شتی بریار داوە ، ووتویەتی سەلاحەدین لەو رادەیەدانی‌یە بیێ بە پێشەوای ولاّت، دوای ئەوە وتویەتی:هەرچیەکمان کردوە لەرێی بەرژەوندی ولاّتدا کردومانەو بەباشمان زانیوە ، وتومانە سوپا سنورێك بۆ ئەم پاشاگەردانی‌یە دائەنێت •

---

(١) مەبەسی لە (هدنە) یاخود شەڕراگرتن ئەو رێككەوتنەیە کە لیژنـەی ئاسایش لەگەڵ هێزە داگیرکەرەکەی ئنگلیزدا کە بەرەو بەغـدا هـات ، ئیمزایانکرد .

(٢) واتا (قرار التجریم) .

محمد یونس سبعاوی ، ئەویش دانی بەو گوناهانەدا ناوە کەدراونەتە پالی وتویەتی : دەمێکە خۆم لەسیاسەتەوە گلاندوە ، بەپیویستم زانیوە سوپا دست بژەنێتە سیاسەتەوە چونکە پەرلەمان ناتوانێ جلەوی ولات بەتونـدی بگرێت ، دانی بەوەشداناوە ، کە دوای راکردنی حکومەت ، ئەم خۆی داناوە بە حاکمی سوپایی ، چونکە ئەوە بۆ بەرژەوەندی ولاتبووە ئنجا وتویەتی : بەلام ئەگەر بلێن گوایە من بۆ دەستکەوتی تایبەتی ئەمانەم کردوە ، درۆیە، چونکە من دەولەمەندبوم ، پێویستم بە وەزارەتو خۆدەرخستن نەبوە •

عقید فەهمی سعیدیش دیسانەوە دانی بەو گوناهانەداناوە کە دراونەتە پـالی •

ئنجا دێتە سەر بەرگری علی محمـود الشیخ علی ، هـەر بەقسـەی ئەنجومەنی عورفیدا وادیارە قسەی زۆرکردوەو بەرگریەکی دورو درێـژی لەخۆی کردوە [1] ، هەرچەند وتویەتی جولانەوەکەی حکومەتی (دفاع وطنی) دەستوری نەبوە ، بەلام لەهەمانکاتدا وتویەتی : شتێکی ناشەرعیش نەبوە ، چونکە هەموی بەناچاری کراوە ، بۆ ئەوەی چارەسەری باری شێواوی ولات بکەن ، ئەگەر (وصی) رای نەکردایەو لەشوینی خۆی بمایەوە ، ئەم شتـانە روویان نەئەدا (دانی بەهیچ گوناهو تاوانیکدا نەناوە) هەرگـیز کارێـکی ئەوتۆی نەکردوە دژیولات بێت ، بەلکو بەپێچەوانەوە داوای گێرانەوەی باری دەستوریو دادگەری کردوەو زۆر کەسیشی پاراستوە لەوانەی کەلەو سەردەمەدا ئەیانویست ئازاریان بدەن • بەلام ئەنجومەنی عـورفی بـەوە تاوانباری کرد کە حکومەتی (دفاع وطنی) بەزۆرو تاوان خۆی سەپانـدوە، (وصی)یش ، دوای ئەوەی کەسەیری کردوە دەوری کۆشـکەکەی دراوە

---

(1) بەوەدا کە ئەم پیاوە حقوقی بوە جگە لەوەی ئەدیبیکی قەلەم رەنگینبوە، کتیبێکی لەمروەوە هەیە بەناوی (محاکمتنا الوجاهیە) کەپرە لە (بلاغە)و قسـەی قانونی جوانو بەهێز .

رووی کردۆتە بەسرە ، لەوێش هێزی چەکدار ، دەورەی ئوتێلی ( شـط العرب)یان داوە کە تێدا دابەزیبو ، جگە لەوەی بەبروسـکەش داوا لـە (حامیە)ی بەسرە کراوەکە (وصی) بگرن • هەروەها داوای پووچ کردنەوەی پەیمانی بەینی عیراق‌و بەریتانیای کردوەو داوای دامەزراندنی پەیوەنـدی لەگەڵ دەوڵەتێکی بێگانەدا کردوە •

بەڵام صدیق شنشل دەرکەوت کە وەك فرمانبەرێك ئەرکی سەرشانی خۆی دیوە ، چەند جار کە (مدیری دعایە)بوە ، ویستویەتی دەرچێت نەیـان هێشتوە ، هیچ کارێکی دژی بەرژەوەندی وڵات نەکردوە ، بەغدایشی بەجێ نەئەهێشت لەسەر داوای لیژنەی ئاسایش نەبوایە ، پروپاگاندەی پرزیـانی بڵاو نەکردۆتەوە •

دوای ئەوە بریارەکە ئەڵێت : (دیوانی تدوینی قانونی) کە لە پیـاوە یاسا ناسە گەورەکان پێك هاتوە وتویەتی : کە هەرکارێك حکومەتی بەرگری نیشتمانی پێی هەستابێت گشتی لەنوکەوە بۆشەو پیویست بەدەرکردنـی هیچ (تشریع)یك نیىە بۆ پوچکردنەوەیان [1] •

**( فرمانەکانی ئەنجومەنی عورفی ) (٢)**

ئەنجومەنی عورفی سوپایی رۆژی ٤/٥/٩٤٢ لە لەشکرگای وشـاش بەسەرۆکایەتی عقید مستەفا راغب‌و ئەندامان داوەر عبدالعزیز خیاط‌و داوەر خلیل ئەمین‌و عقید محمد علی سعیدو رئیس یەکەم عبدالله رفعت نعسانی ، کۆبونەوە • بەناوی مەلیکی عیراقەوە ئەم فرمانانەیان دەرکرد :

ـــ ئەندامانی ئەنجومەنی عورفی سوپایی هەموو پێکەوە ، بریاری خنکاندنی

---

(١) بەگویرەی بریاری تدوین رۆژی ٣ ـ ٦ ـ ١٩٤١ .

(٢) قرار الحکم .

تاوانباران (محمد یونس سبعاوی)و عقید (فهمی سعید)و عقید (محمود سلمان)یان بەگوێرەی مادە (٨٠ــ١) لەیاسای سزای بەغدا ، دا •

ــ هەمووش پێکەوە بڕیاری بەندکردنی (علی محمود شیخ علی)یان بــۆ حەوت ساڵدا ، لەرۆژی گرتنیەوە کە ئەکاتە ١٣/٣/٩٤٢ •

ــ هەروەها هەموو پێکەوە بڕیاری بەندکردنی فریق (ئەمین زکی سلیمان)یان بۆ ماوەی پێنج ساڵدا لەرۆژی ١٣/٣/٩٤٢وەوە بەگوێرەی مــادە ( ٨٠ ــ ٢ ) لەیاسای سزای بەغدا •

ــ بڕیاری دەرکردنی [1] فریق ئەمین زکی سلیمانو عقید فهمی سعیــدو عقید محمود سلمان لەسوپادا دا ، بەگوێرەی مادە (٣٠ــ١ــأ) لەیاسای سزای سوپایی‌و ئەو پارەیان هەموو پێکەوە پێ بژێرێت کە (١٩٠ / ٤٣٦/٦٠٢/١) دینارەو لەئەنجامی تاوانکانیاندا بەزیــان لەدەوڵــەت دراوەو موڵکەکانیانو پارەکانیان لەبانقدا دەستیان بەسەردا بگیریت بەهۆی دایەرەی (اجرا)وە[2]، لەدواییدا ئەودایەرەیەش هەر پارەیەکی لەبەشی ئەو ناوبراوانەوە دەست گیر ئەبیت ، بیــدات بەخەزێنــەی حکومەت •

دوای ئەوە وەك وتمان ئەو تومەتە سیاسیەی ئاراستەی سەلاحەدیــن سەبــاغ کرابوو ، بە بەشداربوونی لەشۆرشــەکەی مایســدا ، گــۆڕراو گوناهێکی تری درایەپاڵ گوایە دژی (وصی) جولاوەتەوە هەر لەسەر ئەوە (هەر وەك سەباغ خۆشی لەیادداشتەکەیدا باسی ئــەکات) ئەنجومەنــێکی عورفی تری بۆگیرایەوەو لەپاش ملە محاکمەیــانکردەوە ، ئــەم جــارەش فرمانێکی کەی هەر بە خنکاندن بۆ دەرچوو ، بەڵام ئەم جارەیان تۆمانجەکەو

---

(١) طرد .

(٢) ئێستا (تنفیذ)ی پێ ئەڵێن .

تاوانەکە سیاسی نەبون ، بۆ ئەوەی بتوانن لەسەر تاوانی (عادی) ، داوای ( سەباغ ) لەتورکیا بکەنەوە ، ئەو تورکیایەی کەجاری پێشو نەی ئەتوانی بەتاوانی سیاسی گوناهبار (تسلیم) بکاتەوە • ئەوەبوو رۆژی (٣٠) ئەیلولی ١٩٤٥ تورکیا لەرێی سوریاوە (سەباغ)ی بە عیراق دایەوە لەم کاتەشـدا فرمانە پاشملەکەی عورفی بە (قطعی) وەرگەرابوو ، چونـکە لەوماوەیەدا دانیابوو حوکمدراو نەهات خۆیبدا بەدەسـتەوە تاکو سەرلەنـوێ وەك هاورێکانی محاکمە بکرێتەوە •

لەروژی (١٦)ی مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٤٥دا سەلاحەدین سەباغیش وەك ئەوانیتر خنکێنراو لاشەکەی لەبەر قابی وەزارەتی بەرگریدا لەبەغدا هەڵواسرا •

**( سەرنـج لەم داوەریـە )**

گومان لەوەدا نییە کە ئەم رووداوە کارەساتێکی سیاسی تـەواوە ، جگە لەوەی جولانەوەیەکی ئازادیخوازانەبوو دژی ئیمپریالیزمی ئنگلیزیو پەیمانەکەی بەینی ئنگلیزو عێراق ، بەلام بەداخەوە جولانەوەیەكبوو بەتەمای یارمەتیدانی ئەلەمانیای نازیکرا ، کە ئەویش ئەو یارمەتیەی کە پێویستبوو، ئێستاو ئەوسا نەیدا • هەروەها جولانەوەیەك بوو دژی عەبـدول ئیـلاهی (وصی)و کاربەدەستانی تری ئەوسای عیراق ، ئەوانەی سەر بە ئنگلیزبوونو لەخەتی ئەودا ئەسورانەوە •

ئەوپیاوانە ، بەتایبەتی پێشەواکانی سوپا بەگویرەی مـادە (٨٠) لـە یاسای سزای بەغدادی گوناهبار کران ، مـادەکەش بـاسی پێكهێنـانی کۆمەڵەیەکی پرچەك ئەکات کە هێرش بەرنەسەر دانیشتوانی ولاتو بەهێزی چەكو بەهۆی موچەخۆرانی حکومەتەوە ئیشی یاسـا بوەسـتێننو هـێز

بۆلابردنو گۆڕینی حکومەت بەکار بهێنن [1] •

جا ئایا ئەم بڕگەیە لەمادەی (٨٠)و بڕگەی دوهەمیش کە بۆ (ئەو کەسانەیە چونەتە ناو ئەو کومەلەیەوە بەلآم دەستیان لە ڕێکخستن یاخـود سەرۆکایەتی کۆمەڵەکەدا نەبوە) تا چ ڕاددەیەك ئەو کەسانە ئەگرێتەوە ؟

ئەو گوناهانەی درابوونە پاڵ گوناهبارەکان ئەمانەبوون :

یەکەم : لوت ژەننە ناو کاروباری سیاسەتی ناوخۆوەو دەرەوەی وڵاتو وەستان دژی پەیمانەکەی عیراقو ئنگلیزو هەڵگیرساندنی شەر دژی ئنگلیزو خۆ نزیك خستنەوە لەدەوڵەتێـکی تـری وەك ئەلمانیـا کە عـیراق هیـچ بەرژەوەندیەکی لەگەڵدا نیە •

دووەم : دەورگرتنی کۆشکی (وصی) بەهێزی چەکدارەوە بۆترساندنو ناچارکردنی بە بەجێهێشتنی وڵاتو دانانی (وصی)یەکی تری ناشەرعـی لەرێی زۆرکردن لەپەرلەمان • لەوەپێشتریش هەرەشـەکردن لە وصیو ناچارکردنی بە مۆرکردنی هەندیك فرمان وەك لابردنی وەزیری نـاوەوەو دەرەوە (نوری سەعیدو ناجی شوکت)و دانانی دو وەزیری نوێ ( عـلی محمود الشیخ علیو یونس سبعاوی) •

سێهەم : لابردنو گۆڕینی حکومەتـەکانی عـیراق ، وەك لابـردنی حکومەتی تەها پاشای هاشمیو هێنانی حکومەتی ڕەشید عالی •

---

(١) مادە (٨٠) بڕگەی (١) لە (یاسای سزادانی بەغدادی) ئەڵێت :
(یعاقب بالاعدام کل من نظم او ترأس اية عصبة مسلحه هاجمت فريقـا من سكان البلاد او قاوم بالسـلاح تنفيذ القانون بواسطة مأموری الحكومه او شرع فی استعمال قوه ظاهره للقضاء علی الحكومه او تغييرها) .

بڕگەی (٢) هەر لەو مادەیە ئەڵێت : (وتكون العقوبه الاشغال الشـاقه المؤبده او المؤقته او الحبس للاشخاص الذين انضموا للعصبة دون ان يشـتركون فی تنظيمها او ان يكون لهم رياسه فيها) .

چوارەم : ویستویانە (شروع) پیـاوە گەورەکـانی ولأت بـگرنو دووریان خەنەوەیا محاکمەیان بکەنو بیان چەوسێننەوە ، وەك لەدەفتەری یادداشتەکەی سەباغدا دۆزراوەتەوە •

پێنجەم : ملنەدان یاخود بەجێنەهێنانی فرمانی گواسـتنەوە : وەك ئەوفرمانەی بۆ گواستنەوەی بارەگای فیرقـەی سـێ کـە پێشـەواکەی سەلاحەدین سەباغ بوو بۆ بعقوبە دەرچوو ، هەروەها فرمانی گواستنەوەی کامل شبیب لەفیرقەی یەکەوە لەبەغدا بۆ فیرقەی چوار لەدیوانیە •

شەشەم : هەندێك وردە گوناهیتر کە دراونەتە پاڵیان •

جا ئەگەر ئێمە تەنها بارە یاساییەکەمان سەیرکردو ئەومادەدەیەی (٨٠)مان لەگەڵ ئەوگوناهانەی دراونەتە پال ئەوپیاوانە بەراوردکرد ، سەیر ئەکەین، ماددەکە گوناهەکان ئەگرێتەوەو بەسەریانا ئەسەپێ چونکە : ئەو پیـاوانە بەو کارانە هەمووی یاخود بەزوربەی هەستاونو خۆشیان دانیان بەوەدا ناوە، بەلأم ئەگەر ئێمە بەشێوەیەکی گشتیی سەیر بکەین ئەبینین کە ئەو کارانـە هەموو کاری سیاسینو لەرێی نیشتماندا کراون ، نەك بۆ دەستکەوتـی تایبەتیو خۆدەرخستن ، بەلگەشمان بۆ ئەمە زۆرە ، یەکێکیان ئەو فەرمانەیە کە دژی سەلاحەدین سەباغ دەرچو • ئەوەبو دادگای تورکیا فەرمانەکەی بەسیاسی داناو سەباغی بە پەنابەرێکی سیاسی ژمارد ، لەبەر ئەوە هەرچەندە عیراق داوای کردەوە ، نەیدا بەدەستەوە ، بەلأم لەدواییدا کە گوناهەکەی ( سەباغ )کرا بە تاوانێکی ئاسایی دژی (وصی)و بەوپێیە محاکمە کـراو حوکم درا[1]و بریاری حوکمەکە نێررا بۆ تورکیا ، ئەوسا تورکیا (سەباغ)ی تسلیم کردەوە چونکە تاوانەکە لەسیاسیەوە گۆررا بۆ ئاسایی واتا (اعتیادی) کە ئەمەش یاریکردنێك بوو بە یاساو دادگەری •

---

(١) ئەبێ بەگوێرەی مادە (٩) بێت لە (الباب الثانی عشر) لەیاسای سـزای بەغدا کە ئەڵێت : (کل من تعرض الی حیاة الملك یعاقب بالاعدام) .

دیسانەوە لەدانپیانانی گوناهبارەکاندا بەو گوناهـانەی دراونەتـە پاڵیان دەرئەکەوێت کە ئەو کارانەی کردویانەو ئەو ئیشانەی پێی هەڵساون، گشتیان رامیارین‌و لـەرێی بەرژەونـدی نیشتمـانو گەلدابـوەو دژی ئیمپریالیزم بووە •

ئەمێنێتەوە ئەوەی کە ئایا حکومەتەکەی رەشـید عالی دەسـتووری بوەیان نا ؟ (دیوانی تدوینی قانونی)و هەروەها یەکێك لە گوناهبارەکان (علی محمود الشێخ علی) ئەڵێن دەستووری نەبوە ، بەڵام ئەوەبوو لەلایەکـەوە عەبدولئیلا کە (وصی)بو تەختی بەجێهێشت‌و رای‌کرد ، لەلایەکی تـرەوە شۆرشێك لەناواندا بەرپابوبو رەشید عالی وەزارەتی پێك‌هێنابوو لەدواییدا پەرلەمان کۆبووبوەو ، (وصی) نوێ دانرا کە شریف شرف بوە ئەویش بریاری پێك‌هێنانی وەزارەتەکەی رەشید عالی دەرکردبو ، دوای ئەمانە هەمـووی ئایا ئیتر ئەو حکومەتە نابێت بە حکومەتێکی شرعی‌و دەستووری ، بەتایبەتی چەند دەولەتیکیش (اعتراف)یان پێ‌کرد ، جگە لەوەی حکومەتیـك‌بوو ، خۆی سەپاندبوو ! •

# محاکەمەی گوناهبارانی شەڕی گەورەی دووەم

محاکەمەی کاربەدەستانی ئەڵەمانە نازیەکان کە بوون بەهۆی هەڵگیرساندنی ئاگری شەڕی گەورەی دوەم ، محاکەمەیەکە کەلەوەبەر لەمێژودا شتی وەها رووی نەداوە ، چونکە تا ئێستا نەبیستراوە سەرۆك‌و گەورەپیاوانی (دەولەتیکی شەرهەلگیرسینەر لەهەوەڵجارداو تیاچوو لە ئەنجامدا ) محاکەمە بکرێن •

ئەو چوار دەوڵەتە مەزنەی ئەم باسەیان داهێنا (هەرچەند پیشوونەیەکی وەها لەوەپیش لەمێژودا رووی نەداوە) بۆ ئەوەیان کرد تۆڵەی ملیونەها کوژراوو بریندارو دیل بسێنرێت‌و بۆئەوەی کاربەدەستانی دەوڵەتێکی‌تر لەپاشەرۆژا نەخەڵەتابن لەشەر هەڵچن •

وتمان پێش ئەم محاکمەیە (پێشوونە)یەکی کەی وەها رووی نەداوە ، لەبەر ئەوەش قانونیکی تایبەتی وەها نەبوو کە بەگوێرەی ئەوە محاکەمەی ئەو گوناهبارانەی پێ‌بکرێت •

بۆ ئەم مەبەسە نوێنەری دەوڵەتە مەزنەکان (ئەمریکاو بەریتانیاو روسیاو فەرەنسە) لە رۆژی ٨ی مانگی ئابی ساڵی ١٩٤٥ لە شاری لەندەن بەناوی خۆیانەوەو لەجیاتی دەوڵەتە بچوکەکان کە شەڕی نازیەکان داوێنی گرتبوون کۆبونەوەو ئەم پەیمانەیان بڕیاردا کە بە (پەیمانی لەندەن) ناوئەبرێت ، ئێمەش بررگەگرنگەکانی باس‌ئەکەین :

مادەی یەك : دوای ڕێگادانی ئەنجومەنی دەسەلاتی سوێندخواران لـە ئەڵەمانیا ، دادگا (محکمە)یەکی سوپایی بۆ محاکەمەی ئەو گوناهبارانـە پێكدێت کە خراپەی شەڕیان تایبەتی نەبوە بۆ یەك میللەت یا دەوڵـەت ، هەرچندە خراپەکانیان تایبەتی بێت یـا بەو ئاوەوە بێـت کـەوا سەربـە کۆمەڵێك یا لایەك بوون •

مادەی دوو : ئەو دەستورو یاسـایەی ئەم دادگا سوپاییـە ئیشیـان پێدەکات بەپێی ڕێکەوتنێك دائەنرێت کەسەر بەم پەیمانەیە •

ئنجا نوێنەری هەر چوار دەوڵەتە مەزنەکان دیسانەوە لەلایەکـی‌کەوە کۆبونەوەو پشت بە مادەی دووی پەیمانی لەندەن لەسـەر دامەزراندنـی دادگایەکی دەولی سوپایی بەم شێوەیەی خوارەوە ڕێك‌کەوتن :

مادەی یەك : پێویستە دادگایەك بۆ محاکمەی گوناهبـارانی شـەر لەسەر حەق پێكبێتو زوو محاکەمەیان بکات •

مادەی دوو : ئەو دادگایە لەنوینەری هەرچوار دەوڵەتە مەزنـەکان پێك دێت • •••

مادەی شەش : ئەم دادگایە سەیری ئەو خراپانە ئەکات کە گوناهبارانی شەر کردویانە وەك :

أ ـ ئەو گوناهانەی دژی ئاسایشی جیهانیان کردوە •

ب ـ ئەو گوناهانەی بەرامبەر بە هەڵگیرساندنی ئاگری شەڕی گەورەی دووهەم کردوویانە •

ج ـ ئەو گوناهانەی بەرامبەر بە مرۆڤو مرۆڤایەتیی کردویانە •

مادەی هەشت : ئەگەر یەکێك لەو گوناهبارانە ساغی کردەوە کـەوا بەگوێرەی تێخورینێك جووڵاوەتەوەو خۆی هیچ دەسەڵاتێکی نەبوە ئـەوە

هەرگیز نابێت بەهۆی رزگاربوونی لەتۆڵەی ئەو خراپیانەی ، بەڵکو لێرەدا دادگا ئەگەر بەحەقی زانی بۆی هەیە تەنها لەو فەرمانەی کەم بکاتـەوە کە ئەیدات بەسەریا .

مادەی نۆ : دادگا بۆی هەیە ، ئەو کۆمەڵانە یاخود ئەو لایانـەی ئەم گوناهبارانە تیدا ئەندام بووبن بەگوناهباریان دابنێت .

مادەی یانـزە : دادگا بـۆی هەیە بەرامبـەر بـەو گوناهبـارانەی هێشتا نە دۆزراونەتەوە ، یاخۆیان نەداوە بەدەستەوە لەپاش‌ملە محاکەمەیـان بـکات .

مادەی چواردە : هەریەکێك لەدەوڵەتە مەزنەکان ئەتوانن کە دادخوازێکی گشتی لەم دادگایەدا دابنێن تاکو گوناهو تۆمـانج ئاراستـەی گوناهباران بـکات .

مادەی شانزە : پێویستە دادپرسینەوەی گوناهبـاران بەگوێـرەی حەق‌و داد بێت .

مادەی بیستو شەش : هەر فەرمانێك محکمە ئەیدات پیویستە بەتەواوی بیهۆێتەوە کە لەسەر چیەو چی‌نیە ، ئەو فەرمانەش تێهەڵچونەوەی دوبـارە (تمییز)ی نیە ، بەڵکو هیجگاریە .

مادەی بیستو حەوت : دادگا بۆی هەیە هەموو جۆرە فەرمانیـك تاکو خنکاندنیش بدات .

مادەی بیستونۆ : دوای ئەوەی فەرمان بەسـەر هەرکەسیـکا درا ، ئەنجومەنی راسەری سویندخواران لە ئەلەمانیا ئەو فەرمانە بەجی دێـنیو بۆی هەیـە ئەگەر بەباشی زانی لەهەر کاتێکا بێت ئەو فەرمانە کەمکاتەوە یا بەجۆریکی تر بیگورێت (١) .

---

(١) لێرەدا ئێمە (مادە) گرنگەکانمان گرتووە .

گوناهبارەکان کێبوونو ئیشیان چیبوو ؟

١ــ هرمان غورنغ : لە ساڵی ٩٣٢وە تاکو ٩٤٥ یەکێك بوو لە ئەندامەکانی پارتی نازیو فەرماندەری هەرەبەرزی دەستەی ( اس ــ ای)و جەنەراڵ لەدەستەی (اس ــ اس)•ئەندامو سەرۆکی پەرلەمان (ریخشتاخ)و[1] وزیری ناوخۆی پروسیاو بەرێوەبەری گشتیی پۆلیسی پروسیاو سەرۆکی ئەنجومەنی دەوڵەتو بەرێوەبەری پێکهێنانی پرۆژەی چوارساڵانو وەزیری رایخو فەرماندەری گشتیی لە هێزی هەواییو سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی شەرو ئەندام لە ئەنجومەنی وەزارەتی نهێنیو سەرۆکی پیشەسازیە یەکگرتوەکانی (هرمان غورنغ)و جێنشینی هتلربوو •

٢ــ ریبنتروپ : لە ساڵی ٩٣٢وەوە تا ٩٤٥ ئەندام لە پارتی نازیو پەرلەمانی ریخشتاخدا ، راوێژکەری هتلر لە کاروباری دەرەوەدا ، نوێنەری تایبەتی ئەڵەمانیا لە کۆبونەوەی فرێدانی چەکدا ، نوێنەری ئەلەمانیا لە لەندەن ، وەزیری رایخ لە ئیشوکاری دەرەوەدا ، ئەندام لە ئەنجومەنی وەزارەتی نهێنیدا ، ئەندام لە لیژنەی بەرێوەبردنی کاروباری سیاسی ، جەنەرال لەکۆمەڵی (أس ــ أس)دا بوو •

٣ــ هیس : لە ساڵی ٩٢١وە تا ٩٤١ ئەندام لەپارتی نازی ، وەزیری رایخی بێ وەزارەت ، ئەندام لە ئەنجومەنی وەزیرانی پارێزگاریی ، جێنشینی هتلر دوای غورنغ ، جەنەرال لە کۆمەڵەی (أس ــ أس) و (اس ــ ای) دابوو •

٤ــ کالتنبرونر : لە ساڵی ٩٣٢وەوە تاکو ٩٤٥ ئەندام لەپارتی نازیو رایخشتاخ ، جەنەرال لە کومەلەی (أس ــ أس) ، جەنەرالی پۆلیسی ئەلەمانیا ، وەزیری ئاسایشی دەوڵەتی نەمسا ، بەرێوەبەری پۆلیسی ڤینـاو

---

(١) لەدوواوە ئەم دەستانە یاخود کۆمەڵانەشمان بۆ روونئەبنەوە .

بەشی ژوروخواروی نەمسا ، سەرۆکی دایەرەی گشتیی ئاسایش بوو .

٥ــ روزنبرغ : لە ساڵی ٩٢٠وە تاکو ٩٤٥ ئەندام لەپارتی نازیو ریخشتاخدا [١] ، بەڕێوەبەری بەشی پیلانی دەرەوەو بەریوەبەری بیری (ئایدیولوجی) لە پارتی نازیدا ، بەڕێوەبەری رایخ لە ولاتە داگیرکراوەکانی رۆژ هەلات ، رێکخەری جوولانەوەی گەنجان ، جەنەراڵ لەکۆمەلەی (اس ــ اس) و (اس ــ ای)دا بوو .

٦ــ فرانك : لە ساڵی ٩٣٢وەوە تاکو ٩٤٥ ئەندام لەپارتی نازیدا ، جەنەراڵ لە کۆمەلەی (اس ــ اس) ، ئەندامو وەزیری بێ وەزارەت لە ریخشتاخدا ، قومیسەری رایخ بۆپێکهێنانی کاروباری دادگا ، سەرۆکی ژووری دەولەتان لەیاسادا ( ئاکادیمیەی قانونی ئەلەمانی ) ، سەروکی بەڕێوەبردنی شارستانی لە ولاتی لودز ، سەرۆکی بەرزی دایەرەی لەشکر لە (پروسیای روژاوا)و (بوزنان)و (اودز) و (کراکاو) ، حاکمی گشتی ولاتی پۆلەندەی داگیرکراو بوو .

٧ــ مارتن بورمان : لە ساڵی ٩٢٥وە تا ٩٤٥ ئەندام لە پارتی نازیو ئەنجومەنی رایخشتاخدا ، ئەندام لەدەستەی بەرزی بەڕێوەبردنی کۆمەلەی (اســای)، دامەزرێنەرو سەرۆکی دەستەی کراس [٢] رەشەکان، سەرۆکی کۆمەلی ئیشوکاری دایەرەی جێنشینی فوهرر (هیتلەر) ، سەرۆکی بەشی راوێژکەران لەپارتدا ، سکرتێری فوهرر ، ئەندام لە ئەنجومەنی وەزیرانی پاریزگاری رایخ ، رێکخەری دەستەی (فولکستورم) ، جەنەراڵ لە کۆمەڵەی (اس ــ اس)و (اس ــ ای)دا بوو .

٨ــ فریك : لە ساڵی ٩٣٢وەوە تا ٩٤٥ ئەندام لەپارتی نازیو

---

(١) باسی رایخشتاخیش لەدواوە دێت .

(٢) منظم حركة ذوى القمصان السوداء .

رایشلیتز ، جەنەرال لە کۆمەڵـەی (اس ــ اس) ، ئەنـدام لە ریخشتـاخ ، وەزیری ناوخۆی رایخ ، وەزیری ناوخۆی پروسیا ، بەریوەبەری رایـخ لەباسی هەڵبژاردندا ، مەندوبی گشتیی بۆ پێکهێنانی ئیشی رایخ ، سەرۆکی دایەرەی مەرکەزی بۆ لێکدانی نەمسا لەگەڵ رایخی ئەلەماندا، بەرێوەبەری دایەرەی مەرکەزیی بۆ یەکگرتنی وڵاتـەکانی (سودیـت) و (میمـل) و (دانزیغ)و (وڵاتەکانی رۆژهەڵات)و (اوبن)و (مالمیدی)و (موریسنوت) لەگەڵ ئەلەمانیا ، بەرێوەبەری دایەرەی مەرکەزی بۆ گێرانی ئیشوکاری وڵاتیی (بۆهیمیا)و (مۆراڤیا) ، بەرێوەبەری گشتیی ئیـدارەی حکومـەت لـە (سیتریای خوارو) و (کارنثیای سەرو) و (ئەلزاس) و (لورین) و (نرویج)و وڵاتە داگیرکراوەکانی کە بوو •

٩ــ رۆبرت لی : لە ٩٣٢وەوە تا ٩٤٥ ئەندام لەپارتی نازیو رایشلیتز ، بەرێوەبەری ریکخستنی ئیشوکاری پارتی نازیی ، ئەندام لە ریخشتـاخ ، سەرکردەی کۆمەڵی کرێکارانی ئەلەمان ، جەنەراڵ لەکۆمەڵی (اس ــ ای) دابوو •

١٠ــ سوکول : لە ٩٢١وە تا ٩٤٥ ئەندام لە پارتی نازیو ئەنجومەنی ریخشتاخدا ، پێشەوا لەوڵاتی ثورنجیا ، مندوبی گشتیی بـۆ ئاگاداریی ئیشی کرێکاران لە پڕۆژەی چوار ساڵاندا ، جەنەراڵ لەکومەلی (اس ــ اس)و (اس ــ ای)دا بوو •

١١ــ سبیر : لە ٩٣٢وەوە تا ٩٤٥ ئەندام لەپـارتی نـازی رایشلیتزو ریخشتاخدا ، وەزیری (چەك و زەخیرەی شەڕ)ی رایخ ، سەرۆکی کۆمەڵەی (توت) ، بەرێوەبەری گشتیی پرۆژەی چەك دروسـتکردنی چوار سـاڵی بوو •

---

(١) ذوی القمصان السوداء .

١٢ــ فرنك : له ٩٣٢ وەوە تا ٩٤٥ ئەندام لەپارتی نازی ، راوێژکــەری هتلر له کاروباری ئابوریدا ، سەرۆکی بەشی رۆژنامەی دەوڵەت ، سکرتێری دەوڵــەت لەبــاسی (دعایه)و بــیرو بروادا ، وەزیری ئــابوری پروسیا ، ئەندام له ئەنجومەنی وەزارەتی پارێزگاریی رایخدا بوو •

١٣ــ شاخت : ئەندام له پارتی نازیو ریخشتاخ ، وەزیــری رایــخ لەکاروباری ئابوریی ، وەزیری رایخی بێوەزارەت ، ســەرۆکی بــانقی رایخی ئەلەمانی بوو •

١٤ــ فۆن بابن : له ٩٣٢ وەوە تا ٩٤٥ ئەندام له پارتی نازیو ریخشتاخ راوێژکەرو جێگری مستشاری رایخ لەدوای هتــلر ، مەنــدوبی بــەرزی ئەڵەمانیا لەسار ، نوێنەری ئەلەمانیا له رێکەوتندا لەگەڵ فاتیکان ، شابەندەری ئەڵەمانیا له ڤیناو تورکیا لەکاتی شەررا •

١٥ــ کروب : له ٩٣٢ وەوە تا ٩٤٥ سەرپــەرشتیکەری پیشەسازیــە یەکگرتوەکانی فردریك کروب ، ئەندام له ئەنجومەنی ئــابوری گشتیی ئەلەمانیا ، سەرۆکی هەرەبەرزی دەرهێنانو پەیداکردنی ئاسنو کان لەژێــر چاودێری وەزارەتی رایخی ئابوریدا •

١٦ــ فون نوراث : له ٩٣٢ وەوە تا ٩٤٥ ئەنــدام لەپــارتی نــازیو ریخشتاخ ، جەنەراڵ له کۆمەڵی (اس ــ اس)و وزیری رایخ لەکاروبــاری دەرەوەدا ، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزارەتی نهێنی ، نوینەرو پاسەوانــی رایخ له بوهیمیاو مورافیا بوو •

١٧ــ بالدور فۆن شیراخ : له ٩٢٤ وه بۆ ٩٤٥ ئەندامو سەرکردە لەپارتی نازیو ئەندام له ریخشتاخ ، فەرماندەری دەستەی گەنجانی رایخ کەســەر بەکومەلی (اس ــ ای) بوو ، سەرۆکی کومەڵەی هتلر ، قومیسری کاروباری

پاریزگاریی رایخ ، سەرۆکی لقی پارتی نازی لە ڤیینا (نەمسا) ، بەڕێوەبەری کاروباری پارتی نازی لە رووی پەروەردەی بیری گەنجانی ئەلەمانیاوە بوو •

١٨ــ زایس أینکوراث : ئەندام لەپارتی نازیو ریخشتاخ ، جەنەراڵ لە کۆمەڵەی (اس ــ اس) ، راوێژکەری دەوڵەتی نەمسا ، وەزیری وڵاتو ئاسایشی گشتیی لەنەمسا ، ئەندام لەوەزارەتی رایخ ، وەزیری رایــخی بێوەزارەت ، سەرۆکی ئیدارەی شارستانی لەبەشی خواروی پۆڵەنــدە ، جێگری حاکمی گشتیی لە وڵاتی پۆلەندەی داگیرکراو ، قومیسێری رایخ لە هۆڵەندەی داگیرکراو •

١٩ــ شترایخر : ئەندام لەپارتی نازیو ریخشتــاخ ، جەنــەرال لــە کۆمەڵــەی (اس ــ ای) ، موتەســەریفی وڵاتی (فرانکونیــا) ، ســەرۆکی دەرکردنی رۆژنامەی (درستورمــەر) کە بە تایبــەتی لــەدژی رەگــەزی جوولەکە بوو •

٢٠ــ کایتل : لە ٩٣٨وە تا ٩٤٥ سەرۆکی دەستەی بەرزی بەڕێوەبردنی هێزی چەکداری ئەلەمانیا ، ئەندام لە ئەنجومەنی وەزارەتــی نــەهێنیی ، ئەندام لە ئەنجومەنی وەزارەت لەبابەت کاروباری پاریزگاریی رایخەوە ، پێشەوا لە لەشکرا لە پلەی فیلدمارشالدا •

٢١ــ یۆدل : لە ٩٣٢وەوە تا ٩٤٥ لفتنانت کولونیل بوو لە دایەرەی کاروباری جوڵانەوەی سپادا لە دواییدا بووبە میجەر جەنەرال وەسەرەکی دەستەی سەرەواری سوپا ، ئنجا بووبە کولونیل جەنەراڵ •

٢٢ــ ریدر : لە ٩٢٨وە تا ٩٤٥ فەرماندەری بەرزی هێزەکانی ئاویی دەریا واتا سەرداری بەرزی دەریــا ، ئەنــدام لەئەنجومــەنی وەزارەتــی نەهێنیدا ، خاوەنی نیشانەی ئەمیرالی دەریا بوو •

٢٣ــ کارل دونیتز : لــە ٩٣٢وەوە تــا ٩٤٥ فەرمــاندەری بــەشی

ژێرزریـەیی ( ردیجـن ) ، لەدواییـدا بووبـە فەرمـانـدەری بـەرزی هەموو چەکەکانی ژێر زریەی ئەڵەمانیا ، ئنجا بووبە یاریـدەری ئەمـیڕال ، لەدواییدا بووبە ئەمێرالی تەواو • ئنجا سەردار (ئەمیر)ی بەرزی دەریـا ، دوای ئەوە فەرماندەری گشتیی هەموو چەکی دەریایی ئەڵەمان ، راوێژکەری هتلر ، جێنشینی هتلر لەسەرۆکایەتی دەولەتی ئەڵەمانیادا •

٢٤ــ فریتزش : لە ١٩٣٣وە بۆ ٩٤٥ ئەندام لەپارتی نازی ، ســەرۆکی دەرکردنی رۆژنامەی دەولەت (دویتشە ناخریختن) سەرۆکی بەرزی دایەرەی بێتەلی ئەڵەمانیا ، سەرۆکی بەرزیی بەشی رۆژنامەی ناوخۆ کە سەر بـە وەزارەتی پرۆپاگاندەی ئەلەمانیا بوو، جێگری وەزارەتی رایخ لەپروپاگاندەدا، سەرۆکی بەشی رادیۆو بێتەل لەلقی پرۆپاگاندەی پارتی نازی ، منـدوبی گشتیی لەلایەن پارتـەوە بۆ چـاودێریی ئـاگاداری کردنـی گشـت ئێستگەکانی رادیۆو بێتەل •

**کۆمەڵە گوناهبارەکانی ئەڵەمانیای نازی •**

ئەو کۆمەڵانەی لەسەر بڕیاری دادگا سوپاییەکەی دەولەتان بە گوناهبار دانران ئەمانە بوون :ــ

١ــ ریخشتاخ : پەرلەمانی ئەلەمانیابوو کە پێش هـاتنی نازیـەکان ئەنجومەنێکی تشریعی دەسـتوری بوو بـەڵام دوای هـاتنی نازیـەکان ، هەلبژاردنی ئەندامەکانی نەما ، بەڵکو هەریەکێکیان بەدانان دائەنران •

٢ــ کۆمەلی فەرماندەری پارتی نـازی : ئەم کۆمەڵـە لەوکەسـانە پێکهاتبوو کە سەرناوی پیشەوای سیاسییان بووە بیئەوەی سەیری جیگاو ئیشی لەدەولەتدا کرابێت •

٣ــ تیپی (اس ــ اس) : ئەم تیپە لە سالی ١٩٢٥دا هتلر رێکیخست ، لەپێشەوە لەئەندامەکانی تیپی (اســای) هەلبژێرران بۆ ئاگاداریی گیانی

فوهررو سەرۆكو فەرماندەرەگانی پارتی نازی ، لەدواییدا لەگەڵ پۆلیسی ئەڵەمانیادا بە سەرکردەیی هملر تێکەڵ کران •

٤ــ تیپی (اس ــ ای) : ئەم تیپە لە ساڵی ١٩٢١دا لەژێر فەرمانی تایبەتی فوهرر (هتلر) خۆیدا دامەزرا، تاکو لەپاشەرۆژدا پەرەی سەندو زۆربــوو بووبە لەشکرێکی گەورەی سەر بەپارتی نازی ، ئاژاوەنانەوەو دوبــەرکی خستنەوەو تۆقاندنی ئەو کەسانەیان پێ‌سپێرابوو کە حەزیان لەپارتی نازی نەئەکرد ، یا بەربەرەکانیان ئەکردن لەم دوایییەشدا هەرچی ئیشی نەهیــنی (جاسوسی) بوو بەئەندامانی ئەم تیپە سپێررا بوو •

٥ــ جستابۆ : یاخود پۆلیسی نەهێنی : کە نازیەکان هاتنە سەرکــار دوای ئەوە غورنغ دایمەزراند ، لق‌و پۆپی بە هــەموو ئەڵەمانیــاو وڵاتــە داگیرکراوەکانا (لەکاتی شەررا) بڵاوبوەوە ئەرکی سەرشــانی جستــابۆش دیسانەوە هەر نەهێشتنی هەموو بەربەرەکانیەك بوو بەرامبەر بەپارتی نازی‌و سەرکردەو فەرماندەرەکانی‌و لەناوبردنی هەرکەسێك یا کۆمەڵێك کە دژیان بێت ، لەم روەوە ئەندامەکانی جستابۆ هەرچیەکیان بکردایەو هەر کەسێکیان بکوشتایەو ببریایە لێپرسینەوەیان نەبوو •

٦ــ کۆمەڵی سەرەواری جەنگ‌و فەرماندەریــەتی بــەرزی هــێزی چەکداری ئەڵەمانیا [1] : ئەوانەبــوون کە لەمــانگی شوباتی ١٩٣٨وە تاکو مایسی ٩٤٥ هەرکەسە فەرماندەریك یا پێشەوایەك لە هێزی هــەوایی یــا دەریایی یا وشکانی ئەڵەمانیا دابووە •

---

(١) هیئة ارکان الحرب وقیادة الجیش العلیا للقوات الالمانیه المسلحه .

**شکاندنی پەیمانو دەستەبەربوونو خۆئامادەکردن بۆ شەڕهەلگیرساندن :**

ئەو پەیمانو ڕێکەوتنو دەستەبەربووئانەی دەولـەتەکان لەنـاو خۆیـاندا بڕیاریان دابوو کە ئەڵەمانیاش مۆری کردبـوو ، بۆ جێبەجـیکردنی هـەر ناکوکیەك ڕوویدا بە ئاشتی بۆئەوەی هیچ شەڕریك هەڵنەگیرسیت ، یەکێك لەو پەیمانانەی ئەڵەمانەکان کردیان بەژێر پێوە ، ئەو پەیمانە بوو کە لەڕۆژی ٢٦ی تەموزی ساڵی ١٨٩٩دا لەلاهای مۆرکرا ، ئەڵەمانەکان هەر لەخۆیانەوە لەڕوژی شەشی نیسانی ١٩٤١ هەڵیانکوتایە سەر یونانستانو یوغوسلافیاو داگیریان کردن ، بەپیچەوانەی پەیمانەکەیانەوە کە ئەبوایە ڕیگای ئاشتییان بگرتایە بۆ نەهێشتنی ناکۆکی لەناواندا • دیسانەوە ئەڵەمانەکان پەیمـانی لاهای کە لە ڕۆژی ١٨ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٠٧دا بڕیار درابوو بـۆ گرتنی ڕێگای ئاشتیی لە هەموو ناکوکیەکدا کرد بەژێر پێوە کەچی بـە پێچەوانەی ئەوەوە هەڵیان کوتایە سەر ئەم دەولەتانـە لەوروژانـەدا کـە لەخوارەوە نوسراوون بێئەوەی ڕێگای ئاشتی بگرن :

لە یەکی ئەیلولی ساڵی ١٩٣٩دا هەڵیانکوتایە سەر پولندەو داگیریان کرد•

لەنۆی نیسانی ١٩٤٠دا هەڵیان کوتایە سەر نرویجو دانمارك •

لەدەی مایسی ١٩٤٠دا هەڵیان کوتایە سەر لوکسمبرغو بلجیکاو هولندە داگیریان کردن •

لە بیستودوی حوزەیرانی ١٩٤١دا هەڵیان کوتایە سەر روسیا

لەڕۆژی یانزەی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٤١دا بڕیاری شەڕیان لەگەڵ ئەمریکادا دا •

**تـاوانی گوناهبـارەکان •**

ئەو زۆرداریو دەستپیسیانەی ئەڵەمانەکان بەکاریان ئەهینا لەکاتی شەڕرا ئەمانە بوون :

**برگەی یەکەم : کوشتن‌و توندجولانەوە لەگەڵ شارستانیەکاندا :**

دەستوری شەر وەهایە لەشکری سەرکەوتوو پێویستە جولانەوەی لەگەڵ شارستانیەکاندا (کە شەرکەرنین) باش‌بێت ، کەچی ئەڵەمانەکان بەپێچەوانەی ئەم دەستورەوە چی جەورو بەدکاری‌بوو ئەوەیان بەکار ئەهێنا وەکوو : ئەندامی‌لەش پەراندن ، خنکاندن ، شیشی سورەوەکراو کردن بەلەشدا ، هەڵکیشان لەئاوی سارد ، ئەمانە بوون بەهۆی ئەوەی زۆرکەس لەبەندیخانەو زیندانەکان بکوژرێن‌و لەناوبچن •

هەروەك لەفەرەنسە روویدا :ـ

١ـ لەو (٢٣٠) ئافرەتە کە لەشاری (کومپیان) دوورخرانەوە بۆ زیندانی (اوزفیتش) ، لە دوای چوارمانگ (١٨٠)یان لێ مرد •

٢ـ لەیەکی کانونی‌یەکەمی سالی ٩٤٣وە تاکو ١٥ی نیسانی سالی ٩٤٥ (٢٢٧٦١) کەس لەزیندانی (بوختوالد) مردن •

٣ـ (١١٥٦٠) کەس لەزیندانی (داخاو)دا لەیەکی کانونی دوەمی ٩٤٣وە بۆ ١٥ی نیسانی ٩٤٥ مردن •

٤ـ مردنی (٧٨٠) قەشە لەبەندیخانەی ( موسویسن ) لە نارەحەتی‌و جگە لەوانە بەجۆرێك ئازاری بەندیەکانیان ئەداو ئەیانچروساندنەوە کە لە مێژووی ئادەمیزادا شتی وەها نەبیستراوەو رووی نەداوە وەك :ـ

بەکارهێنانی لاشەی زەلامی زیندوو لەئیشی (مختبر)دا • بەم جۆرە (٦٠٠) کەسیان لەناو شارەکانی ولاتی دانیمارکداو لەهولندە (٥٠٠) کەس‌و لە لوکسمبرغ (١٠٢١) کەس لە روسیا (مليونو نيويك) تەنها لە زیندانی (میدانك)و (چوار ملیون) لەزیندانی اوزفیتش‌و (٧٠٠) هەزار کەس لەشاری ( لغاو ) کوشت ، کوشتنەکەشیان یا بە ورگ هەلدرین یا رەقکردنەوە لەناو سەهولاوا یا لەسەر لێدانی کەمانچەی هەندێك لەبەندیە کەمانچەژەنەکان ئەکوژران •

لەمانگی حوزەیرانی ١٩٤٣دا ئەڵەمانەکان بۆئەوەی گونـاهو خراپەکانیان بشارنەوە ، زۆر لەلاشەی کوژراوەکانیان ئەسوتاند ، ئنجا ئێسقانەکانیـان ئەهاڕین بۆ ئەوەی لە کشتوکالدا بەکاریان بێنن •

لە ساڵی ١٩٤٤دا ، هەر لەروسیا سێ زیندانی گەورەیان پێك هێنـا ، بەهەزارەها زەلامیـان تیئەچڕانـد ، ئنجـا نەخوشـیداری گرانەتیـاوی یارشانەوەیان تیکەڵاو ئەکردن بۆ ئەوەی هەموویان تووش ببـن • بەبـن میچەکانەوە لەشاری (بیاتیغورسك) لەروسیـا زورکەسیـان بەزینـدویی هەڵئەواسی تاکوو ئەتاسان ، ئنجا فڕێیان ئەدانـە خـوارەوەو بـەگوللە ئەیانکوشتن •

لەدەوروپشتی شاری (ستالینغراد) ، دوای ئەوەی ئەڵەمانەکان شکان، روسەکان زیاتر لەهەزار لاشەی زەلامیان دۆزیەوە ، کە هەموو گـوێ یـا لوت یا دەست یا قاچ (یا مەمك)یان بڕابوو •

**بڕگەی دووەم : دوورخستنەوەو ئیشی زۆر (سوخرە) •**

ئەڵەمانەکان هەر جیگایەکیان داگیر بکردایە ، خێرا دانیشتوی ئـەو وڵاتەیان ئەگواستەوە بۆ ئەلەمانیا یا بۆ جیگایەکی تر ، کە ماکینەو کارخانەی چەك دروستکردنی خۆیانی لێبوو • بە زۆرو بێپارەو خەرجی ، ئیشیـان پێئەکردن بۆ ئەوەی شەڕەکەیانی پێ بەرێوەبەرن •

هەر وەك لەفەرەنسە لەساڵی ١٩٤٤دا (٦٥٢٠٠) کەسیان بۆ لایەکی تر دوورخستەوە ، لە روسیا (٤٩٧٨٠٠٠) کەس ، لە چیکوسلوڤاکیا (٧٥٠٠٠٠) کەسیان دوورخستەوە •

**بڕگەی سێیەم : کوشتنو بەتوند جوڵانەوە لەگەڵ دیلەکاندا :**

ئەلەمانەکان زۆریان لەدیلەکان ئەکرد ، کە بەپێ ریگایەکی دورو درێژ ببڕن،

زۆرجار ئەگەیە شەشسەد کیلۆمەتر بێئەوەی خواردنێکی وەهایان بدەنێ بەری دڵیان بگرێت ، هەندێ جاریش زۆریان لێئەکردن چلوهەشت سەعات بەڕاکردن بەبێ وەستان بڕۆن ، ئەگەر یەکێکیان بوەستایە یا دوا بکەوتایە ئەیان کوشت • لەبەندیخانەکانی شاری غرودینز (رافا ــ روسکا) خواردنیان ئەوەندە کەم ئەدا ، جاریوا هەبو بەسیوپێنج کەس سەمونیکیان بەرئەکەوت•

**بڕگەی چوارەم : کوشتنی بارمتەکان •**

ئەلەمانەکان لەمانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤١دا (٢٣٠٠) ئافرەتی بارمتەی یوغوسلافیاییان بەگوللە لەشاری (کراغنیفاتز) کوشت ، هەروەها لەشاری (کرالیغوش) هەر لە یوغوسلافیا پێنج هەزار ئافرەتی کەیان کوشت•

**بڕگەی پێنجەم : تالاّنکردنو شێلاندنی سامانی گشتیی‌و تایبەتی :**

ئەو گوناهبارانەی ئەلەمان هەر ولاّتێکیان داگیربکردایە دەسبەجێ پڕیان ئەدایە سامانی گشتیی تایبەتی مللەت‌و دەولەت بۆ بێ‌هێزکردنی هێزی ئابوریی ولاتە داگیرکراوەکان‌و هەژارکردنیان‌و بۆ بەهیزکردنی ماکینەی جەنگ‌و کۆکردنەوەی سامان بۆ خویان ، لەم روەوە هەرچی خواردەمەنی یا کانگەیەك بۆ پیشەسازی بشایە ئەیانناردە ئەلەمانیا ، ئنجا دەستیان ئەگرت بەسەر هەموو کارخانەو چەرخێکا لەهەرلایەك بوایە • هەرجێگا یا شوێنێکیش‌یان بەجێ‌بهێشتایە هیچیان بەساغی تیا نەئەهێشتەوە ، یەکە یەکە شارەکانی پیشەسازیی‌یان وێران ئەکرد ، جگە لە وێرانکردنی ، هەموو ئاموژگایەکی خوێندەواریی‌و زانیاری لە ولاّتە داگیر کراوەکاندا •

بابی (٧٩٫٩٦١٫٤٧٩٫٠٠٠) فرەنك کانگەیان لە فەرەنسە لەکاتی شەردا سەندو ئەو دراوو پارانەی لەدەولەتی فەرەنسەیان هەر لەکاتی شەررا بەهەر جورێك بێت سەند لەحزیرانی ١٩٤٠وە تا ٩٤٤ نزیکەی (٦٣١٫٨٦٦٫٠٠٠٫٠٠٠) فرەنك بوو •

له روسیا زیاتر له (١٧١٠) شارو (حەفتا هەزار دێ‌و شـەش ملیـون) خانوویان روخاندو وێران‌کرد ، کە ئەمەبووبە هـۆی ئەوەی بیست‌وپینـج ملیون کەس بەبێ شوێن‌و جێگا بمێننەوە •

ئەلەمانەکان بریاریان دابوو ، هەرچی شارە گەورەکانی روسیا هەیـە ژێرەوزەبەریان کەن‌و یەکیان لێ‌دەرنەکەن • هیچگار شـاری (بطرسبورج) کە (فوهرر) خۆی فەرمانیکی دەرکردبـو «کە مانـەوەی ئەم شـارە دوای ئەوەی هەموو روسیامان داگیرکرد ، پێویست نی‌یە» •

جگە لەوانە هەر لە روسیادا هەرچی پەیکەرو دانراویکی زانیـاری‌و سەلاری بوو هەمویان وێران‌کرد هەروەك لە شـاری (میخایلوفسکویـە) گۆڕی بویژی بەناوبانگی روس (بوشکین)یان لەبن‌دەرهیناو ئەتتیکەخانەی (لیون تولستوی)و گۆڕەکەشیان هەڵتەکاندو لەشاری (کلین) پاشمـاوەی کەمانچەژەن (تشایکوفسکی)یان هەموو لەناوبرد هەروەها (١٦٧٠) کلێسای ئەرسۆزۆکسەکان‌و (٢٣٧٠)ی کاسۆلیك‌و (٦٧)ی بچوك بچـوك‌و (٥٣٢) کەنشتەی جولەکەیان ویران‌کرد •

**برگەی شەشەم : ئازاردان‌و چرۆساندنەوەی گشتی‌ی :**

ئەلەمانەکان سیاسەتیکی گشتیان بۆ چروساندنەوەو ئازاردانی گشـت دانیشتوانی وولاتە داگیرکراوەکان هەبوو ، هـەروەك یەکێـك دەسـتی لێ‌بکردنایەوە یالێی بکوشتنایە بەلآم نەیاندوزیایەوە ئەوان ئەو سەرانەیەیان بەهەموان بەکوشتن یا بە تالآنکردن ئەبژارد •

ئەو سەرانەیەی لەفەرەنسەیان لەکاتی شەررا سەند گەیشتە (٤٨٤ر ١٧٩ر١٥٧ر١) فرەنك •

**بڕگەی حەوتەم : روخاندنی شارودێو بنکە بە خۆڕایی .**

ئەم گوناهبارانە زۆر لەشارو دیهاتو خانویان ئەروخاند یا ئەسوتاند بەخۆڕایی بێ ئەوەی پێویستیەکی بۆ بەریوەبردنی کاروباری سوپا هەبێت هەروەك شاری (شیربلاغ) لەنرویجو (سانت دییە)و دیهاتی (سانتتیریز ، لامور ، سیویان) لەفەرەنسە روخاند ، جگە لە زۆر دیهاتو شاری تر لــە یوغوسلافیاو چیکوسلوفاکیاو روسیا .

**بڕگەی هەشتەم : ئیشکردنی زۆربە شارستانیەکان :**

هەروەها زۆر ئیشو سوخرەیان بەو شارستانیانە ئەکرد کە حەقنەبوو بەگوێرەی پەیمانی ناو دەولەتانو چونیەتی شــەر پێیــان بکرێ یــا بــۆ بەریوەبردنی کاروباری لەشکر پێویست بن ، هەروەك لەفەرەنسە لە ساڵی ٩٤٢وەوە بۆ ٩٤٣ نزیکەی (٩٦٣ر٨١٣) کەسیان بە زۆر نــارد بۆ ئەلەمانیا بۆ ئیشکردن لە کارخانەکانیا .

**بڕگەی نۆهەم : بلاوکردنەوەی خوو رەوشتو بیرو باوەری نــازی لە وولاتــە داگیرکراوەکاندا بە زۆر :**

هەروەها ئەم گوناهبارانە هەرچیەکیان لەبارا بوو کردیان بۆ ئەوەی هەستی نیشتمانپەروەریی لەبیری دانیشــتوانی ولاتــە داگــیرکراوەکان بەرنەوەو لەیەکیان دورخەتەوەو بۆ ئەوەی ئیشی خۆیان باشتر برواو زیاتر سەربگرێ ، لەم روەوە کارەساتیکیان ئەکرد هیچ کاتێك لە مێژودا شتیوەها رووی نەداوە ، بەجارێك دانیشتوانی شارێك لە ولاتیکی وەك فەرەنسەیــان ئەگواستەوە بۆ شارێك لە پولندەو لەجێگای ئەوان لەئەلەمانەکانی خۆیان دائەنــا .

لە ٢٨ی ئەیلولی ٩٤٠دا فەرمانیکی ئەلەمــان بۆگشت دانیشتــوانی ولاتی (موزیل) لەفەرەنسە دەرچــوو کە پێویستە لەســەر هەر خێزانیــك نەتۆرەو ناوی خیزانیی لەفەرەنسەییەوە بۆ ئەلەمانی بگۆرێت .

ئەوانەی لەپێشەوە لەبەندەکانا باسکران ئــەو تۆمانجانــە بوون گــە ئاراستەی ئەو چەند کەسانەکران کە لەلایەن محکمەی گشتیی لەشکریی سویندخوارانەوە هێنرابوونە لێپرسینەوە •

ئەو هەموو گوناهانەی گیرامانەوە هەریەکە نموونەیەکن بۆ جــۆرە تاوانێك نەك ئەوانە هەموو تاوانەکانی ئەم گوناهبارانە بوبــن‌و هیچی‌تــر کەلەکاتی شەرا بەکاریان هیناوەو کردویانە •

ئەم گوناهبارانە محاکەمەکران بــەلام بێگومــان فەرمــانی دادگــا هەرچۆنێك بێت‌و چەند قورس‌و گران بێت ، ئنجا تا جیهان بێــت تۆڵەی ئەو هەموو لێقەوماوو کوژراوو بریندارو ماڵویران‌و دیل‌و برسیی‌و هەژارو بێتاوان‌و بێ‌گونــاهانە ناسێنــێ کە شــەڕی گەورەی دوهــەمی ئەڵەمانەکان داوینی گرتن ، ئەوەی بەسەری هێنان هێنای ، چونکە گوناهی ئەمانە لەوە دەرچوبوو کە لەوزەدابێت‌و تۆڵەی بسینرێت •

لەراستیشدا هەندێك لەوانە حوکم‌دران ، هەندێکیان رزگاریان بوو ، لەوانەی حوکمیش‌دران هەندێکیان لەدواییدا حوکمەکەیان تەواو کرد یــا فەرمانی لێخۆشبونیان [1] بۆدەرچو ، بەکورتی زۆر لــە تاوان‌بــارەکان گوناهەکانیان ئەدایە پاڵ (فوهرر) کە ئەویش کەس نەیزانی چــۆن خــۆی لەناوبرد ، پێش ئەوەی دەستی هێزەکانی سویندخۆرەکانی بگاتێ •

**سەرنــج لەم کارەساتــە :**

بەداخەوە درێژەی ئەم دادپرسی‌یەم بەتەواوەتی هەر دەست نەکەوت، بەلام لەهەمان کاتیشدا نەم‌ویست خویندەواری کورد لــە بــاسی تــاوان‌و

---

(١) وەکو دکتور شاخت پسپۆری ئابوری‌و سەرۆکی بانقی رایــخ لــەکاتی نازیەکاندا ، بەلام لەدواییدا سەهیونیــەکان لەیەکێــك لەدەوڵەتــەکانی ئەمەریکای لاتینی گرتیان‌و بەدزیەوە بردیانە (تل‌أبیب) .

تاوانبارەکانی نازیەکان بێبەش بکەم بەم سەرپۆتەش بێت کەوا پێشکەشم کردون • واتا ئەمان توانی لەجۆری داوەریەکە بکۆلینەوە ، بەڵام ئەوەندە ئەڵێین ، ئەم دادگایە یەکەم بوو لە جۆری خۆیو لەوەپیش لەمێژوودا شتی وەها رووینەداوە ، دەولەتە گەورەکان بەگوێرەی پەیمانی لەندەن ئەم دادگایەیان دامەزراند بۆ چاوترساندنی کاربەدەستانی دەولەتانیتر کە نەخەلەتابن جارێکیتر شەرر هەلگیرسێنن ، چونکە شەرری ئێستا شەرری لەناوبردنی مرۆڤایەتیەو داوێنی هەموو کەس ئەگرێتەوە ••• بگرە داوێنی هەموو زیندەورێك ئەگرێتەوە ، بەتایبەتی دوای بەکارهێنانی بۆمبای (ئەتوم) وجۆرەکانی کە ئێستا جارەهایجار پەرەیسەندوە، واتا ئەگەر شەر ببێتەوەو ئەو چەكو بومبایانەی ئەمرۆ هەن، بێتو بەکاربهێنرێن،جیهان خاپور ئەکەنو ئەوەیش کە بمێنێتەوە سەقەتو دەستەوستان ، رەنگەهەیە رۆڵەی رۆڵەشی هەر خێر لەخۆیو لەخاکەکەیو لەوهەوایە نەبینی کە هەڵیئەمژێت ••• ئا لەم سەیرکردنو بیرکردنەوەشەوە بوو کە (کومەلی میللەتانی یەکگرتو)و (ئەنجومەنی ئاسایش) دامەزران ، کەهەر ناکۆکیەك رووبدا لەناو دەولەتاندا، بەخۆشیو قسەلێکردن چارەسەری بکەن نەك بە پەلاماردانو شەر ، لەهەمان کاتیشدا هەموو دەولەتان پێکەوەو لەژێر سیبەری کۆمەلەدا هەولی پیشکەوتنی مرۆو خێرو خۆشی بدەنو لەناویەکدا یارمەتی یەکتربدەن •••

ئەو شەرەی هیتلەرو پارتەکەی هەلیانگیرسان بەنیازی داگیرکردنی هەموجیهانو حوکمی هەموو رووی زەمین ، مژینی خوینی هەموو مرۆ ، (گەلی ئەلەمانیش بەژوور سەر هەموانەوە) ، بێگومان ئەمە خەوێك بوو نەك هەر هیتلەر دیبوی ، بەلکو پێش ئەویش گەلێك کەس دیی بەلام بۆی نەهاتەدییو ئێستاش دوورنیبە زۆر کەس ئەو ورینەیە بکات ، بەلام هەرگیزاو هەرگیز هەر حەق شوێنی خۆی ئەگریو ئالایداد ئەشەکێتەوەو (سەگی هاریش هەر چلشەوی عەمر) ئەبێت •

هیتلەر کە دوا رۆژی رەشی سامناکی بەچاوی خۆی دی ، ئەوەبـــوو خۆی لەناوبرد دوای ئەوەی پارتەکەی بەقـــررداو ولآتـــەکەیو جیهـــانی ویرانکرد• بەڵێ هیتلەر مردۆ مرۆڤایەتیو گەلانی خێرخواو ئازادیخوازانی سەر رووی زەمین دەستیان دایە دەستیەكو چاکیان لیکرد بەلادا ، جیهانیان گیرایەوە دوخەکەی ئەوساو گەلێك زیاتریش، ئەوەندە پەرەی سەندو هێزی گەلانی ئازادی سەر رووی زەمینیش ئەوەندە زیادی کردو یەکی گرت، کەس حەددی ئەوەی نییە جارێکیتر ئەو فلیمە سامناکانەی پێشو بخاتەوەکارو دەست لەشیرازەی ئاسایشەوە بدات ، چونـــکە ئەوانـــەی کە ئەو ئـــاگری جەهەنەمەیان هەلگیرسان لەپێش هەموو کەسیکدا خۆیانی تیا سووتاندوبوون بەکۆلەوژ ، بەلآم دەردی ئەلێن ئەو تاوانبارانە رۆژی دەجار زیندوبکرێنەوەو بکوژرێنەوە هێشتا هەزاریەکی تۆلەی ئەو تاوانانەیان لیناکرێـــتەوە کـــە بەرامبەر بەمیللەتانو مرۆڤایەتی کردیان •

ئومید ئەکەین کاربەدەستانی ئەمرۆی دەولەتانو بەتایبەتی دەولـــەتە گەورە بەهێزەکان ، پەندو دەرسیان لەو هەمو بەسەرهاتو کارەساتانـــەی رابوردو وەرگرتبێتو ئیتر نەکەن پێ بەپشکۆی شەردا بنینەوە چونـــکە لەپیش هەموو کەسێکدا داوێنی خۆیان ئەگرێتەوەو خۆیانی پێ ئەسووتێن•

# محاكەمەی مصدق [1]

سەرەك وەزیرانی پێشوی ئێران •

لەگەڵ باسێكی كورت لە محاكەمەی جەنەرال ریاحی سەرەك پێشەوای جەنگی ئێران لەسەردەمی مصدق‌دا •

پێش ئەوەی دەست‌بكەین بەباسی چۆنیەتی محاكەمەكەو روداوی رۆژبەرۆژی بەكورتی باس بكەین ، ئەڵێین ، محاكەمەی مصدق لەكاتی خۆیدا بە ئاشكرا ئەكرا ، ئەمیش لەسەرخواستی (شا)ی ئێران‌و حكومەتەكەی بوو ، رووداوی دانیشتنەكان رۆژبەرۆژ لەلایەن رۆژنامەچی‌و نوینەری رادیۆو ئاژانسەوە ئەگوێزرایەوە بە هەمولایەكی جهاندا ، بەجۆرێك ئەو چەند رۆژی محاكەمەیە بووبوو بە بەشێك لەژیانی زۆركەس ، نەك هەر لە ئیراندا ، بەڵكو لەگشت جهاندا ، چونكە دكتور مصدق پیاوێكی نیشتمان پەروەری راست‌و پاك‌و مەشخەڵی جولانەوەی ئازادیخوازانەی میللەتانی خەبات‌كەری گیتی‌بوو •••

ئنجا با لەپێشەوە بزانین دكتور مصدق كێ‌یەو لە كورتەیەكی ژیانی بگەین •

محمد مصدق كوری میرزا هدایت لە ١٨٧٩/٩/٤دا هاتۆتە دنیا ، دوای

(١) زنجیرەی ئەم محاكەمەیە لەكاتی خۆیدا مامۆستا علی البصری لە (دار منشورات البصری) بەناوی (محاكمة مصدق) لەساڵی ١٩٥٤دا دەری ئەكردو لەچاپخانەی (سعد) لەبەغدا لەچاپ ئەدرا .

ئەوەی خوێندنی سەرەتایی تەواوکرد ، لە ساڵی ١٨٩٦دا بەفرمانبەر دامەزراو دە ساڵ تیدامایەوە ، زۆر بەپاکیو دڵسۆزی ئەو ئیشەی بردەسەر • لە ساڵی ١٩٠٦دا چو بۆ خوێندنی زانستیی رامیاریو دارایی لە پـاریس ، بەڵام لەبەر نەخۆشی بۆی تەواو نەکرا گەرایەوە ، دوای بەینێکیتر چوەوە بـۆ سویسرا ، ئەم جارە بۆ خوێندنی (حقوقو قانون) ، پێش کۆتایی شـەری گەورەی یەکەم دکتۆرای تێدا وەرگرتو گەرایەوە بۆ ئێران • لـە سـاڵی ١٩١٧دا بەیاریەدەری وەزیری داراییو سەرۆکی محاسباتی گشتی دامەزرا ، توندیەکی زۆری لەپاکیو ئازایەتیەکی تەواوی لەراستیدا نواند ، کە ئەمـە بۆ ئەو دەمەو لەناو دزو بەرتیل خۆردا دەستی نەئەدا • نـاچار وازی لـە ئیشەکەی هێناو چووبۆ ئەوروبا ، ساڵی ١٩٢٠ واتا دوای ساڵێك گەرایەوە بۆ ئێران ، ئەمجار کردیان بە موتەسەریفی (فارس) تا ساڵی ١٩٢١ مایـەوە، لەو ساڵەدا رەزاخان (باوکی شا) [1] بەیارمەتی سەید زیاءالدین تەباتەبائی بە هێزی سوپا رژێمی حوکمی هەڵگێرایەوەو ، ئەم وازی هێنا ، تاکو لەیەکەم وەزارەتی (قوام السلطنه)دا بووبە وەزیری دارایی ، بەڵام تەنها دومانـگی تیدامایەوەو بووبە موتەسەریفی ئازربایجان ، لە ساڵی ١٩٢٤دا بووبە وەزیری دەرەوەو هەر لەو ساڵەداو لەدەورەی پێنجەمی پەرلەماندا بەنوێنەر هەڵبژیررا، هەروەها لە دورەی شەشەمیشدا هەڵبژیررایەوە لەم کاتەدا رەزاخان سەرۆکی وەزیران بوو ، لەژێرەوە لەگەڵ زۆر لەنوێنەرانی پەرلەماندا رێك کەوتبـوو کە ئەحمەد شای قاجار لەسەر تەختی شاهانە بهێنێتە خوارەوەو خۆی بچێتە شوێنی ، بۆ ئەم مەبەسە لە ساڵی ١٩٢٥دا پەرلەمانی کۆکردەوە ، بەڵام لـەو کۆبونەوەیانەدا مصدق چالاکانە دژی وەستاو وتی : (نابێ یەك کەس لەیەك کاتدا (شا)و سەرۆکی وەزیران بێت) ، لەمرۆەوە وتەیەکی دوسـەعاتیداو دوایئەوە هەستا پەرلەمانی پێش (دەنگ دان) بەجێهێشت •

---

(١) ئەم نووسینە پێش رووخاندنی شای ئـێرانو دامەزرانـدنی کۆمـاری ئیسلامیی ئێرانە .

دوای ئەوە کە (مستوفی الممالك)ی هـاوڕێو خۆشـەویستی ، وەزارەتـی پێکهیناو (فروغیو وثوق الدولە)ی تێخست ، ئەم لەپەرلەمـاندا لـەدژی وەستا چونکە لاپەڕەی سیاسی ئەو دوانە پاك نەبوو ، دوای ئەوە رەزاشـا داوای لێکرد کە ئەو وەزارەت پێك بهێنێت ، بەلاّم مصدق قبوڵی نەکردو ، ئەیویست هەر لەپەرلەماندا لەسەر خەباتی خۆی سوور بێت ، دوای ئـەوە رەزاشا کەوتە مەترسیەوە لێی ، دوریخستەوە بۆ ناوچەی خراسان ، ئەمە لە ساڵی ١٩٤١دا بوو کە سوێندخۆران لەشەری گەورەی دوهەمدا ئیرانیان داگیرکردو رەزاشایان لەسـەر تەخت لابـردو دووریـان خستـەوە بـۆ جوهانسبورگ تا لەوێ بە یەخسیری سەرینایەوە • دوای ئەوە مصـدق گەرایەوە تارانو لەدەورەی چواردەهەمی پەرلەماندا بەنوێنەر هەڵبژێررایەوە• لەو کاتەدابوو کە (قوام السلطنە) رێکەوتنەکەی لەسەر نەوتـی ئـێران لەگەڵ روسیادا بەست ، مصدق دژی وەستا ، هـەروەکوو هەمیشـە دژی نەوتدان بە ئنگلیزیش ئەوەستا • هاوکاری نەوتی ئەنگلوئیرانی لـە ساڵی ٤٩ەدا کە (رازمارا) سەرەك وەزیران بوو بەتەمای درێژەپێدانی (امتیـاز)ی نەوتو تالاّنکردنی ئیران بوو بەلاّم گەلی ئیران بەرامبەری وەستا ، ئـەوە بوو رازمارا تیاچوو ، دوای ئەویش (قوام السلطنە) کە شا بەزۆر سەپانی بەسەر حوکمدا ئەویش گەلی ئیران لەرۆژی (٢٥) تەمموزی ساڵی ١٩٥٢دا، خستیو هەر لەسەر خواستی گەل دکتور مصدق هات کە رابوردویەکی پاكو پیاوێکی نیشتمانپەروەرو هەڵگری مەشخەلی ئازادی ئیران بوو • مصـدق کەهات هەموو گەلی ئیران کەوتنە دوای (سودپەرستو پیـاوەکانی شـاو ئیمپریالیزم نەبێت) ، تاکو ئیمامێکی ئایینی وەك کاشانیو بقائی ئەوانیـش دوای کەوتن (هەر چەندە لەدواییداو کە گەیشتنە مەبەسی خۆیان ، ئەوانو زۆریش لەو بابەتە لێی هەڵگەڕانەوە ) • پەرلەمان دەسـەلاّتی تـەواوی پێبەخشی ، ئەویش لەناوەوەی ئیراندا دەستیکرد بـە گۆڕینـی یاسـا

رزیوەکانی پێشوو ، گەلێك یاسای پێشکەوتنخوازانەی ئەوتۆی دانا کــە هەموو بۆ سودی گەلی ئیرانبن ، یەکێك لەوانە یاسای سەندنەوەی نەوتی ئیران بوو لە ئنگلیز ، واتا خۆماڵی کردنی نەوت ، ئەمــە هەر هیچــگاری ئنگلیزو ئەمەریکای شێتکرد ، ئنگلیزەکان لە دادگای داد لە مانگی ئەیلولی ١٩٥٢دا شکاتیان لە ئیران کرد • مصدق بەرامبەر بەوە داوای (٤٩) ملیون پاوەن قەرزی ئیرانی بەسەر هاوکاریەکانەوە کردەوە ، کە ئنگلیزەکان زۆر پێیان لێهەڵبری‌و سەرکێشیان کرد ، مصدق پەیوەندی سیاسی لەگەڵ بڕین• دادگای (عدل) مافی دا بە ئیران ، ئەوسا ئنگلیزەکان لە ئەنجومەنی ئاسایشدا شکاتیان لێکرد ، مصدق خۆی چوو ، بەرگریەکی بەسۆزی مافی ئیرانــی کرد ، ئیتر دوای ئەم سیاسەتە نیشتمانپەروەرانەی کە دکتور مصدق گرتی، ئەمەریکاو ئنگلیز دەستیان کرد بە فتیلنانەوەو ناکۆکی خستنەوە لەناو میللەتی ئیراندا ، هەربەوەوە نەوەستان ، بەتایبەتی دوای ئەو بڕواپێدانەی ، مصدق لەگەلی ئیرانی داواکرد کە تیکرا دەنــگیان لەگەڵیدابــوو ، ئایزنهــاوەری سەرۆکی ئەوسای ئەمەریکا بەبیانووی بڵاوبونەوەی شیوعیەتەوە دەستیکرد بە هەڕەشەکردن ، لە ٢٨ی شوباتی ١٩٥٣دا کۆمەڵێك ئەفسەر لە ژێرفەرماندەی زاهدیدا هەڵیان کوتایە سەر ماڵەکەی مصدق بۆ کوشتنی ، بەڵام هیچیــان بۆنەکراو بەربوەیەری گشتی پولیسیان فراندو پارچە پارچەیــان کرد •

لەئەنجامی ئەمەدا دکتور مصدق ئەبوایە خۆی گورج بکردایــەوە ، دوژمنەکانی گەلی هەموو داپلۆستایەو دەستی ئیمپریالستی بقرتانایە ، ئەو دەستەی کەبریتی بوو لەپیاوەکانی لە ئیرانداو لەژور هەمویــانەوە (شا) ، بەڵام بەهۆی ئەو سستیەوە کەنواندی ، ئەوانە زیاتر پێیان لێ هەڵبری ، لەپەرلەماندا دوژمنی زۆربوو ، هەندێــك لەخزمــەکانی شــا لەئەفســەرە گەورەکان خرانە جێی گرنگەوە لەسوپادا ، کە لە پاشــەڕۆژدا هەمــوو شتیان پێبکرێت • ڕۆژنامە نیشتمانیەکان بەئاشکرا ئەمانەو زۆرشتی تریان

ئەنوسیو داوایان لە مصدق ئەکرد کە لێیان بدا ، بێ سوودبوو ، ئەوەبوو سەرلەنوێ لەرۆژی ١٦ ئابی ١٩٥٣دا جارێکیتر پەلاماری مصدقیان داو ، شا ، فرمانی لابردنی لەسەر کاغەزی سپی لەوەپیش‌تر ئیمزاکردو خۆی بۆی دەرچوو ، بەلام ئەو روژەش هەر سەرنەکەوتن چونکە هێزی تانكو زرەپلی دەوری مالەکەیان دابوو ، جگەلەوەی کە گەلیش بەمە هاتە سـەر شەقام ، بەلام کارەکە لەدەسـت دەرچووبـوو ، زاهـدیو هاوەلـەکانی تـری لەئەفسەرەکانو سوودپەرستەکانو پیاوەکانی شاو بێگانە ، هەموو خۆیان کۆکردبوەوە ، زاهدی کە لە کودەتاکەی ترەوە خۆی ونکردبو لەرۆژی ١٩ی ئابدا مالی مصدقی دایە بەرتۆپو دەستی گرت بەسەر هەمووشتێکدا، ئەو فرمانەی شای (جیبەجێ)کرد کە خۆی پێ‌کردوە بەسەرۆکی وەزیران ، ئنجا خۆیو هاوەلەکانی کەوتنە گیانی نیشتمانیەکانو ئەوانەی دژی ئیمپریالیزم بوون، بەکوشتنو برینو بەندکردن ، شا کەرای‌کردبوە بەغداو لەوێوە بـۆ رۆما بەرێزەوە گەرایەوە ، مصدق فرێدرایە بەندیخانەوەو لەروژی ٨/١١/ ١٩٥٣دا ، ئەو دادگایەی بۆ ئەوو ریاحی سەروکی سەرەوای سوپـا پێـك هاتبوو لە هۆلی ئاوینەبەندا لە کۆشکی سەلتەنەت ئاباد لە تاران دەسـتی کرد بە محاکەمە کردنیان •

**سەرۆكو ئەندامەکانی دادگا •**

سەرۆك : میر لیوا مقبلی •

ئەندامەکان :عمید حمید شیروانیو محمـود ئەفشاربـورو تیمـور بەختیارو محمد علی خزاعی •

داواکەری گشتی : عمید ئازمودە •

پارێزەری مصدق : بزرجمهر •

پاریزەری تقی ریاحی : ئەمیر ئەصلافی ، نصیر زنـد ، معـین بـور ، شاهقولی ، ئازمین •

**دەستپێکردنی محاکەمە (١) .**

سەرۆکی دادگا بە دکتور مصدق : ناوتو ناوی بـاوکتو ئیشـتو تەمەنت ؟

مصدق : محمد مصدق کوری هدایت ، سەرۆك وەزیرانی قـانونی ئێستای ئیران ، لەسەر مەزهەبی شیعە ، تەمەنم ٧٢ یا٧٣ ساڵە .

سەروکی دادگا بە جەنەرال ریاحی : ناوتو ئیشتو تەمەنت ؟

ریاحی : ناوم تقی ریاحی [٢] ، سەرۆك پێشەوای جەنگیی ئـیران لەتەمەنی ٤٤ سالانا .

سەروکی دادگا بە گوناهباران : ئایا لەبابەت (اختصاص)ی دادگاوە رەخنەتان هەیە ؟

دکتور مصدق : ئەمەوی بەر لەهەموو شتێك باسی کاری سیاسـەت بەسەر ئەم محاکەمەیەدا بکەم .

سەروکی دادگا : تکاتان لێئەکەم ئەگەر رەخنەتان لەپسپوریی دادگا هەیە بفەرمونو لەم باسە لامەدەن .

نوینەری گشتی : (دوای ئەوەی مادە ١٩٤و ١٩٥و ١٩٧ لە اصولی محاکەمات ئەخوێنێتەوە) رووئەکاتە سەرۆکی دادگاو تکای لێئەکات کـە رێگای مصدق نەدا لە یاسا لابدا .

دکتور مصدق بەنوینەری گشتی : ئەری کاکە وەکو قانون ئەفەرموێ تۆ لیسانس (شهادە)ی حقوقت هەیە ؟

نوینەری گشتی : تۆ مافی ئەم پرسیارەت نیە .

---

(١) وەك ووتمان بەکورتی لە (منشورات دار البصری)یەوە وەرگیراوە .
(٢) پارێزەرەکانی مصدقو ریاحی هەموو ئەفسەرو سوپایی بوون .

سەرۆکی دادگا بە مصدق : تکایە وەرنەوە سەر باسی رەخنەگرتن لە پسپۆڕی دادگا •

مصدق بە سەرۆکی دادگا : گەورەم ئەمانەی باسیان ئەکەم هەمویان پەیوەندەییان بە محاکەمەوە هەیە ، ئەمە پیشەکیەکە بـۆ بـاسی رەخنـەم لە پسپۆڕی دادگا ، قوربان : تۆ سەربازیکی ئـەگەر چـەکو خـواردنو خواردنەوەو پێویستی جەنگت پێنەبێ ئەچیتە مەیدانی شەرەوە ؟

جگەلەوەی (قانونی محاکەماتی عسکری) ئەڵێـت نـابێ کەسـێك سەرۆکی دادگای سوپایی یا نوینەری گشتیبێ بەرامبەر بەیەکێکی تـری گوناهبار کە ئەو گوناهبارە لەکاتی ئەو گوناهانەیدا کە کردبووی سەرۆکو ژووردەستی ئـەو ئەفسەرانـە بوویێـت • مـن لـە یاسـا شـارەزام پەنجا ساڵ لەتەمەنم لەگەڵا رابواردوە • من تا ٢٨ی مرداد (١) سـەرۆك وەزیر بووم ، مانای ئەوەیە سەرۆکی ئەزمودە بووم کە ئیستا لەمن بۆبـە نوینەری گشتی •

دوای قسەو باسیکی زۆر لەبەینی مصدقو ئەزمودە سەعات ئەگاتـە پینجونیوی ئیوارە بۆ دە دەقیقە محاکەمە ئەوەستی بۆ پشـودان لەمکاتەدا مصدق ئەوەندە ماندوو ئەبێ چاکەتەکەی دائەکەنێو ئەیخاتە ژوو سـەری، لەسەر تەختەیەك لێی رائەکشێ • کە محاکەمە دەست پێئەکاتەوە سەرۆکی دادگا بە مصدق ئەلیت :

ئەگەر رەخنەیەکتان لە پسپوری دادگا هەیە بیگرن •

دکتور مصدق : گەورەم هەرکاتیك رووی سیـاسی ئەم تومـانجەی دراوەتە پاڵم دەرمخست ئەوسا روە قانونیەکەی لەخۆیەوە دەرئەکەوی •

---

(١) ٢٨ی مردار لێرەدا ئەکاتە ١٩٥٣/٨/١٩ •

جاری بەر لە هەموو شتێك من سەرەك وەزیر بووم‌و بەگوێرەی مادە (٦٩) لە (ملحقی قانونی اساس) محاکەمـەی سـەرەك وەزیـر پێویستـە ئەنجومەنی دەولەت بیکات ، لەترسی بەئدیەتی‌و خۆشەویستی خومەوە نیە ئەم پاریزگاریە ئەکەم ، بەڵکو بە پێچەوانەی ئەوەوە ئەو فەرمانەی بەسەرما ئەدرێت مایەی خۆشی‌و شادیمە ، چونکە لە پێناوی سەربەستی‌و بەختیاری ولاتایە •

ئنجا ئەڵێ : سێ خال هەیە پێویستە روونیان بکەمەوە بۆ ئـەوەی هەموو شتێك دەرکەوێت •

یەکەم : ئایە ئاژاوە رویدا یان‌نا ؟ ئازمودە ئەڵـێ روینـەداوە باشـە ئەگەر نەبوە بۆچی :

( أ ) لە سەعات یەکو نیوی ( انگلـیزی ) نیوەشـەوی ٢٥ مـرداد نوسراوی شاهانەم بۆهات لەبابەت لابردنمەوە کەچی ئەو نوسراوە لە ٢٢ی مردادەوە دەرچو بوو جگە لەوەی فەرمانی عورفی هەبـوو کە کەس نـابێ بەشەو دەرچی ؟

(ب) وەزیری دەرەوەو وەزیری (مواصلات)و نوینەر زیرەك‌زادەیان گرت پێش ئەوەی من بگرن‌و ناردیانە کۆشکی سعدئابادو لەوێ تا رۆژی ٢٥ی مرداد هێڵرانەوە ؟

(ج) هەرچی خەتی تەلەفونی دایەرەی سەرۆك بیشەوای جەنگ بـوو هەمویان بڕی‌ی‌و دەستیان بەسەر دایەرەی برق‌وبریدی ناو بازارا گرت ؟

دووەم : ئایا (شا) حەقی لابردنی سەرەك وەزیری هەیە ؟

مادەی ٤٤ لە دەستور ئەڵێ (شا مەسئول نیە ، وەزیرانی دەولـەت لە هەمو کاریکیانا لەلایەن ئەنجومەنی نوینەرانەوە لێ پرسراوەن)و مـادەی ٤٦ ئەڵێ (لابردنی وەزیران‌و دانانیان بە فەرمانی شاهانەیە) ئەمانە وا ئەگەیەنن

که وەزیر بەرامبەر بە ئەنجومەنی نوینەران لێپرسراوە نەك بەرامبەر بەشا • ئەگینا ئەبێ ئەویش لێپرسراوبێ‌و لەبەر ئەوەی لە ٣٢ی مردادەوە کە فەرمانی شاهانەی تیا نوسرابوو بۆ لابردنی من‌و ٢٥ی مرداد کە ئەو نوسراوە درا بە من ، ئەنجومەنی نوێنەران هەر هەبوو ، جا لەبەر ئەوە ئەگەر لەوبەینەدا وەزیران شتێکیان کردبێ لەلایەن ئەنجومەنەوە پرسیاریان لێ‌ئەکرێت ، جگە لەوە ئەگەر من بەگوێرەی ئەو نوسراوەی شا وازم لە حوکم بهێنایە بەر پرسیار ئەبووم بەرامبەر بە ئەنجومەن چونکە مادەی (٦٤)یش لەقانونی ئەساسی ئەلێ (وەزیران ناتوانن پرسینەوە لەسەرشانی خۆیان لابەرن بەجێبەجی‌کردنی فەرمانی قسەیی یا نوسراوی شاهانە) جگە لەوە من هەندێك دەسەلاتی تایبەتیم لەلایەن پەرلەمانەوە پیبەخشرابوو بۆ دانانی هەندێك (لائحەی قانونی) ، لەبەر ئەمانە هەمووی من گوناهبارینم‌و پیویستە هەر ئیستا بەرەللا بکرێم‌و ئەوانەی منیان گرتوە گوناهبارن بەگوێرەی مادە ١٢٩ لە قانونی سزا کە ئەلێ (هەر کاربەدەستیکی دەولەت فرمانەکەی هرچیەك بێت ، ئەگەر ئەو فەرمانەی بەکارهێنا بۆ بەرەنگاری‌ی جێبەجێ‌کردنی فەرمانی رەسمی وەیا دەرکردنو جیبەجی کردنی یاسای دەولەت ••• لە ئیشەکەی دەر ئەکرێ ) کەوابوو پێویستە هەر ئێستا بەر بدرێم بۆ تەواوکردنی ئەو (لائحە) یاساییانە کە پەرلەمان دەسەلاتی دانانی پێ سپاردوم •

سێ‌یەم : ئایە ئەم دادگایە ئەتوانێ محاکەمەی من بکا ؟

بەگوێرەی ئەو دەسەلاتانەی ئەنجومەن دابوی بەمن ، سێ (لائحە)م بۆ ( اصولی محاکەمە)و محاکەمەی عەسکەری دەرکردو دام بە ئەنجومەن، ئەنجومەنیش دانی بە لیژنەی (عدلی) ، ئەگەر دادگاکان بیانزانیایە من دەسەلاتی دەرکردنی ئەو سێ ژمیراوەم نیە رەخنەیان ئەگرت چونکە ئەیانتوانی رەخنە بگرن •

ئنجا هاته سەر باسی هۆی ناکۆکی حکومەتو کۆشکی شاهانە وتی :
هیچ شتێکی وەها لەبەینا نەبوو شایانی باسکردن بێت تا ٢٤ی مرداد تەنها هەندێك دو دلی نەبێ لەبابەت روونکردنــەوەی مــادە (٤٦) لە قــانونی ئەساسی ، لەسەرئەوە تەختێك ساردیی پەیدابو ، هەروەها ساردیەکی کە لەبابەت سامانەکەی بارەگای شاهانەوە پەیدابوو ، کە ئەویش دیسانــەوە زۆر شایانی باسنیە ، بەلاّم هۆی تیکچونی تەواو ، نوسراوەکەی شایــە کە لە ٢٥ی مردادا بەمن گەیشت ، ئەگەر ئەو نوسراوە لەکاتیکی ئاساییــداو لەلایەن پیاوی خۆیەوە بەمن بگەیشتایە من ئەوساکە ناچار ئەبووم بە یەکیك لەم سێ شتە :

(١) کە فەرمانەکەم وەرگرت دەمودەس وازم لە حوکم بهێنایە ، ئەمەم نە ئەکرد چونکە ئەمە پێچەوانەی کاروباری گشتیی ولاتبوو ، جــگە لەوەی لەبەردەمی پەرلەمانو میللەتی ئــێراندا ئــەو دوملیــون کەســەی دەنگیاندا حکومەتی مصدق بمێنێتەوەو ئەنجومەن هەڵبوەشێ) گوناهبارو سەرشۆڕ ئەبووم •

(٢) یاخود بموتایە شا دەسەلاّتی دەستکێشانەوەی منی نیە ، ئەمەشیان هەر نەئەکرا چونکە لەوکاتەدا بۆ حکومەت باش نەبوو کە لەگەڵ بــارەگای شاهانە نارێك بێت چونکە دوور نەبوو ئەوســاکە شــەرریکی ناوخــۆیی بەرپابێت ، کە ئەمەشیان کەس نایەوێت •

(٣) یاخود لە حوکم بکشامایە دواوەو هۆی کشانەوەکەم بلاّوبکردایەوە هەروەك رویدا (لەوکاتەدا کەخۆم وەزیری جەنگ بووم جــگە لەسەرۆکی وەزارەت)و شا پەسەندی نەکرد •

هەموو کەسیك دوای پشێوی هەوەڵجار چاوەروانی ئەوەبوو شــا بێتە پێشەوە سزای ئەو کەسانەبدا کە دەستیانی تیــابوو نەك لەکاتێــکیوا تەنگو چەڵەمەدا رابکات بۆ بەغداد ، لەسەر هەمو شایەك پێویستە لەکاتیوا

شێواودا لەخاووپای وولاتدا خۆی بەختبکاو بمرێـنێ • راکردنی شـا لەوکاتەدا وای لە هەموو کەسێك کرد کە نیازی چیبوبێت بکەوێتە جێبەجێ کردنی •

توخوا خەڵکینە ئەگەر ئازموده لە شوێنی من بوایە لەو کاتەدا چیئەکرد؟ ئایە حکومەت ئەیتوانی لەو دو روژەدا ڕای هەموو پـارتو کۆمەڵەکـان وەربگریت کە ئایا بۆ بەریوەبردنی کاروباری وولات چیبکات ؟ ئـەگەر شتێکی لەدەست بهاتایە ئایە ئەیتوانی سزای ئەوکەسانە بدا کە ئەیان وت شاهەنشاهیەت نەمێنێ ؟ ئایە حکومەت ئەیتوانی بەربەستی قسەی ئەو کەسانە بکات کە ئەیان ووت بۆچی شا رایکردوە ؟

بیروبروا بەزۆرو تەنگاوکردنو چڕوساندنەوە ناگوررێتو چارناکرێ ، ئەگینا ئەنجامەکەی پێچەوانە ئەهینیو خراپتر روئەدا • لـێرەدا سـەروکی محکمە وتی : ئەگەر ئەمانەی فرموتان هەمـوی لەبابـەت رەخنەگرتنـەوە بوویێت لە (اختصاص)ی دادگا ئایا چیمایەوە لەکاتی پاریزگاریدا بیلێن ؟

بزر جمهر وەلامی دایەوە وتی جارێ لەکویـیـەتی ، پاریـزگاریەکەی ٤٥ پەرەیە تا ئێستا تەنها نۆی لیخۆینراوەتەوە • لیرەدا محاکەمەی ئەوروژە تەواوبوو پاشماوە کەیان خستە سبحەینێ •

بۆ سبحەینێ محاکەمە دەستی پێکردەوە مصدق وتی : دوینی عـەرزم کردن ، ئەگەر باسی رووی سیاسیم لەم محاکەمەیە کردو دەرم خست ، ئەوساکە رووی قانونی لەخویەوە روون ئەبێتەوە •

پاریزگاری خۆم لەم محکمەیەدا لەترسا ناکەم (لێرەدا دەست ئـەکا بەگریان) لەترسی ئەندامەکانی ئەم مححکمەیەو ئازمودە نیە ، نەء ، لەترسانـا ناگریم ، چونکە ئەوەندەم نەماوە لەژیاندا ، تا لەسەر ئەم عەقلەش بم ، لەو

فەرمانە هەڵناچمەوە (٤) کە محکمە دەری ئەکات • لێخۆشبوونی شاهانەشم ناوێ‌و پەسەندی ناکەم چونکە ئەبێ لەگوناهبار یا بەدنمەك ببوررێ نەك لەپاكو خاوێن • بیگانە بۆچی ویستی لەسەر حوکم بەهەر نرخێك بیت لام بەری ، ئەگەر ئەنجومەنی ئاسایش فەرمانی بەسەرا بدامایە ، ئەوسا لەخەجاڵەتیدا رووم نە ئەهات بگەریمەوە بۆ ئێران ، هەر لەدەرەوە ئەمامەوە تا ئەمردم • بەڵام دوای ئەوەی بێگانە لەئەنجومەنی ئاسایشدا لەسەر مەسەلەی نەوت ، بەسەر ئێراندا ، سەرنەکەوت ، ئەوسا پەنای هاویشتە بەر (محکمەی لاهای) لەوێشدا هەر سەرنەکەوت‌و هێچی بۆنەکرا ، ئنجا بەناچاری لیسیی هاویشتەوە ناو ئێران خۆی ، هەرچی نەشێ کردی ، هەروەك لە پێشەوە هیچ نەما لە ئێراندا بۆ داڕشتنی بنج‌وبناوانی نەیکات••

سەرۆکی محکمە : ئەمانەی جەنابتان باستان کردن هەمویان پەیوەندەییان بە (موضوع)ی محاکەمەوە هەیە کەواتە دانی پیا ئەنێن کە ئەم دادگایە بۆ محاکەمەی ئیوە ئەشێت •

دکتور مصدق : هیچ کاتێك من دان بەوەدا نانێم‌و ئەگەر ئەم باسە بێننە پێشەوە ئیتر لە محکمەشدا ناوەستم •

سەرۆکی محکمە : کەوابوو بە پارێزەرەکەتان بڵێن لەجیاتی ئێوە چی پێویستە بیلێت‌و بیکات •

مصدق : ئەمە محامی من نیە (محامی زۆرە) ، ئاور بەلای بزرجمهرەوە ئەداتەوە کە لەتەنشتیەوە دانیشتبو پێی‌وت :

هەڵسە لامەوە ، باوا تێنەگەن تۆ محامی منیت ، حەقیشت بەسەر ئیشی منەوە نەبێت •

---

(٤) واتا تەمییزی ناکەمەوە .

نوینەری گشتی : محاکەمە بەگوێرەی ریگاو سازیەك ئەكرێت كەس ناتوانێ لێی دەرچی ، نەسەرۆكی محكمەو نە محامیو نە نوینەری گشتیو نەگوناهبار بەلام دكتور محمد مصدق (خاوەنی دكتورا لەقانونا) بەگوێرەی هیچی نەكرد •

دكتور مصدق : من وام لەبەردەستی جەنابی سەروكی محكمەدا ••

نوێنەری گشتیی : دكتور مصدق كورتو پربەدەم هاوارئەكات ئەلێ من قانون ناناسمو لە محكمەدا ناوەستم •••

دكتور مصدق : ئەوەستم بەلام قسە ناكەم •

نوێنەری گشتیی : جگە لەم گوناهبارە (مەبەسی لە مصدقە) یەكێكی كە هەیە كە ئەویش ریاحیە كە پێویستە نۆرە زوو بگاتە سەری چونكە لەوە ناخوشتر نیە گوناهباریكیتر لە محاكەمەدا كەس لێی نەپرسیتەوە ، ئەمە بۆ نوینەری گشتیش زۆر ستەمە كە ببینێ وا قانون ئەخرێتە ژێر پێوە ، ئەگەر مصدق نایەوێ محاكەمە بكرێ یا پاریزگاری خۆی بكات پێویستە لەسەر محكمە هەموی بنوسیتو چیپیویستە بیكات واتا بریاری خۆیبدا •

سەرۆكی محكمە : من داوا لە دكتور ئەكەم كە بێتەوە سەرەوكاری پسپۆرێی محكمە •

دكتور مصدق : ئەم باسە پەیوەندەیی بە ژیانی وولاتو مردنیەوە هەیە، من بێ ئەمرێی جەنابتان ناكەم چونكە جێگاتان لە من بەرزترە ئەتوانن ئێستا فەرمانی خنكاندنم دەربكەن •

سەرۆكی محكمە : یەزدانو حەقو دادگەریی لەژوور هەمومانەوەیە ، فەرموون لەبابەت پسپۆرێی محكمەوە قسەبكەن •

مصدق : من خزمەتکاری جەنابی (عالیتان)م چی ئەفەرموون سەرم لەرێدایە ، بەڵێ من پیاویکی (خائن) بووم خزمەتی ولاتەکەمم نەکرد •

سەرۆکی محکمە : نەخێر جەنابتان خزمەتتان زۆرە •

مصدق : بە قوربانت بم ، گەورەم جەنابی سەرکردە خوا راویستاوت کاو پایەبلندبیت ، هەرچی قسەم هەیە پەیوەندەیی بە پسپوری محکمەوە هەیە ، نەك بە (موضوع)ی محاکەمەوە •

سەرۆکی محکمە : ئەم قسانەتان هیچی پەیوەندەیی بە پسپوری محکمەوە نیە •

مصدق : ئێوە پاریزگاریەکەی منتان هەموو لەپیش ئەوەدا خۆم بیخوینمەوە دیوە کە ئەمەش شتێکی جوان نیە بۆ سەرۆکی دادگایەك •

سەروکی محکمە : ئەبێ خۆت دابێنت بەمن یا بزرجمهر ، من سەربازیکم خاوەن دەرون ، بە چ سوێندێکتان بڕوایە نەمدیوە •

بزرجمهر : دکتور وا ئەزانی گوایە من قسەم لای ئیوە کردوە بەگەورەی قورئانی پیرۆز شتی وەهام نەکردوەو ئەمە لەمن نەوەشاوەتەوە •

مصدق : با ئەوەی ئەزانم لەبابەت پشێوی شەوی ٢٥ی مردادی سالی ١٣٣٢ عەرزتانی بکەم :ـ لەرۆژی ١٩ و ٢٠ی ئەو مانگەدا چەند کەسێك هاتن پێیان وتم کەوا بارەگای شاهانە نیازی هەلگیرانەوەی حکومەتی هەیە • منیش هیچ بروام بەم قسەیە نەکرد وتم : چۆن شا شتی وا ئەکات ، بەڵێ ئەگەر یەکێکی چاولەدوو بیکات قەید ناکا باشە بەلام شا بۆچی بیکات؟ ئەمەم بە تقی ریاحی وت‌و فەرمانم دایە کە ئاگاداری‌ی خۆم‌و مالەکەم بکات• وەلامی دامەوە کەوا هێز بۆ بەربەستی شتی وەها دانراوە • کەلیم پرسی ئەی ئەلێن لەنزیك کۆشکی سعدئابادەوە چوار تانك راگیراوە ؟ پێی وتم هەموو

لەخاكو پای وەزارەتی جەنگدان • بۆ شەوێ كابرایەك بەتەلەفۆن پێی وتم كەوا ئەمشەو پشێوی رووئەداو تانكەكنی كۆشكی سعدئاباد نێرراون بـۆ ئەو شوێنەی كۆدەتاكەی لێوە دەست پێئەكاو ناوی ئەو كەسانەی پێوتـم كە ئەم كارەیان پێ‌سپێرراوە •

بەڵێ ریاحیم ئەو رۆژە هەر نەدیەوە ، بۆ سبەینی كەهات داوام لێ‌كرد چەند تانكێك لەبەر دەمی ماڵەكەمدا رابگرێ ، جگەلەوە بە تەلەفـۆن هـەر قسەم لەگەڵ ئەكرد ، لەدواییدا وتیان پاسەوانەكانی شا (حسین فاطمی)یـان گرتوە • دوای هاتنی ریاحی پاسەوانی شاە دەستیـان كرد بە هەڵگیرانەوەی حكومەت •

سەرۆكی محكمە : تكایە لەبابەت پسپۆری محكمەوە قسـە بـكەن

مصدق : ئەگەر ئەمە لەبابەت پسپۆری‌ی محكمەوە نیە كەوابوو قسەم نیە ، ئنجا روو ئەكاتە پارێزەرەكانی ریاحی ئەڵێ بۆچی ئێوە قسە ناكەن ؟

ئازمین (پارێزەری ریاحی) : ئەتوانم لەكاتی خویا ساغی كەمەوە كە ئەم دادگایە ناشێ بۆ محاكمەی ئێوە •

مصدق بەسەرۆكی محكمە : لـێرەدا وا دیـارە تۆ داواكـاری‌و مـن داوالیكراو •

سەرۆكی محكمە : ئیمە خاوەن دەرونـین گوێ لە قسـەی خوتـانو پشتیوانەكانتان ئەگرین ئنجا فەرمان دەرئەكەین بەگویرەی حەقو دادگەری ئەجوڵێ‌ینەوە •

نوێنەری گشتی‌ی : ئەوەندە جلەو بۆ ئەم كابرایە شـل كرا مەیـدانی محكمەی كرد بەتیاترۆو سینەما ، تكام وایە ئەوەندە ریگای نەدرێتێ ، ئەگەر ئەتوانێ ساغی‌كاتەوە ئەم محكمەیە ناشی بۆ محاكمەی واباشە با بیكات ،

ئەگینا پیویستە (چونیەتی محاکەمەکەی بنوسری) بۆ ئەوەی وەختی محکمە بەبایی هەوا نەڕوات •

سەرۆکی محکمە : جەنابی دکتور تکاکەم دوبارە ئەکەمە ئەگەر لەبابەت پسپوریی محکمەوە رەخنەتان هەیە بیگرن •••

مصدق : من ناڵێم بزرجمهر بەرگریەکەی منیداوە بە ئیوە چونکە ئەو بەرگریە بە چاپ نوسراوەتەوە دوورنیە چاپنوسەکان دابیاننی ، ئنجا منیش هەمدیسانەوە ئەڵێم ، تا لەسەر ئەم بیرەبم لەفەرمانەکەتان هەڵناچمەوەو داواکاری لێخۆشبوون نیمو لە بەندیخانەدا ئەمێنمەوە دەرناچم • ئەگەر رزگاریشم بوو خۆم ئەکوژم • ئنجا ئەڵێم : لەبەر ئەوەی کە تۆمانجەکەم سیاسیە پێویستە (کۆمەڵەیەکی دادگەر) [1] لەم محکمەیەدا بێت ، بۆ ئەوەی گوێم لێبگرێ ، ئەوساکە هەریەکە بەلایەکا • ئێوەش بۆخوتان لەم ماندویەتیەی لەگەڵ مندا ئەیکێشن رزگارتان ئەبێت (پیکەنین) •

سەرۆکی محکمە : کردەوەی پێشووم دەری ئەخات کە سەربازیکی پاکو راست بووم ، کە خاوەن شکۆ شای مەزن زانی من بۆ سەرۆکی ئەم محکمەیە دانراوم فەرموی پێم (بیستومە تۆ سەربازێکی پاکو بە ئایینی ، سەرت بچێ نوێژت ناچێ ، درۆ ناکەیت ، پێویستە بەگوێرەی حەقو داد ئیش بکەیت ) منیش ئێستاکە خوا ئەگرم بەشاهد کە هەرچی حەقو حەقیانەت نەبێ نەیکەم •

مصدق : ئەزانی تۆ بۆچی بۆ سەرۆکی ئەم محکمەیە هەڵبژێرراویت ؟ لەبەر ئەوەی من لەکاتی خۆیدا خەریك بووم تۆ لەسوپا لابەرم چونکە لە هەڵبژاردنی نوێنەراندا دەستکاریو دەست درێژیت کردبوو •

---

(١) هیئه منصفه قضائیه .

سەرۆکی محکمە : مـن سەربازێکم سوێند ئەخوم بە ( شـەرەفی عەسکری)م کە ئەم قسەیە درۆیە ، بەپێچەوانەی ئەمـەوە مـن زورباش ساغی ئەکەمەوە کە تۆ دەستکاری هەڵبژاردنەکەت کرد •

« لیرەدا محاکمەی ئەو رۆژە دواییی‌هات • کە سبحـەینێ دەست پێ‌بکاتەوە • بۆ سبحەینی کە محاکمـە دەسـتی پێکردەوە ، جـگە لـە رۆژنامەچیەکان هەندێك ژن‌و سەیرکەری کە حـازربون ، بـەلاّم ئەمرو وا دیاربوو کە دکتور مصدق تەندروستی‌ی زیاتر تێکچوبوو لە رۆژی بـەرو بێ‌تاقەت تربوو ، چونکە کە هاتە هۆلی محکمەوە بزرجمهر چوبوە ژێـر باڵی بەلاّم زۆر باش دیاربوو کە ئەم دوانە زۆر لەگەڵ‌یەکدا ساردبون تـاکو دکتور مصدق چو لەجیگاکەی خوی دانیشت) •

سەرۆکی محکمە بە بزرجمهر : ئەگەر رەخنەتان لەپسپۆری محکمـە هەیە بفەرموون •

مصدق : (هاوار ئەکات) ئەم کابرایە لە ئیشی من نازانی خۆم قسـە ئەکەم •

سەرۆکی محکمە : ئەگەر کارێکی وابکەن کە محکمە تیـك چیـت ناچار ئەبین بە نەهینی محاکمەتان بکەین •

مصدق : (دوای ئەوەی دەست رائەکێشێ بۆ بزرجمهر) ئەم کابرایـە چی لە کاروباری من ئەزانیت ، ئەمە قسە نیە ، محاکەمە نیە فەرمون سەرم بپەرینن ، پێویستە گوناهبار خۆی قسە بکات ، ئەی هـاوار خەڵکینـە کێ‌دیویەتی نەیەڵن گوناهبار خۆی قسە بۆ خۆی بکات ؟ لەجیاتی ئـەوە یەکێکی کەی بەزۆر بەسەرا بسەپێنن ، ئەو قسەی بۆ بکات ، کەی ئەمـە محاکەمەیە ؟ سەرۆکی محکمە بەژێـر دەستـەکانی : مـادەی ۱۸۲ و ۱۸۳ بخوێننەوە • کە دەستکرا بە مادە خۆیننەوە مصدق هەر نەیبریەوە تا سەرۆکی

محکمه پێی وت : قسه مەکەن مادەی قانونی ئەخوێنرێتەوە ، دکتور مصدق بەبێزارییەکەوە وەلامی دایەوە وتی :

ئێوە ئەتانەوی لەسەرم بدەن بلێن ئەمە قانونە •

سەرۆکی محکمە بە بزرجمهر : قسە بکەن • کە بزرجمهر خەریك بوو قسە بکات ، مصدق پێی وت : باوکتیان بە ئاگری جەهەنم سوتاندبێ ئەگەر قسە بکەیت ، تۆ (محامی) من نیت ، •• خۆش محکمە ، •• چاومان روون ئەبێتەوە بەم محکمەو محاکەمەیە ( خوا رەحم بە ئەبا شمر بکا) [1] تەحقیقیکی باش ئەکەن ، محامیەکی بەزۆرگیراو پاریزگاری من ئەکا ، بەھ ••• بەھ •• بەھ • ئنجا مصدق سەر ئەکاتە سەر مێزەکەی بەردەمیو هەر لەبەر خۆیەوە ئەلێ : بەھ •• بەھ •• بەھ (پێکەنین لە حازریەوە) ناچار بزرجمهر بێدەنگ بوو ، هەرچەند سەرۆکی محکمە پێی ئەوت هەڵسە قسە بکە ، قسەی بـۆ نـە ئەکرا •

نوێنەری گشتی : من ئەم پیاوە باش ئەناسـم (مەبـەسی لە مصدقە) خەجالەت نابێ سەربازێکی بەرزی وەك بزرجمهر بەدنمەك ئەکات • بەگویرەی مادە (١٨٢) ئەم کابرایە کە خاوەنی دکتورایە لە حقوقداو بەینێك جلـەوی ولاتی بەدەسەوە بوو لە رۆژی ٢٥ی مردادەوە بە یاخی ئەناسرێت ، جا لێرەدا پێویستە بە گوێی قانون بکرێتو جڵەوی پچراوی ئەم کابرایە بگیرێتەوە ، ئەگەر قسەیەکی هەیە بابیکات ئەگینا پێویستە بەگوێرەی قانون لەسەری بدرێـت •

سەروکی محکمە بە بزرجمهر : فەرموو تۆ قسەی خۆت بکە •
مصدق بەسەروکی محکمە : کابرا قسە لەگەڵ من بکە •
سەرۆکی محکمە : کابرا وسبە قسە مەکە •

---

(٢) اباشمر ئەوەیە کە حسینی کوشت ئەمە پەندێکی فارسیە .

( لیرەدا دکتور مصدق چاویلکەکەی لەچـاوی داگـرت‌و قاقـەزی پیچپایەوەو خستیە جانتاکەیەوە ، هەلسا روێی ، سەرۆکی محکمە لەنوینەری گشتی پرسی ئایە حەقی هەیە محکمە بەجێ بهێلێ ) پێش ئەوەی نوێنەری گشتی وەلام بداتەوە •

مصدق وەستا وتی : ئەگەر نەشتوانم بچمە دەرەوە ، لێرە دائەنیشم بەلام کەس قسەم لێ نابێ ، مادەم وایە ) •

سەرۆکی محکمە بە بزرجمهر : فەرموو •

مصدق (دوای ئەوەی قسەکەیان پی ئەبری) کابرا پاریزگاری ئـەم پیاوە بابی پولێکە ، ئەو چوزانێ من چیم‌کردوە ؟

سەرۆکی محکمە : وسبە کابرا ، ئەمە دوو رۆژە ریـگات ئەدرێـت هەرچیەکت ویستوە وتووتە ، ئنجا روو ئەکاتە بزرجمهر پیی ئەلێ قسە بکە•

مصدق بە بزرجمهر : فەرموو روحـەکەم هەزار رەحمەت لەدایـك‌و بـاوکت •

بزرجمهر : (بە پەستیەوە) لە یەکەم رۆژەوە کە کاری ئەم کابرایـەم پی‌سپیراوە ، رام لەسەربوە چونکە ئەرکیـکە داویانـە بەسەر شانمـا ، پارێزگاری ئەم کابرایە ، من هەندێکی‌و خۆی ئەوی کەیمان رێك‌خستـوە بەلام لەسەر دوینی‌و پێرێدا ئەبێ ئیتر محکمە چاوەروانی هیچ نەبی لە مـن چونکە ئەم کابرایە حەیاو ئابرووی بردووم •

هەرچیەك بووەو نەبوە لە ٢٥وە تا ٢٨ی مرداد خۆی نوسیویە ، ئەوی کەی من رێکم خستوە ، ئنجا منیش ئەلێم ئەم محکمەیە بۆ محاکەمەی ئـەم پیاوە ناشێت چونکە :

١ ــ محاکەمەی ئەم پیاوە پیویستە (ئەنجومەنی دەولەت) بیکات ، ئەویش

بەجۆرێك لەپێشدا پەرلەمان ئەو بڕوایەی داویەتی لێی بسەنێتەوە ، چونکە ئێستاش خۆی بەسەرەك وەزیری قانونی ئەزانیت •

٢ ــ دادگای سوپایی مافی محاکەمەی مصدقی نیە (هەرچەند خۆی بەخاوەن حەق بزانێ ) بەگویرەی هەندێك مادە لەیاسای محاکەماتی سوپایی کەدیومەو هەموو نوسراونو لای مصدقن لەبەر لە بیرمنینو ناشمداتێ بیانخوینمەوە چونکە بروام پێ ناکات •

٣ ــ ئەو گوناهەی دراوەتە پاڵ مصدق گەورەترین گوناهێکی سیاسیەو لە قانونی ئەساسیدا ئەڵێ پێویستە لەم جۆرە محاکەمانەدا (کومەلەیەکی دادگەر) دانیشێت •

٤ ــ مصدق خۆی هەندێك شتی رێکخستوە لەبابەت کەمو کوڕی تەحقیقەوە ، دوێنێ هەندێکی خویندنەوە تکا لە محکمە ئەکەم داوای لێبکات لەلاپەرە (٢٦)دایە با ئەویشی بخوێنێتەوە • ئیتر منیش ناتوانم ئیش بۆ ئەم کابرایە بکەم چونکە بەخائنو سەپێنراوی داناوم (لیرەدا خوڕ خوڕ فرمیسك بەچاویا دێتە خوارەوە) ئنجا وتی کە ویستم بژیم ئەمەوی ژیانیکی پیاوانە بژیم بە شەرەفەوە ئەگینا هیچ• (لیرەدا محاکەمە وەستا ــ دوای نیوەرۆ دەستی پیکردەوە) •

مصدق : ئەگەر رێگام ئەدەن لەبابەت نەشیاوی محکمەوە قسەبکەم ، چی ئەزانم ئەیلێم ، ئەوساکە ئەمە ملی منو ئەوەش شمشێری ئێوە ، چیئەکەن منەتان نەبێ ، من ئەوەندەم لەجهانا نەماوە ، سبحەینێ ئەمرم ، ئێوە گەنجن ، دوای ئیمە خزمەت بکەن • بەڵێ ئێوە خزمەت بکەن ••• بەڵێ ••• بەڵێ • ئنجا وتی : پێویست بەوەناکات بلێین بێگانە حەزیان بەهەوڵدانو نیشتمانپەروەریەتی ئێرانیەکان نەئەکردو ئەیانویست حکومەتێك لە ئێراندا هەبێت هەرچی سەربەستی هەیە لە خەلکی بسێنێتەوە،

بەڵام پەرلەمانی جاری شانزەیەم بەهێزی جەماوەرو دەنگی گشتیی مـنی بەسەرۆکی دەوڵەت هەڵبژارد ، ئنجـا میللەت بریـاریدا حـوکمی زۆرو دکتاتوریەت نەمێنێو نەهێڵێ بیگانە دەسـتدریژی بکا بـۆ کاروبـاری ناوخوی ئێرانو سەربەستی خۆی بەجی بگەیەنێت ، بیگانـەش یەکسەرو بەئاشکرا دەست دریژی لەکاروباری ئێراندا نەئـەکرد بەڵـکو لـەرێی داردەستەکانیەوە مەبەسی خۆی بەجێ ئەگەیاند کە ئەوانـەش (بـارەگای شاهانە ، ئەنجومەنی نوێنەرانو حکومەت) بوون •

هەر لەبەر ئەوەش بوو سیاسەتی بیگانە رەنگی وەهـا رشتبوو کـە بەگوێرەی قانونی ئەساسی شا حەقی هەلوەشاندنەوەی پەرلەمانی هەبێ ، جگە لەوەش حەقی (ڤیتو)ی بۆ سەرنەگرتنی ئەو قانونانە بێ کە پێچەوانەی خواستیەتی ، کە منیش ویستم دەستکاری ئەو مادانەی دەستوربکەم لەبابەت دەسەڵاتەکانی شاوە کە تایبەت بوون بەگۆرینو لابردنی سەرەك وەزیـرو وەزارەت وەبریاری بانگەوازی شەرو ئاشتیو هەندێـك شتیتر بۆ ئـەوە هەشت نوینەرم هەلبژاردلەپەرلەمان کەلەم رووەوە چی پێویستە بیـکەن ، کە ئەمەیان شا خۆشی رای لەسەربوو ، بەڵام هەندێ دەست لەتاریکیدا نەیان هێشت پێشنیارەکانی ئەوان بەپەرلەمان بدرێت•من ئیستاش هەر ئەڵیم کەوا هیچ ناریکیەکم لەگەڵ ئەم شایەدا نیە چونکە بلوکی خستمیە بەندیخانەوە ئەم بەریدام ، تەنها عەیبەکەی ئەم شایە ئەوەیە زوو قسەی ئەمو ئەو بەگوییا ئەچێتو خۆش بروایە • (لێرەدا دانیشتنی ئەو رۆژە کۆتایی هات • بـۆ رۆژی دوایی ، محاکەمە بەم جۆرە ، دەستی پێکردەوە ) •

سەرۆکی محکمە : جەنابی دکتور قسەتان چیە فەرمو بیکەن •

دکتور مصدق : جەنابی (قائد) ، تۆ لە ماڵی خۆتا بویت ، وەزارەتـی جەنگ ناردووتی بۆ محاکەمەی من، من دلخوشم بەوەی تـۆ سەرۆکی ئەم

دادگایەیت ، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت ئەم دادگایە دادگایەکی قانونیە لەگەڵ ئەوەشدا بە پێویستی ئەزانم هەندیك لە مادە (٣١٧) بدوێم کە ئازمودە منی پێ گوناهبار ئەکات •

ئەم مادەیە ئەڵێ : (هەر کەسیك مەبەسیکی خراپی بوو بۆ هەڵگێرانەوەی بناغەی دەوڵەت یاخود تەختی‌شاهانە ، یاخود هانی خەڵکی‌دا بۆ چەك هەڵگرتن‌و بەکارهێنانی بۆ هەڵگێرانەوەی تەخت لەملی ئەدرێت ) • جا بۆ ئەوەی مەبەسی ئەم مادەیە بزانرێت پێویستە مانای (مەبەسی بەد) لێك‌بەینەوە، هەرکەسێك شارەزایی لە یاسادا هەبێت ئەزانێ مەبەسی‌بەد مانای کوشتنی یەکێك بێ یا لەوەپێش بیری لەوەکردبێتەوە یا خۆی بۆخرێ هەڵدابێت یا هەندێك دەستاوێژی ئامادەکردنێ کە رەنگ هەبێ لەدواییدا ئەو مەبەسە بەدە بگەیەنی بە ئەنجام ئەو کەسە بکوژرێت • ئاشکرایە دکتور مصدق لەمانەدا لەهیچیاندا نیە کەوابوو بەکارهێنانی مادە (٣١٧) لێرەدا ناگونجێت هەروەك محکمەو محاکمەکەشتان قانونی نیە ، ئنجا پێویستە قانون لەئێوە بپرسێت بۆچی هاتون‌و بۆچی لیرەدا دانیشتون ؟ • لەدواییدا وەك گاڵتە پێ‌کردن پی‌یان ئەڵێ مەترسن ناتاندەم بە محکمە (پێکەنین) •

بابڵی‌ێن ئەم دادگا سوپاییەش بۆ محاکمەی من ئەشێ ، ئنجا کۆسپێکی کەمان دێتە رێ ، ئەویش مادەی ٧٩یە (لەپاشکۆی قانونی ئەساسی) کە پێویستی‌ی ئەکات لەگوناهە سیاسیەکاندا کومەڵەیەکی دادگەر هەبێت لە محاکەمەدا ، جا ئەگەر (ئازمودە) ئەڵێ ئەو تۆمانجەی دراوەتە پال من سیاسی نیە کەوابوو بۆچی قانون پێویستی حازربونی ئەو کومەلانە ئەکات ؟

لەبەرئەوە بوونی ئەو کۆمەڵە زۆر پیویستەو پیویسترێکە من لە دادگای (جنائی عەدلی)دا محاکەمە بکرێم‌و ئەم دادگای ئێستایە بەهیچ کلۆجێك بۆ محاکەمەی من ناشێت •

بێنەوە سەرەوکاری دەربازبوونی شا • کە شا رایکرد لەگەڵ کۆمەلی وەزیران بریارماندا بەبروسکە لێی بپرسین نیازی لەدەربازبون چیە ؟ چونکە لە تاران وا بڵاوبوەوە کە شا ئەیەوێت لەسەر تەخت بێتەخوارەوە ئیمەش وتمان ئەگەر ئەم قسەیە راستبێت ئەوا کۆمەڵەیەکی (استشاری) لە جیگادا دائەنیین تاکو خۆی بریاری کاری خۆی ئەدا ، بەلام ئەو بروسکەیە نەکرا چونکە رۆژی ٢٨ی مرداد پشێویەکە قەوماو بومباو گوللە تۆپ چەشنی هێلەك خانوەکەمی بێژایەوە •

ئنجا لەدادگام ئەوێ تیم بگەیەنی ئایە هەروەك تەحقیق بەتەواوی لەگەڵ من کراو دۆسیەکەم لەهیچی کەم نیە ، ئایا تەحقیق لەگەڵ ئەو کەسانەشدا کرا ؟ کەوا ناویان دێنین :

١ــ ئەو ئەفسەرانەی دەستیان بە پشێوی رۆژی ٢٥ی مرداد کرد ، چونکە ئەوانە بەگویرەی مادە (١٩٩) لە قانونی سزای گشتی گوناهبارن کە لە (بەندکردن)ی نارەواو بێقانونی ئەدوێ • نەخیر ئەو کەسانە هیچیان لێنەکرا بەلکو بەخشیشیان درایە •

٢ــ ئەوانەی سندوقە ئاسنەکەی مالەوەیان شکاندمو هەرچی مالو سەندیکی تیابوو هەمویان برد ، مالەکەیان لێبسیننەوەو سەنەدەکانیش بدەن بە حکومەت •

٣ــ ئەو ئەفسەرانەی دوای پشێویەکە دانرابوون بۆ پاریزگاری مالەکەم بۆ ئەوەی نەیەلن تالان بکرێ بەلام هەر گوێشیان نەدایە •

٤ــ ئەو ئەفسەرانەی لە خۆیانەوە هەلیان کوتایە سەرم بۆ مالەوە بێئەوەی هیچ گوێ بدەنە مادە (١٣) لە قانونی ئەساسی کە ئەلێت : خانوی هەر کەسیك پاریزراوە لە چوونە ژورەوەی بێقانونی ، جگە لەوە ئنجا لە ئیوارەی رۆژی ٢٨ی مرداد سەعات (٥)ی ئنگلیزی خانوەکەم درایە بەر

تۆپ ، جا بۆ ئەوەی ئەمەش بەتەواوەتی دەرخەم ئەڵێم : (ئولاوند) لە سەعات ٦/٣٠ی ئیوارەی ئەو رۆژەدا لەجیاتی گشت ئەفسەرەکانی سەربە شاه هاتەلام‌و داوای لی‌کردم کەواز لە حوکم بێنم ، جا لەبەر ئەوەی من ئەمەم نەئەکرد چونکە بەوە پیشکەوتنی میللەتی ئیران ئەوەستا ، وەلامم دایەوە وتم پیویستە بکوژرێم نەوەك ئەوەی هەوڵمان بۆ ئەدا هەروا بەبایی هەوا بروا ، ئنجا لە نوینەران (دکتور شایکان ، حسیبی ، زیرەك زادە ، دکتور سنجابی ، نریمان )م داوا کرد کە ئەم بەیانە بنوسن‌و بلاوی بکەنەوە :ـ

( دکتور مصدق هەر خۆی بە سەرەك وەزیری یاسایی ئەزانێ بەلام لەبەر ئەوەی سوپاییەکان ئەمەیان ناوێت مصدق لە ماڵی خۆی دائەنیشێت‌و دەس بە کلاوی خوێەوە ئەگرێ بەمەرجێك بانەیبا ــ ناحەقی‌و زۆری لێ نەکرێت) تاکو پێیان وتم : بەیاخیکی سپی لەسەر خانوەکەم هەڵدەم کەوا حەقم بەسەر هیچ شتێکەوە نیە ، متیلە سپیەکەی سەر قەرەوێلەکەی خۆمم دراندبو دانێ بیکەن بەئالا ، لەگەڵ ئەوەشدا هەر هێرشیان هێنایە سەر ماڵەکەم‌و دایانە بەرتۆپ‌و گوللە • ئایا ئەو زۆردارانە بۆ محاکەمە ناکرین ؟ بۆچی ئەوانەی لەسەرەتاوە پاریزگاری خۆم‌و خانوەکەمیان کرد محاکەمە ئەکرین ؟ ئنجا پیویستە لەسەرم زۆر زۆر سوپاسی ئەو ئەفسەرە باشە بکەم کە کاری راستبێ واورد بە ماڵەکەمدا گەرابوو عەینەکەکەم کە لێم‌ون بوبوو ئەو بۆی دتۆزیمەوەو دایەوە دەستم •

دیسانەوە ئەلێم شا بەهیچ جورێك ناتوانی حکومەت بگورێت وەزیر لابەرێ‌و وەزیرێکی کە بێنێ ، چونکە وەزیران لەهەموو کارێکدا تەنها بەرامبەر بەپەرلەمان لێ‌پرسراون‌و هیچی‌تر ، شا مەسئول نیەو ناشبی وەزیران لە ئیشی شا لێ‌پرسراو بن ئەگینا ئەوساکە وەك ئەو پەندەی

لێ‌دێت کە ئەڵێت : (ئاسنگەرێك لە بڵخ گوناهبار کرا ، لەکاشان لەســەری مسگەرێکیان دا ) [1] .

دوای ئەوە وتی:ئەم کابرایە (ئازمودە) بەبێ دین‌و کافر گوناهبارم ئەکات، منیش وەك موسوڵمانێکی شیعە ئەڵێم : (اشهد ان لا اله الا الله وان محمدا رسول الله ، واشهد ان علیا ولی الله) .

من پەرلەمان دەسەڵاتی دامێ ، کە یاسا دابنێم‌و بیگۆڕم‌و لای‌بەرم ، ئەمەش بەشێوەیەکی (استثنائی) بوو ، تاکو یاسا سوپاییەکانیشی گرتەوە ، جا ئەگەر ئازمودە دان بەو یاسای محاکەماتی سوپاییەدا نائێت کە من دام‌ناو هەر ئەڵێ یاسای کۆن حسابەو ئەگەر بڵێ یاسای سوپایی هەر ئەبێ ئەفسەر دای‌بنێ ، ئەوە وائەگەیەنێت ، کەوا بڵێ لەم وڵاتەدا هیچ یاسایەك نی‌یــە . کەوابوو دوای ئەوە چۆن محاکەمەی خەڵك ئەکات ، کەوابوو قوڕ بەســەر ئەو کەسانەی لەگەڵ مندابوون ، ئەوانەی کە ئەم محاکەمەیــان ئەکات ... من دادگای عورفیم نەهێشت‌و یاسای محاکەماتی سوپاییم گۆڕی ، ئەمانــە هەموو پێویستە پەیرەوی بکرێن‌و کەس ناتوانێ دەستکاریــان بکاتــەوە ، پەرلەمان ئەبیت .

ئەم دادگا تایبەتیە کە بۆ محاکەمەی ئێمە پێك‌هــاتوە ، پێچــەوانەی (قانونی اساسی)یە ، کەسیش ناتوانێت هیچ کارێك بکات بەگوێرەی یاسا نەبێت ، لەبەر ئەوە ئەو گوناهەی ئازمودە ئەیداتە پاڵ من بەزۆری کوتەك‌و فوکی سوننی‌یە ، نەك بەپێی یاسا . جگە لەوانە محاکەمەی من‌و سزادانم بە را لێ‌بوونی پەرلەمان نەبێت ، بەهیچ جۆرێکی تر نــابێت ، ئەوســاش محاکەمەم پێویستە لەدیوانی دادگای باڵادا بێت کەوابوو نــە ئــەم دادگا سوپاییەو نە ئەم داواکەری گشتیە سوپاییە ، هیچ کامێکیان قانونی نــین‌و

---

(١) ئەمە پەندێکی فارسیە بلخ‌و کاشان دوو شارن لە ئێران .

ناشێن بۆ محاکەمەی من ، هەروەها بەگوێرەی ئەو یاسایانەی خۆم دام‌ناون، پیاوی غەیرە سوپایی نابێ لەبەر دەمی دادگای سوپاییدا محاکەمە بکرێت • جگە لەوە من وەزیری بەرگریی بووم لەبەر ئەوەی کە ئازمودەش سەرۆکی ئەندازیاری سوپابوو کەسەر بەوەزارەتی بەرگری بوو (تاکو رۆژی تاوانە دروست کراوەکە ) لەبەر ئەوە هەر بەگوێرەی یاسای سزای سوپایی ناتوانێ‌و نابێ لێرەدا ببێ بە داواکەری گشتیی • نەك هەر ئەوەندە ، بەڵکو پێویستە دادگای گەورە محاکەمەی ئە حاکمانە بکات کە ئەم دادگا ناقانونیەیان پێك هێناوە •• ئنجا روو ئەکاتە ئەندامانی دادگاو ئەڵێت :

بەلأم ئێوە ترستان نەبێت‌و دڵنیابن ، محاکەمەی ئێوە ناکرێت (پێکەنین)• دوای ئەمانە ئەڵێم : پیویستە رای گشتیی‌و نەوەی نوێ‌مان هەموو بزانن کەوا ئەمە یەکەم جارە لە مێژووی دەستوری ئێراندا ، سەرەك وەزیرێکی شەرعی بە پاڵەپەستۆ بخرێتە بەندیخانەوەو لەقەفەزی گوناهباراینشدا رابگیرێت • هەروەها پێویستە گەنجە نیشتمانپەروەرەکانی ئیران بزانن بۆچی وا لە من ئەکرێت ، هەرچەندە گوناهێکی زۆر دراوەتە پاڵم ، بەلأم من تەنها تاوانێکم کردوە ، ئەویش سەرشۆڕنەکردنە بۆ بێگانەو دەست‌کێشانەوەیان لەسامانی نەتەوەییمان ، ئەو راستیەی لەماوەی پەنجا ساڵ لەئیش‌کردنمدا بۆم روون‌بۆتەوە ئەوەیە ، تا ئیران لەدەست بیگانە رزگاری نەبیت‌و لەهەموو کارو بارێکیدا سەربەخۆی تەواو نەبێت ، هێچ گرێ‌یەکی بۆ ناکرێتەوە ، بەدرێژایی سەدەیەك ئنگلیزو هاوکاری نەوت ئیرانیان روتاندەوەو خوێنی میللەتیان مژیی ••• بۆیە تکام لەگشت رۆڵەکانی میللەتی ئێرانە ، هەموو چینەکانی بەپیرو جوانەوە لەسەر هەر ئاینی‌و مەزهەبێك بن، لەسەر هەر بیرو باوەرێك بن ، خاوەنی هەر کارو پیشەیەك بن ، ئەم راستیە تێبگەن ، منیش هەلم بۆ هەڵکەوت کە ئەم بەلأیە لەولأت دەرکەم‌و

شێرپەنجەکەی بفەوتێنم (لیرەدا سەرۆکی دادگا قسەکەی پێ ئەبڕێو داوای لێ ئەکات کە لەباسەکە لا نەدات ) •

دوای ئەوە ئەزمودە دەستی کردەوە بەقسەکردنو ناونانی سوكو بێ ئابروانە لەدکتۆر مصدق ، پێی ئەووت : بێئیمانە ، درۆزنە ، ساختەچیە، خائنە ، قسەی قۆر ئەکات ، تۆوی ناکۆکیو دڵپیسی ئەچێنێت ، فێڵبازو ڕێوی‌یە ، لەبەر دەمی دادگادا بێحەیایی ئەکاتو بۆ گاڵتە پێکردن پێی ئەووت (مصدق السلطنە)و لەم قسە سووکانە هەزاری بەپولێك ••• تا محاکەمەی ئەو ڕۆژەش دوایی هات ، بەبێ ئەوەی دکتور مصدق وەڵامی بداتەوە ، بەڵکو لەبەر لاوازیو پیریو نەخۆشی سەری نابوەوە سەر مێزەکەی بەردەمیو لەدواییدا (کورامین)ی قەترە قەترە ئەتکانە ناو ئاوەوە ئەی خواردەوە ، بەو دەرمانە تۆزێك هاتەوە سەرخۆی ••• دوای محاکەمە دەستپێکردنەوە ئازمودە دەستی پێکردەوە کەوا ••• مصدق کلکی بۆبە تەڵەوە ••• ئەو ئەتوارانەی مصدق ئەیان نوێنێ لەدادگادا ، شارلی شابلن [1] شتی واناکات ••• خوا حەقی لێسەند کەبێ بەگاڵتە پێکراوی جهان ••• دوای ئەوە داوای لەدادگاکرد کە ئەوەندە کاتی بەنرخی خۆی لەگەڵ ئەم کابرایەدا بەبا نەداتو دادگاش دیاربوو جلەوی بۆ ئازمودە شلکردبوو کە قسەی ئەوتۆ بکات دەردی لە پەندێکی کوردی‌دا ئەڵێت : ئەوقسانە بخرێتە سەرنان سەگ بۆنی پێوە نەکات ••• بەڵام مصدقی خاوەن رەوشتو بە (تربیە) ، مصدقی پێگەیشتو لەناو خێزانێکی بەرێزو بەئایین‌دا ، مصدقی نیشتمانپەروەری پاڵەوانی خۆماڵی‌کردنی نەوتی ئیرانو سەر بە ئیمپریالست شۆڕکەر ، وەك شێرێکی برینـدار لەقەفەزدا ئازمودە برینەکانی ئەکولانەوەو کەرامەتی پێشێل ئەکرد ، کە ئەوە کەرامەتی گشت میللەتی ئیران بوو ئەخرایە ژێر پێی بێگانەی خوێنمژەوە،

---

(١) ئەکتەری کۆمیدی هەرە بەناوبانگ .

مصدق لەوێدا هیچ دەسەڵاتیکی نەبوو ئەوە نەبێت خوڕ خوڕ ئاو بەچـاوە لێڵەکانیا بێتە خوارەوەو پیشی پێ‌بخواتـەوە ، بەڵام یـەك لەسـەریەکیش ئەیوت‌و ئەیوتەوە ، هیچ بەلامەوە گرنگ نی‌یە هەر فرمانێك بەسەرما بدرێت تاکو خنکاندنیش ، هەرگیز حوکمەکە (تمیز) ناکەمەوەو داوای لێ‌بـوردن ناکەم ، چونکە هەر تاوانبار پەنا ئەباتە بەر شتی وەها • منیش نەك هـەر تاوانبار نیم ، بەڵکو ئەوانە تاوانبارن کەمنیان هێناوەتە ئێرەو محـاکەمەم ئەکەن •

لەگەڵ ئەمانەشدا هەمووی سەرۆکی دادگا کە هەزار سوینـدی لـە دادگاکەدا ئەخوارد کە خواناسەو لەحەق لانادا و ئەفسەرێکی بەشەرەفـەو شا ئاموژگاری کردوە کە بەگوێرەی یاساو داد محاکەمە بکات •• کەچی ئەویش ڕێی بۆ ئازمودە خۆش ئەکرد کە ئاوا (اهانە)ی ئەو پیاوە پـیرە حەفتاو سێ سالیە بەرێزە بکات ، بـەڵام کە مصـدق ئەیویسـت وەڵامی تومانجەکان‌و ئەو گوناهانە بداتەوە کە ئازمودە ئەیدایە پالی ، سەرۆك ڕێی نەئەدا • نەك هەر ئەوەش ئەوانەی کە ئەش‌هـاتن بۆ سـەیر هەنـدیکیان (اهانە)ی مصدق‌یان بەپلارو قسەو پێکەنین ئەکرد ، تا وای‌لێ‌هات لەدانیشتنی رۆژی ۲۸ی تشرینی دوهەم دکتور مصدق رووی کردە سـەرۆك وتـی : لەوەی کەملم بەپەتەوە بکەیت ، هیچی زیاترت پێ‌ناکرێت •• بم‌کوژن •• منیش والەم سەعاتەوە بڕیارمدا کەواز لەخواردن بهێنـم‌و هیـچ نەخـۆم تائەمرم‌و بزرجمهریش بەهێچ جۆریك پارێزەری من نی‌یەو قبولم نەکردوە•• بەوە سەرۆکی دادگا لەدانیشتنی دواى ئەوەدا بای‌دایەوەو لە دکتوری پرسی

ــ بۆچی فرمانی گرتنی (عمید زاهدی)ت دەرکرد ؟

ــ چونکە لووتی ئەژەنە سیاسەتەوەو دژی حکومەت ئەوەستاو قسـەی ئەکرد • کاغەزم لایە کە ئەمانە ئەچەسپێنێ •

ــ ئەی سەرۆکی دیوانی شاهانەت بۆ گرت ؟

ــ چونکە بەشداربوو لەکودەتاکەدا •

ــ خاوەن شکۆ شا لەسەعات یەکی نیوەشەوی ۲۵ی مرداد (پێش ئەوەی بڕواتە دەرەوەی ئێران فەرمانی لابردن (اقالە)ی دان ، ئیوەش فرمانەکەتان وەرگرتو کاغەزێکی ئیمزاکراوتان لەجیاتیدا ، تەقەیەك چیە لیتان نەکرا •• بۆچی وازتان لەحوکم نەهێنا •

ــ ئەوانەی فرمانەکەیان بۆ من هێنا نەیان ئەزانی کەوا منیش بۆ پارێزگاری خۆم چەند تانکێکم لەدەوری ماڵەکەم دانابوو ، ئەگەر ئەو هێزەیان نەدیایە ، زۆرباش پەلبەستیان ئەکردم ، بــگرە تەقەو کوشتاریــش ئەبوو ، لەبەر ئەوە بوو کەوا بەو بێدەنگیەی ئیوە ئەفەرمون هاتن •

بەڵام دادگاش پرسیارێك بکات ئایا ئەوپیــاوەی (شــا) کە هــاتو فرمانەکەی بۆ هینام ، بۆچی بەهێزێکی چەکدارەوە هات ، بۆچی هەر ئەو هێزەو لەو شەوەدا دوو وەزیریان گرت ، ئایا ئەمە کودەتا نەبوو ؟ جگەلەوەی ئەو فرمانەی بۆمنیان هینا دەرم‌کەن لەوەزارەت ، نەنوسینەکەو نەئیمزاکــە هی‌شانەبونو (تزویر) کرابوو••بەبڕوای‌من شا ئیمزای ئەو کاغەزەی بەسپیەتی کردبو ، مێژوی دانەنابوو بەجــێی هێشتبو ، ئەوانیــش لەدواییــدا پریان کردبوەوە ، ئەمە منی خستە گومانەوە ، هەر لەبەر ئەوەش لای وەزیرەکان نەم‌درکاند ، چونکە ئەگەر ئەمە بڵاو ببوایەوە ئەبوو بەهەراو ئاسایش تێك ئەچوو ، لەرۆژی (۲۵)یشدا فرمانی هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانم دا ، چونکە هەندیك نوێنەری دژی حکومەتی تیدابوو ، بۆ ئەوەی لەوانە رزگاربیمو کاتم هەمو تەرخان‌کەم بۆ بەرهەڵستی کۆسپەکانی تر •

جا ئەگەر وای دابنێین کە فرمانەکەی شاش راست‌بوو واتا خــۆی نوسیبوی‌و ئیمزای کردبوو ، دیسانەوە ئەڵێم : دەرناچم‌و هەرگیز لەسیبەری

حكومەتێکی دیموکراتیدا (شا) مافی لێخستنی سەرەك وەزیرانی نی‌یە ، ئەمە ئەڵێم لەم شوێنەدا ، فەرموو ملم بکەن بەپەتا .. واتا ئەوەندە بەجەرگم‌و بەخۆما رائەپەرمووم کە بەپێچەوانەی دەستور نەجولیمەوەو بەرژەوەندی نیشتمان لەژوور هەموو شتێکەوە دابنێم‌و هەتا لەژیاندابم هەرگیز خزمەتی میللەت بکەم‌و هەوڵ بۆ پێشکەوتنی نیشتمانم بدەم‌و تا پێم‌بکرێ رێگای سەرکێشی کردن لە یاسا نەدەم . دوای ئەوە وتی :

مەسەلەی نەوتە ئێمەی بەم دەردە برد ، چونکە ئێمە لەشەری نەوتدا تا دوا هەناسە سەرکەوتین ، ئەوەش زیاتێکی گەورەی ئەو دەولەتانەی تیدابوو کە قازانجیان لەنەوتەکەمان دەست ئەکەوت، هەروەها رۆژئاواییەکان بەبۆنەی شوینی ستراتیجی‌و جوغرافی ئێرانەوە ئەیانویست لەگەڵیان بین ، بەڵام وەزارەتەکەی ئێمە ئەیویست ئێران بێلایەن بێت ، جگە لەوەی گێرانەوەی پەیوەندی‌مان لەگەڵ بەریتانیادا هەڵگرت بۆ دوای چارەسەرکردنی مەسەلەی نەوت. ئیتر بەکورتی ئەو گوناهانەی دادگا ئەیدانە پاڵ دکتور مصدق ئەمانە بوون :

١ ــ دەرکردنی فرمانی گرتنی (مقدم نصیری) سەرۆکی پاسەوانەکانی شا لەوکاتەدا کە فرمانی شاهانەی لابردنی لەوەزارەت بۆ برد .

٢ ــ دەرکردنی فرمانی بەندکردنی چەند کەسێکی‌تر .

٣ ــ چەککردنی پاسەوانەکانی شا .

٤ ــ داخستن‌و مۆرکردنی قاپیەکانی کوشك‌و تەختی شاهانەو دەرکردنی ئەو فرمانبەرو ئیش‌کەرانەی تیدابون‌و دەست‌گرتن بەسەر ئەوشتانەی لەویدابون .

٥ ــ فرماندان بە بروسکە بە باڵیوزەکانی ئێران لە دەرەوە وەك بەغداو روما کە شا نەبینن‌و قسەی لەگەڵ نەکەن‌و یارمەتی نەدەن .

٦ ــ فرمان‌دان به کوژاندنه‌وه‌ی ناوی شا له دوعای به‌یانیان‌و ئیــواران له‌کاتی خواردن‌دا له له‌شکرگاکاندا که له‌وه‌به‌ر ئه‌مه باوبوو •

٧ ــ ریك‌خستنی خۆپیشــاندان دژی شــاو بلاوکردنــه‌وه‌ی لــه رێی ئێستگه‌وه •

٨ ــ لابردنی په‌یکه‌ره‌کانی شای پێشوو شای ئێستاو بانگه‌واز بۆ گۆرینی رژێمی حوکم •

٩ ــ فرمان‌دان به (حل)ی په‌رله‌مان •

١٠ــ فرمان‌ده‌رکردن بۆ موته‌سه‌ریفی ئازربایجان که ئه‌ندامه‌کانی بنه‌مــاله‌ی شا بخه‌نه ژێر چاودێری‌یه‌وه‌و به‌ندیان‌که‌ن •

١١ــ ده‌رکردنی فرمانی ناشه‌رعی ، به‌گرتنی ماریشال زاهدی که دانرابوو به سه‌ره‌ك وه‌زیرانی ئێران •

١٢ــ لێ‌نه‌دانی گۆرانی شاهانه له ئیستگه‌ی تارانه‌وه •

١٣ــ خۆ ئاماده‌کردن بۆ ده‌نگ‌دان بۆ پێك هێنانی ئه‌نجومــه‌نی (وصایه) له شوینی شا •

ئه‌و گوناهانه‌ش که درانه پال ریاحی ئه‌مانه بوون :

١ ــ گرتنی (مقدم نصیری)و هه‌ندیك ئه‌فسه‌ری‌تر به‌بی هۆیه‌کی یاسایی

٢ ــ چه‌ککردنی پاسه‌وانه‌کانی شا •

٣ ــ کوژانه‌وه‌ی ناوی شا له‌دوعای کاتی نان‌خواردنی به‌یانیان‌و ئیوارانی سه‌ربازه‌کان له له‌شکرگاکاندا •

٤ ــ رێگادان به‌خۆپیشاندان‌و لێ‌نــه‌دانی پارته‌تونــده‌کان‌و رێ‌دان بــه هه‌لکه‌ندنی په‌یکه‌ره‌کانی شاو باوکی •

بەرگریەکانی دکتور مصدق بەکورتی بەرامبەر بەزنجیرەی تۆمانجەکان واتا وەلآمی مصدق بەم جۆرە بوو :

١ ـ فرمانی گرتنی (نصیری)م دا چونکە لەنیوەشەودا هەڵی کوتایە سەرم لەکاتیکدا کە هاتو چۆ یاساغ بوو ، کە هاتیش هیزی چەکو زرەیلی لەدواوە بوو •

٢ ـ ئاگام لە گرتنی ئەوکەسانە نیە کە ئەڵین گوایە من فرمانی گرتنم داون

٣ ـ چەککردنی هیزەکانی پاسەوانی شا لەبەر ئەوەبوو کە نیازی کودەتایەکی سوپاییان هەبوو •

٤ ـ (وەلآمی داخستنو مۆرکردنی کوشکەکانی شاو تەختی شاهانەی نەدایەوە ) •

٥ ـ ئاگام لەو بروسکانە نەبوە کە بۆ بالیوزەکانی ئیران نیراون ، رەنگ هەیە وەزیری دەرەوە دکتور فاتمی لیی دابن •

٦ ـ ناوی شا لەدوعای سەربازەکاندا هەڵگیرا ، ناوی ئیران دانرا ، چونکە ئیران لە هەموو کەس زیاترەو ئیران نەبوایە شا نەئەبوو •

٧ ـ دانانی پەیکەر دژی ئایینی ئیسلامە ، جگە لەوەی هەندێك لەچەپلەرەکان بۆ هەل ئەگەران کە تلیانکەنەوە ، منیش نەم هێشت بگاتە ئەورادەیە•

٨ ـ خۆ پیشاندانەکان بریتی بوون لەهەست دەربرینی رۆلەکانی گەل ، کە ئەمەش واتای دیموکراتیەتە •

٩ ـ دوای ئەوەی گەل دەنگیدا ، ئنجا پەرلەمانمان بلآوە پیکرد ، ئەویش لەبەر ئەوەی هەندێك لەنوێنەرەکان دژمان بوونو زۆریان بەشتی هیچو پوچەوە خەریك ئەکردین •

١٠ــ سازمان فرمانی چاودیری کردنی ئەنــدامەکانی خــێزانی شاهانــەی دەرکردوەو من ئاگاداری نیم •

١١ــ فرمانی گرتنی زاهدی لەبەر ئەوەبوو کە ئاسایشی ولاتو رژێمــی بپارێزم •

١٢ــ ••• ••• ••• ••• •••

١٣ــ دانانی ئەنجومەنی (وصایە) لەبەر ئەوەبوو ، کە شا لە ئیران چــوە دەرەوە بێ ئەوەی حکومەت ئاگادار بکات •

بەرگری ریاحی : وەك پارێزەرەکانی خۆیندیانەوە :

لەبەر ئەوەی کە سەرۆکی ســەرەوای سوپــا فرمــان لە وەزیــری بەرگرییەوە وەرئەگریت (کە دکتور مصدق بوو) ، لەبەر ئەوە ریاحی هیچ گوناهێکی نییە ، ئەوە نەبێت کە فرمانی لەخۆی بەرەوژورتری هێنــاوەتە دیی • ئەمە جگە لەوەی کە دکتور مصدق بە ئاشکرا خۆی دانی پێدانــا کەوا هەرکارێك کە بەتاوان ژمێراوەو رودانەکەی لەبــەینی ١٧ــ١٩/٨/٩٥٣[1] بوبێت بەقسەی ئەوبوەو ئەولێ پرسراوەی ئەنجامەکەیــەتی چونکە وەك خۆی ئەڵیت هەرگیز دژی یاسانە نەبوە •

**بریــاری دادگا •**

ئەمە بریاری دادگا بوو :

لەدادگا روونە کە مصدق مەبەسی لەو کردەوەو تاوانانە هەڵگیرانەوەی رژێمی حوکم بوە کە مادە (٣١٧) لە یاسای محاکەمــاتی مدنیو سوپــایی بەسەردا ئەسەپێ ، بەڵام دادگا لەسەر داوای خاوەن شکۆ شاهنشــا کــە ئەفەرموێ :

---

(١) ٢٦ ــ ٢٨ مرداد •

وازی لەمافی (شخصي) خۆی هێناوە بەرامبەر گوناهبار ، جگە لەپیری‌و تەمەنی زۆری‌و ئەو خزمەتانەی پیشکەشی میللەت‌و نیشتمانی کردون ، کە هەموو خزمەتی نیشتمانپەروەرانــەی بە رزن‌و لــەو رێگایــەدا گەلێــك ماندویەتی‌و کوێرەوەری کیشاوە •

لەبەر ئەوە دادگا بەگوێرەی مادە (٤١٣) لە یاسای محاکەماتی سوپایی‌و مادە (٤٤ و ٤٦) لە یاسای سزای گشتی فرمانی بەندکردنی مصدقی بەسێ ساڵ دا •

هەروەها بریاری بەندکردنی ریاحی بە دو ساڵ‌و دەرکردنی لەسوپادا، دا مصدق لیرەدا تەنها سوپاسی دادگای کرد کەوا دان بەخزمەتەکانیدا بەرامبەر بە نیشتمانی خۆشەویست ئەنێت •

دادگای بەرزتریش بریاری دادگا پێشوی چەسپاند • بەم جۆرە محاکەمەی رۆڵەیەکی نەبەز لەرۆڵەکانی گەلی ئێران ، رۆڵەیەکی دلسوز بو نیشتمان‌و خۆبەختکەر لەرێی ئیراندا ، دژ بە داگیرکەرو خوین‌و مژو ئیمپریالیست‌و دەست‌و پێوەندیان دوایی هات، مصدق بە بەندیەتی ئەو مــاوەیەی لــە بەندیخانەدا بردەسەرو لەدواییدا بەسەری‌بەرز هاتە دەرەوە چوو لەمــالی خۆی ، پاشماوەی ژیانی بردەسەر •

( سەرنجێك لــەم داوەری‌یــە )

ئەوەندەی محاکمەی مصدق لەکاتی خۆیدا رقی زوربەی ئازادیخوازانی سەرزەمینی هەلئەستان ، ئەوەنــدەش رق‌و کینەیــانی دژی ئیمپریــالیزم‌و پیاوەکانی توندوتیژ ئەکرد ، چونکە دکتور مصدق ئەو چیا سەختە قایمــە بوو کە نە محاکمەو نەپەتی خنکاندن‌و بەندیخانە توانیان سەری بێدا نەوێنن‌و لەرێی لابدەن • مصدق ئەوپالەوانە بوو کە هەرچەندە هێزی ئیمپریالیزم‌و

کونەپەرستانو کلکەکانیان ویستیان ناوی بکوژیننەوەو نەیهێلن ، ئەو بە پێچەوانەوە تا ئێستاش (کە خۆشی لەژێر گڵ دایە) و هەتا هەتایە ناوی هەر بەرزەو ئەدرەوشێتەوە ، چونکە پێشەوایەکی نیشتمانپەروەرو دلسوزی گەلی ئیران بوو • ئەو شۆرشەی ئەونایەوە لەسەر نەوت ، نەك هەر ئێران بەلکوو هەموو دەولەتە خاوەن نەوتەکانی گرتەوەو وریای کردنەوەو هەلو مافی باشی دەستخستن• مصدق هەرچیەکی کرد بەو پەری دلسۆزیو پاکیو خاوێنیەوە کردی ••• بەلام داخەکەم وەك هەموو پێشەوایەکی لەوجۆرەو لەو چینە ، کەتا نیوەی رێگادێنو دوای ئەوە ، خاوی ئەکەنەوە ، رێ بە دوژمن ئەدەن زەفەر بەرێت • پێش کودەتاکەی لەدژی مصدق کرا روژنامەو خەلکی ئێران بە ئاشکرا هاواریان ئەکردو ناوی ئەوانەیان شەنو کەو ئەکرد کە خراپەیان بەدەستەوەیە ، مصدق گوێی ئەوەندە نەدایە ، یاخود کاتێك کەوتە خۆی کار لەکار ترازابوو ، ئەمە لەکاتێکدا کە گشت گەلی ئێرانی بەدواوە بوو •

ئێران شوینیکی ستراتیجی گرنگی هەیە ، لەلایەکەوە پالی داوە بەخاکی سوڤیاتەوە ، لەلایەکی ترەوە چۆتە سەر تۆکەندی عەرەب ••• ئێران نەوتی هەیەو دەولەمەندە ••• لەبەر ئەوە ئیمپریالیزمو پیاوەکانی هەروا بە ئاسانی دەستی لێ هەلناگرن ، بۆیە دوای ئەوەی کە لە دادگای دادی دەولەتانو ئەنجومەنی ئاسایشدا هیچیان بۆ نەکرا ، ئنجا روویان کردەوە ناو ئێران خۆیو پەنایان بردە بەر دووبەرەکی خستنەوەو پیاوی ئایینیکرین ••• ئنجا هێزی سوپاو کودتا ••• ئەیان ویست مصدق لەسەر شاتۆی سیاسەت دورخەنەوە ••• ئامادە بوون بە هەموو نرخێك ئەو کودتایە بکرن تا تیا سەرکەوتن •• ئەوەبوو ئەو دەستەیان لە مصدق وەشاندو بۆ ئەوەی لە ئێرانو دەرەوەدا وای پیشان بدەن کە ئەو تاوانبارە نەك ئەمان خۆیان ، مصدقیان خستە ژیر گیروگازی دادپرسیەوە ، ئەگەر بیان توانیایەو

بیانویرایە لەجیاتی جارێك دە جاریان ئەخنکاند ، بەڵام لە ترسی رای گشتی گەلی ئێرانو ئازادیخوازانی جهان نەیان توانی دەستی لێبدەن ، لەهەمان کاتدا (کەس) نەیتوانی دلسۆزیو نیشتمانپەروەریو ئەوسزایانەی مصدق کیشاویەتی لەرێی ئیراندا ، بخاتە پشت گوێو دانی پێدا نەنێت •

محاکمەی مصدق وەك گەلێك لە محاکمەکانی تر کە بەسەریاندا تێپەرین محاکمەیەکی سیاسی بو ، بەڵام جۆری محاکمەکە لەبەر هەر هۆیەك بوویێت محاکمەیەکی ئاشکراو لەسەر پەیرەوێکی یاسایی بوو ، هەرچەندە (ئازمودە)یان وەك داواکەری گشتی کردبو بەکولکیەوە ، زووزوو قاپی ئەو پیاوە پیرە بەرێزەی ئەگرت ، قسەی سوكو ناشیرینی لەرووا ئەکرد ••• بەڵام لەگەل ئەمانەشدا هەموی رێی مصدق درا کە بەسەربەستی قسەبکاتو بەرگری لەخۆیو میللەتی ئیران بکات رۆژنامەچیو پەیام نێری رادیۆو ئیستگە لە هەموو لایەکەوە روویان ئەکردە کۆشکی (سەلتەنەت ئاباد) کە دادگاکەی لێ ئەبەسترا ، بەڵام فەرمانەکەی بەسەر مصدقدا درا دژی یاسابوو ، جگە لەوەی لەوە بەر بریاری لەسەر درابوو لەبەر :

یەکەم : ئەو هۆیانەی کە دکتور مصدق خۆی بۆ دادگای ئەهۆنینەوە ، بەتایبەتی مصدق دکتورای لەیاسادا هەبوو،بەگویرەی ئەو دەستورو یاسایەی کەتا ئەوسەعاتە ئیشیان پێ ئەکرا ، ئەبوایە دادی سەرەك وەزیران لەبەر دەمی ئەنجومەنی دەوڵەتدا بپرسرابایە ، ئەویش دوای ئەوەی پەرلەمان ئەو بروایەی پێ دابوو ، لێی بسەندایەوە ئنجا ئەنجومەنیکی دادگەر دادی بپرسیایە کە ئەویش ئەنجومەنی دەوڵەتەو بەهیچ جۆرێك دادگای سوپایی مافی دادپرسینەوەی مصدق یان نەبوو • بەلی مصدق وەزیری بەرگری بوو، بەڵام خۆی پیاوێکی (مدنی) بوو نەك (سوپایی)و گوناهەکەی سوپایی نەبوو

بەڵکو رامیاری بوو ... دکتور مصدق ئێستاش دانی بەوەدا نەنا کە ئەو دادگا سوپاییە بۆ دادپرسینی ئەو ئەشێت .

دووەم : لەهەموی سەیرتر ئەوەبوو دادگا لەگەڵ بریاری فەرمان دەرکردندا ، پەنجە بۆ (شا) را ئەکێشێت کە لەسەر داوای ئەو سێ ساڵ حوکم دراوە . واتا دادگا بوە بەدەسکەلایەك ، نەك دادگایەکی سەربەخۆ کەرێزی خۆی لابێت .. ئەبوایە دادگا فەرمانی خۆی دەرکردایە ، دوای ئەوە (شا) بە پێی دەسەڵاتی خۆی لەفەرمانەکەی کەم کردایەوە یاخود بگۆریایە ، بەڵام پەنجا راکیشان بەو زەقیە بۆ خواستی (شا) بۆ دادغگا ناشێ .

سێهەم : (شا) هەروەها مەلیكو سەرکۆمار لە دەوڵەتە دیموکراتیە پەرلەمانیەکاندا مافی لابردنی سەرەك وەزیرانیان نیە ، ئەو مافە بە پەرلەمان سپێرراوە کە بروا بە حکومەت بکات ئەوسا لەسەر ئیش ئەرواتو ئەگەر نەیکرد ئەوا حکومەت ئەبی واز بهێنێتو شا لەسەرۆکی دەستەیەکیتر ، یا لەیەکێکی تر داوا ئەکات کە وەزارەت پێك بهێنێت .. ئەگینا ئەگەر بەگوێرەی دەستورو یاسا بێت (شا) مافی لابردنی سەرەك وەزیرانی نیە .

چوارەم : مصدق ئازایانەو بە ئاشکراو بەبێ ترس ، قسەی خۆی ئەکرد ، دەری ئەخست کە نە ئەترسیو نەئەپارێتەوە ، هیچ باکی ئەوەی نەبوو کە ملیشی بکرێت بەپەتدا . بۆیە کە دادگا ئەو بریارەیداو (مرحمەتە)کەی شای بۆ خویندەوە ، باسی خزمەتی بەرامبەر بە ئیرانو ماندویەتیو کوێرەوەری کیشانی لەرێی نیشتماندا تێدا بوو ، بەڵاوتێکەوە تەنها سوپاسی دادگای کرد کە دان بەخزمەتەکانیدا ئەنێت ، بێ ئەوەی ناوی کەسی تر بهێنێت .

دوا وشه کەپێویستە بیلێین ئەوەیە : بەراستی هـۆڵی ئاوێنەبەنـد لەکۆشکی سەڵتەنەت ئاباد بوبوو بە مینبەرێك بۆ نوانـدنو دەرخستـنی تێکوشانو خەباتی دکتور مصدقو هاوریـکانی لەرێی ئـێرانو گەلـی ئێراندا ...

## ( فەرهەنگـۆك )

بۆ روونکردنەوەی ئەو ووشەو پیتو رستانەی کە لەم کتێبەدا هـەن یاخود پەیوەندییان بەباسەکەوە کەموزۆر هەیە • ئەم فەرهەنگۆکە ئـاوێتە کرا • بەڵام مەرج نیەیە هەرچی لەم فەرهەنگۆکەدا بێت ئەوە راستەو تەواوە• چونکە هیشتا لەزمانی کوردیدا گەلێك زاراوەی رامیاریو ئـابووریو قانونیو زانیاریو ••• هەن کە شوێنی تەواوەتی خۆیـان نەکردوتـەوەو بۆ دواجار نەچەسپاون • هەرچی هەولدانێك لەم بابەتەوە هەیە بریتیە لـە تێکۆشانێکی تایبەتی خاوەنەکەی تەنها ئەو زاراوانەی کـۆڕی زانیـاری کوردو هەندێك زاراوەی زانیاری قوتابخانەکان نەبن کە ئەوانە کۆڕێك یـا کۆمەڵێك لە مامۆستایان دایان ناوون ، کە ئەوانەش هێشتا نەبوون بەزاراوەی گشتیو شوێنی خۆیان بە تەواوەتی نەکردوتـەوە • جا ، ئەمـەی لـەم فەرهەنگۆکەدایە ، ڕای تایبەتی خۆمە بەرامبەر بەو وشە یاخود زاراوەیە ، یا ڕای خاوەنی ئەو فەرهەنگەیـە کە زاراوەکەم لێوەرگرتوە بەزوریـش زاراوەکانم لە فەرهەنگی (خال) وەرگرتوە •

**ئازاد** : سەربەخۆ (حر)
**ئازادخوا** : کەسێکە ئارەزووی سەربەخۆیی بێت (متحرر)
**ئازادی خوایی** : ئارەزوو کردنی سەربەستی (حریە)
**ئازادی رۆڵەکانی گەل** : الحرية الشخصية
**ئازادی ڕادەربڕین** : حرية الرأی
**ئازادی نووسین** : حرية الكتابة
**ئازادی بلاوکردنەوە** : حرية النشر

**ئازادی کۆبوونەوە** : حرية الاجتماع
**ئازادی بیروو باوەر** : حرية الاعتقاد
**ئازار** : ئێشی ئەندام ، سزا ، عذاب
**ئازاردان** : ئێش‌گەیاندن بە شتێك
**ئاسایش** : حەسانەوەو ئارام‌گرتنی گیاندار ، بێ ئاژاوەیی ، امن
**ئاسایی** : طبیعی
**ئاسۆ** : جێگای هەڵاتن یا ئاوابوونی ڕۆژو مانگ‌و ئەستێرە ، ملە .
**ئاسوودە** : گیانداری بێخەفەتی حەساوە
**ئاسوودەیی** : بێخەفەتیی
**ئاشووب** : جەنگ‌و کێشەی گەورە
**ئاکام** : ئەنجام
**ئـاڵا** : قەڵەمی نووسین ، بەیداخ
**ئامانج** : مەبەست
**ئاوات** : شتێکە خۆزگەی بۆ ئەخوازرێ
**ئاوارە** : مەردوومی دەربەدەر
**ئاوارەبوون** : دەربەدەربوون
**ئاواز** : دەنگی بەرز
**ئاوڕوو** : شەرم
**ئەدەب** : شەرم
**ئەرکی سەرشان** : واجب
**ئەنتیکەخانە** : متحف
**ئەفسەر** : ضابط
**ئەنجومەن** : مجلس
**ئەنجومەنی ئاسایش** : مجلس الامن
**ئەنجومەنی پیران** : مجلس الاعیان
**ئەنجومەنی نوێنەران** : مجلس النواب ، پەرلەمان
**ئەندازیار** : مهندس
**ئیشی بەزۆر** : سوخرە .

## ( ب )

**بابەت** : جۆر
**باج** : دراوێکە لەلایەن گەورەیەکی بەدەسەڵاتەوە لە هەموو بارێك ئەسێنرێ ضریبــە .
**باجگر** : کەسێکە باج کۆبکاتەوە . جابی الضرائب

**باجگرتن :** سەندنی باج . جبایة الضریبة
**بادانەوە :** پەشیمانبوونەوە .
**بازاری :** ئادەمی‌زادی هیچو پووچی بێمایە ، شتومەکێك چاك نەبێت. سوقی
**بارمتە :** رهینە
**بارەگا :** بلاط
**بارەگای شاهانە :** البلاط الملکی
**بالیوز :** سفیر
**بالیوزخانە :** سفارة
**برگە :** فقرە (فقرە من الکتاب)
**بریار :** قرار
**بریاری دادگا :** قرار المحکمة
**بروسکە :** برقیە
**بوختان :** تهمە
**بنەچە :** رەگەز
**بێلایەنی :** حیاد
**بەدکار :** کەسێکە کردەوەی بەد بێ
**بەدکرداری :** بەدی کردەوە
**بەدگومان :** کەسێکە بیری دەربارەی مەردوم باش نەبێت
**بەدناو :** کەسێکە ناوی بەخراپە زرابێ
**بەدناوی :** ناوزراندن بەخراپە
**بەدنمەك :** کەسێکە بەرامبەر بە چاکە خراپە بکات . خائن
**بەدنمەکی :** سپلەیی ، خیانەت
**بەندکردن :** توقیف . حبس
**بەندیی :** التوقیف . الحبس
**بەندیخانە : حەپسخانە :** حبسخانە
**بەهرە :** بەشتێکی باش ئەوترێت خوا بیدات بەیەکێك
**بەهرەدار :** خاوەن بەهرە
**بەڵگە :** دلیل ، وسائل الاثبات
**بەڵێن :** پەیمانو دەستە بەربوون
**بەڵێندان :** پەیماندان
**بەندیی :** مسجون
**بەندیخانە :** سجن

( پ )

**پارێزەر ، پشتیوان :** محامی
**پارێزکاری :** دفـاع
**پاشاگەردانیی :** فوضی
**پاشملە :** باسکردنی یەکێك کە خۆی دیار نەبێت (غیاب)
**پاکانە :** دڵپاككردنەوەی یەکێك بە سوێندخواردن بۆی
**پایتەخت :** عاصمە
**پڕرکێشیی :** زاتکردنو بەخۆدا راپەرموون
**پسپۆر :** خبیر ، مختص ، اختصاص
**پرۆژە :** مشروع
**پشتیوانی ئایین :** حامی الدین
**پلەی هەرەباش :** درجة جید جدا
**پێشوونە :** سابقە ، پێشوونەی داوەری : سابقە قضائیە .
**پێشەوا :** قـائد
**پوولەکی :** ئادەمیزادی رژدی پارەپەرست
**پەنابەر :** لاجیء
**پەناهێنان :** هاناهێنانی لێقەوماو بۆ پاراستنی
**پەیمان :** عهد ، معاهدە
**پەند :** ئامۆژگاری
**پەیکەر :** تمثال
**پەیوەندی :** علاقـە

( ت )

**تانك :** دبابە
**تاوان :** گوناح
**تاوان دانەپاڵ :** اتهام
**تاڵانکردن :** نهب
**تاقیکردنەوە :** تجربة
**تۆڵە :** پاداشی چاکە یا خراپەدانەوە (قصاص) ، (ثار)
**تۆڵە لێسەندن :** حەقلێکردنەوە ، سزادان
**تۆمانج :** تومەت ، گوناە (تهمة)
**تۆمار :** چەندکاغەزێکی نوسراوە بەیەکەوە نووساوە
**تەراتێن :** هاتوچۆکردنی گیاندار بە هەرراکردنەوە

**تەشقەڵە : گەرو فێڵ : تەشقەڵەکردن :** گەرکردن بەمەردومو بەگیرهێنانی بەناڕەوا بۆ داگیرکردنی شتێك لێی .

**تەشەر :** توانج

**تەڵەکە :** فرروفێڵ

**تەنگانە :** کاتی تەنگو چەڵەمە . (تەنگاو) لەتەنگانەدا بوون .

(تەنگاوبوون) : زۆر بۆ هاتنی گیاندارو تەنگاوبوونی

**تەنگو چەڵەمە :** کاتی سەغڵەتیو بێ دەرەتانی

**تەنگەتاو :** گیاندارێکە لەڕوویەکەوە زۆری بۆ هاتبێو گیری خواردبێ

**تەنگەگرتن :** دلگیربوونی یەکێك لە ووتار یا کرداری یەکێکی تر (لەڕووی سوکیەوە )

**تیاڕامان :** سەرسامان لەکاریکا

**تێبینی :** وردبوونەوەو دووربینی لەکارێکدا

**تێچاندن :** قسەی خراپکردن دەربارەی یەکێك لای گەورەیەك

**تێکسمرراو :** گیانداری قەڵەوی دارێژراو

**تێکەوتن :** خەریكو وێڵبوون بەدوای شتێکدا بۆ پەیداکردنی

**تێوەگلان :** دووچارەبوونی کەسێك بەکارێکەوە کە حەزی لێ نەکا

**تێهەڵچۆ :** کەسێکە بەبێ بیرکردنەوە پەلاماری هەموو کارێك‌بدا

**تێهەڵدان :** لێدانیگیاندار بەشەق

**تیپ :** کۆمەڵێك لەگیاندار

**تیر :** شتێکی راستی لووت تیژە بەکەوان ئەهاوێژرێت وەك گولله

**تیر ئەنداز :** کەسێکە کە تیر باش بهاوێ

**تیمارخانه :** شوێنێکە کە هەموو جۆرە دەرمانێکی تێدا بێت ، خەستەخانه

**جاڕ :** بانگەواز ، مناداة . اعلان

**جاسووس :** کەسێکە بەدزییەوە هەواڵو باسی یەکێك یا شوێنێك ببا بۆ یەکێکی تر

**جامباز :** فێڵباز

**جڵەو شل‌کردن :** بەرەڵلاکردنی منالو بەردەستو گوێنەدانیان

**جوانەمەرگ :** بەگەنجی مردن

**جوولەکە :** کەسێکە لەسەر ئاینی موسا پێغەمبەر بێت

**جەردە :** کەسێکە رێگا بەمەردم بگرێو بەزۆر رووتی‌کاتەوە

**جەژن :** رۆژی شاییو خۆشی گەلێك (جەژنانە) دراوێکە جەژنان بەمو بەو بدرێ

**جەماوەر :** جماهیر

**جەنگاوەر :** مەردومی ئازای شارەزا لەجەنگ

**جێ پێ لەڤکردن : جێ پێ لێژکردن** : دەرپەراندنی یەکێك لە شوێنێك بەزۆر بۆ هێنانی
**جێ پێ هەلگرتن** : شوێن پێی دز یا گوناهبار هەلگرتن
**جێدار** : وەکیل ، نوێنەر
**جێگرتنەوە** : دانیشتنی یەکێك لەجێی یەکێکی مردوو بۆ پڕکردنەوەی جیگاکەی
**جێگە خۆشکردن** : نیازی مانەوەی یەکێك لە شوێنێك
**جێگیر** : وەکیل . نائب
**چاولەدویی** : تەماعکاریی . طمع
**چاوبرسی‌ی** : بەرچاو تەنگ
**چاو داگرتن** : ئیشارەت کردن بەچاو
**چاو بەرەوژێر** : مەردومی تەریق بەرامبەر بە یەکێك
**چاو پۆشی** : بووردن لەتاوان یا کەمو کووڕی یەکێك
**چاولێ‌کەری** : تقالید
**چاو پیاخشاندن** : تەماشاکردنی شتێك بە خێرایی
**چاو تاریکبوون** : توورە بوون
**چاو دەرپەراندن** : توورە بوون
**چاووڕاو** : قسەی باش یا خراپ بلاوکردنەوە دەربارەی شتێك
**چرپە** : قسەکردن بەسرپە
**چڕ** : دارو درەختی زۆری بەیەکاچوو
**چوار چاوبوون** : سەر لێ‌شێوان
**چەپلە ڕێزان** : چەپلە لێدانی چەند کەسێك بەیەکەوە
**چەپگەرد** : ڕۆزگاری ناهەموار
**چەتە** : جەردە . خەلك رووت‌کەرەوە بەزۆر ، یاخی لەکۆمەلو رژیمی حوکم
**چیرۆك** : سەرگوزشتەو داستان
**چەوساندنەوە** : اضطهاد .

## ( ح )

**حەپەساندن** : سەرسام‌کردن
**حەشاردان** : شاردنەوەی شتێك

## ( خ )

**خامۆش** : گیانداری بێ دەنگ ، شارو دێی بی دەنگ
**خانەنشین** : کەسێکە لەماڵ دەرنەچێ ، متقاعد

**خانەوادە** : خانەدان
**خاوە خاو** : سست
**خشل** : زیررو زیوە ژنان بۆ جوانی بیدەن لە خۆیان
**خواجە** : پیری گەورە
**خوازبینی‌ی** : داواکردنی ژن بۆ مارەکردنی
**خوازە لۆك** : کەسێکە زۆر داوای شت لەمەردم بکات
**خواکرد** : شتیکە کە دەستکردی خوابێ‌و هی بەندە نەبێ
**خواناس** : کەسێکە خوا باش بناسێ‌و لە فەرمانی دەرنەچێ
**خۆپەسەند** : کەسێکە کە لە هەموکارێکدا بە خۆی بنازێ
**خۆخلافاندن** : سستی‌و خۆ خەریك‌کردن بە شتێکەوە
**خۆشکردن** : رازاندنەوەو رێك‌و پێك‌کردنی شوێنێك . سازکردن‌و خۆشی خستنە شوینك یا کۆرێکەوە .
**خۆلێکشانەوە** : پاشگەزبوونەوەو دەست‌هەلگرتن لە کارێك
**خولام** : بەندەی کەمەربەستە
**خۆهەلترراندن** : خۆ هەلکێشانی یەکێك بۆ شتێك کە لێ‌ی نەوەشێتەوە
**خوێنخوار** : دوژمنێکی‌وا کە بەخوێنی سەرت تینوو بێت
**خوێنشیرین** : مەردوومی ئێسك سووك
**خوێنکردن** : کوشتنی مەردوم
**خوێنکردنە کاسە** : رەش‌کردنی کەسێك لای یەکێکی‌تر بە جۆرێکی زۆر خراپ
**خوێنگەرم** : خوێن شیرین، سەرگەرم
**خۆیەتی‌ی** : دۆستایەتی‌و تێکەلاوی‌ی
**خەبات** : کۆشش‌و هەولدان
**خەستەخانە** : شوێنی دەرمان‌کردنی نەخۆش . مستشفی
**خەلات** : شتێکە کە یەکێکی گەورە بیبەخشێ بە یەکێکی بەرەو خوارتر لەخۆی لەرووی پیاوەتیەوەو لەرووی هاندان‌و خۆش پیاروانینەوە .
**خەلەفاو** : کەسێکە لەرووی‌پیریەوە خەلەفابێ ، بیرو هەستی کەم بوبێتەوەو جارجار قسە بزرکێنێ .
**خێزان** : ژنی مەردوم ، ئەو ئەندامانەن لەناو مالدا .

## ( د )

**دابارین** : کۆبونەوەی چەندکەسێك یا چەند گیاندارێك بەسەرشتێکدا
**دابران** : جۆی‌بوونەوەی شتێك لە شتێك ، یەکێك لە یەکێك
**دابێژان** : کون‌کون‌بوونی شت بەهۆی گوللە یامۆرانەوە
**داپیر** : نەنك

**دادبەر** : کەسێکە کە شکاتبکات لەیەکێك‌و داد بباتەلای دادپرسێك
**دادخوا** : دادبەر
**دادخواز** : دادخوا
**دادخوازیی** : دادخوایی
**دادخوایی** : سکالاکردن
**دادگە** : مەحکمە ، دادگا
**دادوفوغان** : هاوارو کرروزانەوە
**دارایی** : دەسەلات‌و دەستڕۆیشتن
**داستان** : بەسەرهات‌و سەرگوروشتە
**داماو** : کەسێکە لەسەر شتێك پەکی کەوتبێ
**دالدە** : پەناو پشتیوان
**دامرکان** : نەبزوتن‌و لە جولەکەوتنی شتێك
**دامەلاغاسی** : کەسێکە کە رووتکرابێ‌و هیچی پێ نەهێلرابێ
**دامێن‌گرتن** : هانابردن‌و داوای یارمەتی
**دانا** : مەردومی تێگەیشتووی وووریا
**دان‌پیانان** : راستی وتنی شتێك
**دانەر** : کەسێکە کتێب دابنێ
**داخواز** : (مدعی) کەسێکە شتێکی بوێ‌و هەولی بۆ بدا . داواکەر
**داخوازیی (داخوایی)** : (الادعاء) ویستنی شتێك‌و هەولدان بۆی ، داوا .
**داد** : (عداله) نەکردنی جەورو ستەم
**دادپرس** : (حاکم) کەسێکە هاواری جەورو ستەم بپرسێت
**دادپرسیی** : محاکمە
**دادپەروەر** : (عادل) کەسێکە جەورو ستەمی پێ ناخۆش بێت
**دادگا** : دادگە (محکمە)
**دادگای بەرز** : محکمەی تمییزو هەندێك جار (المحکمه العلیا)
**دادگای سزا** : محکمەی جزا .
**دادگای سوێندخۆرەکان** : محکمەی محلفین
لە چەند کەسێکی تێکەل پێك‌دێت‌و حاکمێکیان لەگەلدا لەجیاتی دادگای سزا یاخود دادگای گەورەیە
**دادگای عورفی سوپایی** : المحکمة العرفیه العسکریه .
**دادگای گەل** : محکمة الشعب
**دادگای گەورە** : المحکمه الکبری کە بۆ تەماشاکردنی گوناهو تاوانەو لەسێ حاکم پێك‌دێن یەکێکیان سەرۆکە
**دادگای (مدنی)** : المحاکم المدنیه : سەیری کاروباری ناو کۆمەل ئەکات وەك کرین‌و فروشتن‌و کرێ‌و بارمتەو ... زۆر شتیتر .

**دادنووس :** کاتبی عدل
**دادوبێداد :** دادو فوغان ، هاوار وشکات
**دادوەر :** قـاضي
**دادوەری :** قضاء
**داوەریی : محاکمە :** موحاکەمە
**دانپیانان :** پێ‌لێ‌نان (اعتراف)
**داوا :** طلب . ادعاء (ویـستن‌و خواستن بەزمان)
**داواچی :** کەسێکە دەعوا لەسەریەکێك بکات (مدعی) .
**داواکەر :** داواچی
**داواکار :** داواخواز
**داواخواز :** کەسێکە داوای شتێك بکات (داواکار)و (داواکەر) . مدعی
**داواخوازی :** داواکردنی شتێك . الادعاء .
**داواکردن :** ویستنی شتێك لەیەکێك . ادعاء ، طلب .
**داواکەری گشتی‌ی :** داواخوازی گشتی‌ی (المدعی العام) . دادخوازی گشتی .
**داوەر :** خوا . حاکم
**دروشم :** نیشانەیەکی تایبەتیە کە هەمو دەولەتێك هەیەتی . شعار
**دروستی :** سازکاری‌ی ، انتظام
**دووان :** خطبة
**دوورخستنەوە :** ابعاد ، نفی
**دەروون :** ضمیر
**دەرچوون :** استقالە (دەرچوون لە ئیشی میری) .
**دەزگا :** دەستگا ، مؤسسة
**دەست درێژیی :** اعتداء
**دەستوور :** باوی کۆمەلایەتی ، یاسای بنەرەتی دەولەت
**دەستووردان :** فەرمان‌دان بەکارێك
**دەستەبەربوون :** تعهد
**دەنگدان :** تصویت
**دراوسێ :** کەسێکە کە ماڵی لەماڵتەوە نزیك بێت
**درر :** گیانداری هارو هاج
**درۆزن :** کەسێکە زۆر درۆ بکات
**دژوێن :** جوێن
**دڵپیسکردن :** گومان پەیداکردن دەربارەی یەکێك بەخراپی
**دڵرەق :** مەردومی بێ‌باکی نامیهرەبان ، قاس
**دڵرەنجاندن :** زویرکردنی دڵی یەکێك
**دڵسۆز :** کەسیکە کە میهرەبان‌و دەرباستت بێ

**دڵنەوایی** : ئاشتکردنەوەی دڵی یەکێك کە زویر بوبێت .
**دۆخ** : چۆنیەتی شت
**دۆزەخ** : جەهەننەم
**دەزگا** : لەبنچینەدا لەئاسن یا لەدار دروست ئەکریو ئاسنگەر یـا کاڵادروو کاری لەسەر ئەکات . دایەرە . مؤسسە .
**دەستخەڕۆ** : کەسێکە تەفرە درابێو دەستەشکێن کرابێ
**دەستکێشانەوە** : دەست هەلگرتن لەکارێك ، سحب الید .
**دەست لێوەشاندن** : دەستکردنەوەو لێدانی خەڵك .
**دەستیار** : یارمەتیدەر (معاون) . یاریدەر
**دەستیار ئەفسەر** : نائب ضابط
**دەستیاو** : چاکەکردن لەگەڵ یەکێك بەرامبەر بەچاکەی ئەو
**دەمدڕاو** : ئەو کەسەیە کە قسە لەدەمیا ناوەستێ
**دەمدرێژ** : درێژدادری بێ شەرم
**دەمڕاست** : قسەزانو فەرمانرەوا
**دەمڕەش** : نوقڵانەی خراپیلێدەرو شووم
**دەمشڕ** : دەمدڕاو
**دەمودوو** : قسەو گفتوگۆ بە خۆشی
**دەمەلاسکێ** : لاساییکردنەوەی قسە
**دمهەراش** : دەمگەرمی سازندە
**دەولەت** : دارایی . حکومەت

**( ر )**

**را** : رای
**رابەر** : دلیل
**راپەراندن** : جێبەجێکردن . تنفیذ
**رارا** : هەردەمە لەسەر رایەك . متردد
**راز** : قسەی نهێنی (کلام سری)
**راستگۆ** : کەسێکە لەگفتو گۆدا درۆ نەکات (راستبێژ) (راستڕەو) (راستوێژ) شایەت ، شاهد
**راستگۆیی** : درۆنەکردن لەگفتو گۆدا . راستوێژی
**راسپاردە** : وصیـە
**رامیار** : مەردوومی سیاسی . الرجل السیاسي
**رامیاری** : سیاسەت
**رەخنە** : اعتراض

**رژێم** : نظام
**رەمەکی** : طبیعی
**راڤە** : شرح
**راڤەکردن** : شرحکردن
**راوێژ** : لێکدانەوەی ئەنجامی کارێك لەگەڵ یەکێکدا
**راوێژکەر** : مستشار
**رکێف** : دەسەلات
**رووداو** : قضیـــە
**رووالەت** : وتنو کردنی گوفتارو کرداری چاك بۆ چارەی مەردوم
**رەمڵگرتنەوە** : گرتنەوەی رەمڵ بۆ دۆزینەوەی شتێکی نادیار
**رەمڵلێدان** : قسەکردن لەشتێکی نادیار کە هێشتا رووی نەدابێ
**رەمەکی** : شتی رەشۆکی . اعتیادی
**رەوانبێژ** : کەسێکە نووسینو گفتو گۆی جوانو رەوان بێ (بلیغ)
**رێو شوێن** : پلانو نەقشەی شت

**( ز )**

**زارەترەك** : تۆقاندن لەترساندا
**زبانپاك** : قسەی باشکردن دەربارەی خەڵك (زمانپاك)
**زبانبەد** : قسەی بەدکردن دەربارەی خەلك (زمانبەد)
**زبانپیس** : جوێن فرۆش (زمانپیس)
**زەبوون** : گیانداری کزی لاوازی بێهێز
**زەررەنگەر** : کەسێکە زێرکاری بکا
**زەریا** : دەریا . بحر
**زەق** : شتی قۆقز . چاوی بز
**زەندەق** : وورە . زەندەقی چوو : وورەی بەردا
**زەندەقدار** : نەترس ، ئازاو بێباك
**زەهرەترەك** : **زارەترەك** : تۆقین لەترساندا
**زیندان** : بەندیخانە ، معتقل
**زیندەگانیی** : ژیـــان
**زیرەك** : مەردومی وشیاری زرنگی تێگەیشتوو
**زیز** : گیانداریزویر ، دڵنەرم
**زیقە** : **زیکە** ، **زریکە** : دەنگیکە لەئەنجامی ئازاردانی گیانلەبەر پەیدا ئەبێت

## ( ژ )

**ژار** : ژەهر . ژاراو : زەهراو
**ژان** : ئازارو ئێشێکە هەندێ جار تووشی گیاندار ئەبی
**ژمێرامە** : لائحە
**ژمارپار** : محاسب
**ژنبەژن** : ژندان بەیەکێك بەرامبەر بەژن لێخواستنی
**ژێرزریە** : زرەیلی ژێر دەریا

## ( س )

**سازکار** : موافق
**سامناك** : شتی بەسام
**سپا** : سوپا ، لەشکر
**سپادار** : سەرلەشکر ، سپاسالار
**سپاگا** : سپاخانە ، لەشکرگا ، معسکر
**سپایی** : سەرباز
**سپەر** : قەلغان ، سەنگەر
**ستایش** : مەدحو پیاهەڵدان
**ستەم** : ئازارو سزا بەنارەوا ، شتی گرانی بەئەرك
**ستەمکار** : کەسێکە زۆر ستەم لەمەردوم بکات
**سرپە** : قسەکردن لەژێر لێوەوە بۆ ئەوەی کەس گوێی لێنەبێ
**سزا** : ئازارو دەریسەری ، عقوبە .
**سزادان** : ئازارو دەردیسەری دانی گیاندارێك . عقاب
**سکاڵا** : هەڵرشتنی داخو خەفەتی دڵ لای یەکێك . سکاڵانامە : عریضە
**سۆراخکەر** : پشکنەر ، ئەو کەسەی لەشت ئەکۆڵێتەوە ، محقق
**سیخور** : جاسوس
**سوێندخۆر** : محلف
**سوێندخۆران** : سوێندخۆرەکان (محلفین)
**سەختکردن** : تووڕەبوون
**سەرباز** : کەسێکە چووبێتە ژێر چەکی دەوڵەت بۆ پاسینشتمان . عەسکەر جندی
**سەربازگە** : سەربازخانە ، لەشکرگا ، معسکر
**سەربزێو** : مەردومی جەربەزەی هاروهاج
**سەربەست** : سەربەخۆ

**سەربەستی** : سەربەخۆیی
**سەرپشك** : شتێکی زۆر باشە لەناو چەند شتێکیترا کە پشك خرابێو بەریەکێك کەوتبێ
**سەرپەرشت** : کەسێکە چاودێری شتێك بکات
**سەردانەواندن** : شەرمەزارکردنی یەکێك
**سەردەم** : کاتو حەلێکی تایبەتی کارێکی تێداکرابێو ئێستا باسی بکرێتەوە
**سەرکۆمار** : گەورەی چەندخێڵێکی کۆچەری ، رەئیسی جمهور
**سەرلەشکر** : قائدی فیرقە
**سەرناو** : لەقەب
**سەرنج** : تەماشاکردن بەوردی (تدقیق)
**سەرۆك** : گەورەو پێشەوای گەلێك
**سەرەنگرێ** : ئەو کەسەیە تووشی قورت یا کۆسپێکی گەورە بوبێت
**سەرەوای سوپا** : ارکان الجیش
**سەرەکی سەرەوای سوپا** : رئیس ارکان الجیش
**سەرەونگوون** : گیاندار یا شتی وونی بێ سەرو شوێن
**سەدە** : سەد ساڵ : قرن
**سەدەکانی ناوەراست** : القرون الوسطی
**سەنگینی** : احترام : رێز
**سەجەرە** : شجرە (الانساب)

( ش )

**شا** : گەورەی دەولەتێکە کە نەگۆررێو لەدوای خۆی کورەکەی لەجێی بێت مەلیك . شاە . شاهانە : شتی شایانە
**شابەندەر** : قۆنسۆڵ
**شاد** : کەسێکە بەئارەزووی خۆی گەیشتبێ
**شارستان** : شاری گەورەی ئاوەدان کە (متصرف یا محافظ)ی تێدا دانیشێت
**شارەوانی** : بلدیە
**شازادە** : نەوەی شا
**شاژن** : ژنی شا
**شاڵاو** : پەلاماردانێکی بێشەرمانەیە لەگەڵ جوڵانەوەی دەستا
**شالیار** : پاشا . وەزیر
**شانس** : بەخت
**شانۆ** : شوێنێکە لەتەختە دروست ئەکرێو بەرز ، ئەکتەر چالاکی خۆی لەسەر پێشان ئەدا بەرامبەر بەخەلك ، مسرح .

**شاهەنشاه** : شایەکی گەورەیە کە قەڵەمرەوێکی گەورەی هەبێ
**شایان** : شایستە
**شایەتی** : شهادەت
**شایەتیدان** : شهادەتدان لەسەر شتێك
**شایەت** : شاهد
**شایەتی ساغکەرەوە** : شاهد الاثبات
**شایەتی بەرگری** : شاهد الدفاع
**شکۆ** : سام . سامانو گەورەیی
**شڵەژان** : پەشۆکان
**شمشێر** : سیف
**شیرازە** : نظام (نظام المجتمع)
**شیوەن** : گریانی بەکوڵ بۆ مردو

## ( ع )

**عاجباتی** : شتێکە مایەی سەرسوورمان بێت
**عارنان** : چاوترسان لەشتێكو دەست هەڵگرتنو تەمێبوون
**عازەب** : کوررو کچی گەورەی لەخەم رەخسیو ، (اعزب)
**عەرد** : زەوی
**عەنتیکە** : شتی نایابی بەنرخ
**عەنتیکەخانە** : شوێنێکە کە شتی عەنتیکەی تیا دابنرێ ، متحف
**عەیار** : ئافرەتی زۆرزانی فێڵباز

## ( غ )

**غار** : راکردنو تاودانی وڵاخ . غاردان
**غوڵغوڵە** : هەراو هوریاو تێكرژانی مەردووم
**غەزەتە** : رۆژنامە . عەزەتەچی : رۆژنامەچی
**غەڵبە غەڵب** : دەنگی زۆرو ژاوەژاوەی مەردووم
**غەوارە** : بێگانە

## ( ف )

**فابریقە** : کارگە
**فاکوفیك** : کەڵکەڵە

**فامیده** : تێگەیشتو
**فرۆکەخانە** : شوێنێکە فرۆکەی تیدا بنیشێتەوە
**فرۆکەوان** : کەسێکە فرۆکە لیخوڕێ
**فشە** : گالتەوگەپ . فشەکردن : خۆ هەلکێشان
**فەرامۆش** : شتێکە لەبیر چووبێت
**فرمان** : ئیش‌و کار . عمل ، وظیفە
**فەرمان** : داواکردن‌و خوڕینی گەورە بەسەر پچووکا بۆ شتێك ، کاغەزێـکە کە فەرمانی پاشایی تیا نوسرابێ . قراری محکمە . ئەمری خاوەن دەسەلات لە دەولەتدا
**فەرمانبەر** : کەسێکە فەرمانی گەورەیەك بەجێ بێنێ ، فەرمانی حکومەت بەجێ بێنێ . موظف
**فەرمانڕەوا** : کەسێکە کە فەرمانی برر بکات . آمر . صاحب الکلمە
**فەرمانکردن** : فەرماندان بەشتێك . امر .
**فەرمانگە** : دائرەی دەولەت
**فەرمانگێر** : حکومەت
**فەرمان‌نامە** : تۆماری دەولەتی‌ی (سجل)
**فەرمایشت** : قسەو گفت‌و گۆی پیاوی گەورە یا ئەو کەسەی بەرێزەوە سەیری ئەکەیت‌و ناوی ئەبەیت . فەرموودە
**فەرمان‌رەوا** : صاحب الکلمە . حاکم . فەرمان : امر . حکم . طلب . توصیە .
**فەرهەنگ** : کتێبێکە وتەی زبانێك بگرێ‌و راڤەی بکات
**فەرهەنگۆك** : فەرهەنگی بچوك
**فەهرست** : ئەو سەرباسانەن کە لە کتێباهەن‌و لەپێش یا لەپاشیەوە بەریزکراوی ئەنوسرێن لەگەل ژمارەی لاپەرەکاندا . فهرست
**فێل** : بەکارهێنانی شتی درۆو چاوبەست بۆ سەرتێکدانی مەردوم. خداع
**فیڕۆ** : لەدەستچوونی شت بەخۆرایی

## ( ق )

**قرسان** : تەخمین
**قرنجان** : روشان‌و برینداربوونی شت
**قسە بڕینەوە** : دەنگ دابڕینی یەکێك لەگەل یەکێکی‌ترا لەبەر زوبری
**قسە بەسەر قسەدا هێنانەوە** : گورێزکردن لەقسەدا بۆ سەر قسەیەکی‌تر . قسەبڕین بەیەکێك
**قسە خواردنەوە** : قووت دانەوەی قسەو نەکردنی لەبەرشتێك
**قسە دۆڕاندن** : دەربڕینی قسەیەکی نەهێنی

**قسەرەق :** قسـەی قورس‌و ناخۆش
**قسەرەوا :** کەسێکە قسەی لەناو کۆمەڵدا برر بکات
**قسەرەوان :** کەسێکە لەقسەدا دانەمێنێ
**قسەزل :** مەردومێکە قسەی لەخۆی زلتربێ
**قسەلەروو :** قسەکردن بەرامبەر بەخەلك نەك لەپاشملە هەرچەندە قسەکانیش رەق‌بن .
**قسە لەسەر داکیشان :** قسە دەرهێنان لە یەکێك بەفێڵ
**قسە نەستەق :** کەسێکە قسەی خۆش‌و قوت بێ ، قسەی لەجێداو معقول بێ
**قسە وەرگرتن :** گوێگرتن لە قسەی یەکێك
**قسەو باس :** دەنگ‌وباس
**قسەهێنان :** هێنانی قسەی یەکێك بۆ یەکێکی‌تر
**قسەی نەستەق :** قسەی بەرزی بەکەڵك
**قورئان دان :** سویندانی یەکێك بە قورئان . قسم
**قۆرخ :** قەدەغە
**قوربەسەری :** لێ‌قەوماوی ، هەژاری
**قورعان :** قورئان
**قۆزتنەوە :** گرتنەوەی شت بەدەست‌و بردی
**قۆڵبەست :** بەندیەکە لەپشتەوە هەردو قۆلی بەسترابێ
**قوللە :** قەڵای بەرز ، قەڵای بەرزی قایم‌و ئامادەکراو بۆپاسەوانی‌و بۆ شەرر . قلعـە .
**قومارباز :** فێڵباز ، تەڵەکەباز
**قومارچی :** کەسێکە یاری قومار زۆربکات
**قەبارە :** بارستایی شت
**قەبلاندن :** ئەندازەدانان بۆ شتێك لەبابەت نرخ‌و چەندینەوە
**قەپاڵ :** قەپگرتن لەشتێك پرربەدەم
**قەدەغەکردن :** نەهێشتنی توخن‌کەوتنی یەکێك بەلای شتێکدا
**قەرال :** پاشا : قەیسەر
**قەرالیچە :** ژنی قەرال .
**قەرز کوێر :** کەسێکە درەنگ قەرزبداتەوە بەو کەسەی لێ‌ی‌سەندوە
**قەشە :** پیاوی پێشەوای ئایینی دیانەکان .
**قەڵا :** خانوویەکی قایمە بەشوێنیکی بەرزەوە . قلعە
**قەڵاچۆ :** قرانی گیاندار
**قەڵـغان :** شتێکی گردی پانە لەچەرمی ئەستور دروست ئەکرێ‌و لـەکاتی چەنگدا بەرهەلستی شیرو تیری دوژمنی پێ ئەکرێ
**قەوماو :** کارێکی ناخۆشی گرنگ کەرووی دابێ

## ( ك )

**کات** : دەمێکی کەم
**کات ژمێر** : سەعاتیکە کەکات ئەژمێرێ
**کاربەدەست** : کەسێکە لەکاروباردا هەر خۆی حل‌بێ
**کارامە** : مەردومی دەرهاتووی لێزان
**کار پێ‌سپێرداو** : وکیل ، جێ‌گر
**کارپێ‌سپاردن** : توکیل . تفویض
**کارخانە** : معمل
**کان** : کانگە . معدن
**کانگا** : شوینێکە شتێکی تیدا بەزۆری پەیدا ببێ
**کرنووش‌بردن** : سەردانەواندن‌و چەمینەوە لەبەر دەمی یەکێکدا بۆ بەگەورە راگرتنی
**کلۆج** : بەهیچ جورێك (کل وجه)
**کۆڕ** : مجمع
**کودتا** : انقلاب
**کولتوور** : ثقافه
**کولتووری یاسایی** : ثقافه قانونیه
**کۆڵدان** : وەرس‌بوون لەشتیك‌و دەست لێ‌هەلگرتنی
**کۆنگەرە** : مؤتمر ، کۆنگرە
**کۆنووس** : نوسراوێکە کە چەند کەسێك لەبارەی شتیکەوە بینووسن‌و مۆری‌بکەن (محضر)
**کۆنەپەرست** : کەسێکە کە بیرو باوەری کۆنی خۆش بوێ با نارەواش بێ (رجعی)
**کۆمەلە** : مجتمع ، کۆمەڵ
**کۆبونەوە** : اجتماع
**کەلەپاچەکردن** : شەق‌و پەق‌کردنی گیاندار
**کەلەپچە** : ئاسنێکە ئەکرێتە دەستی بەندیەوە
**کەلەپوور** : جێماوی بەنرخ
**کەڵەمێرد** : پیاوی دەمراستی ئازای دەرهاتوو
**کەمتەرخەم** : کەسێکە شتی زۆر مەبەست نەبی (غیر جدی)
**کەمدوو** : کەسی کەم قسەیە

## ( گ )

**گاز** : قەپ‌گرتن لەشت بەدان . بانگەواز
**گازندە** : **گازانده** : گلەیی

**گرفتار :** کەسێکە گرفتاری ناخۆشیەك بوبێت
**گرەوکردن :** بەستنی پەیمانو بریاری چەند کەسێك لەسەر شتێك
**گورز :** پەتێکی ئەستوورە کە سەرێکی خررو گرێدار بێ
**گورێز :** لادان لە شتێك یا لەشوێنێك
**گۆلمەز :** گۆبەنگ
**گوناح :** گوناه : وتن یاکردنی شتی خراپ
**گوناه :** اثم . ذنب . خطیئه . معصیه . تهمه
**گوناهبار :** گوناحبار : گوناحکار : کەسێکە کە گوناه بکات . متهم . آثم . خاطیء . مذنب
**گوناحکردن :** ارتکاب او اقتراف الذنب او الخطیئه .
**گۆهبەل :** جاسوس .
**گۆهپەلی‌ی :** جاسوسووسی‌و گوێ قولاغی
**گەردش :** شۆرش‌و ئاشووب .
**گەلاتە :** شتێکە کە سەروبەندی گیرابێ‌و هێشتا تەواو نەبووبێ
**گەواهنامە :** شەهادەتنامە
**گەواه :** شاهد
**گەواهی :** شاهیدی
**گیـــان :** روح
**گیانەلا : گیانەلاو :** کاتی سەرەمەرگ
**گێچەڵ :** تەشقەڵە
**گێرەو کێشە :** کەشمەکەش‌و دەردی سەری
**گیر :** مەردومی رژدی چروك
**گیرۆدە :** بەناخۆشیەوە گیرۆدەبوون

## ( ل )

**لاسایی :** چاو لەمەردوم کردن لەکردارو گفتاردا . چیرۆکی لاسایی : چیرۆکی تمثیلی .
**لالێکردنەوە :** یارمەتی‌دان‌و دەستگیروبی
**لاموجیم :** سەرپێچی‌و بەهانە هێنانەوە
**لانەواز :** کەسێکە جێگاو رێگای خۆی لێ شێوابێ
**لایەنگیر :** کەسێکە بەکردار یاگفتار لەسەر یەکێك بکاتەوە
**لێکۆڵینەوە :** تحقیق
**لێکۆڵینەوەی سەرەتایی :** تحقیق اولی
**لێکۆڵینەوەی تەواو :** التحقیق النهائی

**لەخشتەبردن** : هەڵخەڵەتاندنو لەرێدەکردنی خەڵك
**لەخوچوون** : بێهۆش کەوتن ، لەسەرخۆ چوون
**لەداردان** : هەڵواسینی مەردوم بەداردا
**لەشکر** : کۆمەڵی سەرباز
**لەشکرئارا** : گەورەی لەشکر
**لەشکردار** : لەشکرەوان
**لەشکرشکێن** : مەردومی ئازای جەنگاوەر
**لەشکرکاری** : لەشکرکۆکردنەوەو هینانو بردنی
**لەشکرگا** : شوینی لەشکر
**لەگام** : کەسێکە زۆر کلکەلەقێو روپامایی بکات
**لیس** : داری ئەستوری درێژی بێقۆرتی گرێ بۆلێدان زۆرتر بەکار ئەهێنرێ
**لیس تێکوتان** : زۆری هاتوچۆکردنی یەکێك بۆ شۆینێك

## ( م )

**مات** : گیانداری بێدەنگو خەفەتبار
**ماتەم** : شیوەنو پرسە . مأتم
**ماتەمین** : خەفەتبار
**مامەڵە** : شتکرینو سەوداکردن لەگەڵ یەکێکدا
**ماف** : حەق
**مافی ماڵ پشکنینی** : حق التحری (تحری الدور وما یماثلها)
**مافی دەسەڵاتداری** : حق السیاده
**مافی رۆلەکانی گەل** : حقوق افراد الشعب (الحق الشخصي)
**مافی شارستانیەتی** : بەهرەی شارستانیەتی : الحق المدنی
**محاکمە** : **موحاکەمە** : داوەریی
**موتالآ** : خویندنەوەی کتێبو لێوردبوونەوەی
**مۆرکردن** : بریار لەسەردان : موافقت : ئیمزا : توقیع
**مۆڵەت** : ماوەدان بە ئیش
**مەخسەرە** : گاڵتە پێکردن
**مەرد** : پیاوی ئازای جوامێر
**مەلیك** : ملك : شا : پاشا : پادشا
**میرات** : کەلەپوورێکە کە مردووبەجێی بێڵێت
**میهرەبانیی** : عطف

**مەبەسی‌بەد** : سوء القصد
**مل‌پەڕێنەر** : جلاد

## ( ن )

**نابەڵەد** : نەشارەزا
**ناخونەك** : خواردنی شتی مەردوم بەهەوانتە
**نازناو** : لقب
**ناكۆكی** : تفرقە
**نامەد** : بەدبەخت
**نامەرد** : مەردومی ناپیاو
**نامیلكە** : كتێبی بچوكی چەند پەرەیی
**ناوبژی** : كەوتنە ناوەندی دوكەس كە بەگژ پەكاچوون تا هەرا نەكەن
**ناوكۆیی** : شراكەت
**نووزە درێژ** : درێژ دادرر
**نووسەر** : كەسێكە بزانێ بنووسێ . كاتب
**نوێنەر** : كەسێكە كە لەدەوڵەتێكی بێگانەدا جێداری دەوڵـەتی خـۆی بـكا
كەسێكە لەدەوڵەتەكەی خۆیا جێداری گەلەكەی بكا . نائب
**نەمر** : بریتی‌یە لەخوا . خالد . ئەوكەسەی ناوی بەباش ئەمێنێ .
**نەشیاو** : حرام

## ( و )

**واتە** : واتا
**واگۆ** : دووبارە كردنەوەی قسەیەك . تۆماركردن . تسجیل
**وتار** : گوفتار
**وەجاخ** : منالی نیرینەی مەردم
**وەستا** : كەسێكە لەكاریكدا پسپۆر بێت . استاذ
**وێران** : شوێنی روخاوی كاول
**وێژەر** : ئەدیب . شاعیر . قسەكەر
**وێژەوان** : وێژەر
**وێژەیی** : ئەدەبی
**وێڵ** : ئاوارە

## ( هـ )

**هاوکاری** : شرکه
**هاوسەر** : ژن‌و میرد
**های‌بەخت** : قورعه
**هاوڕێی گەل** : صدیق الشعب
**هەڕەشە** : تهدیـد
**هەڵڕشتن** : اعتراف . دان پیانان . پێ‌لێنان
**هەڵنان** : مدح
**هەل** : فرصه ، دەرفەت

## ( ی )

**یاسا** : قانون . شەریعەت . ڕەوشت . باو
**یاسایی** : قانونی
**یاسای‌سزا** : قانونی عقوبات
**یاسای سزای بەغدا** : قانونی عقوباتی بەغدادی (بۆیە وتراوە بەغدادی کە لەگەل قانونی عوسمانی‌دا جیابکرێتەوە) .
**یاسای مدنی** : قانونی مدنی
**یاسای مرافعاتی مدنی** : قانونی مرافعاتی مدنی
**یاسای مرافعاتی سزا** : قانونی مرافعاتی جزائی
**یاساخ** : قەدەغە . منع
**یاساول** : پاسەوان

# ناوەرۆك

# راستکردنەوە

| لاپەڕە | دێڕ | هەڵـە | ڕاست |
|---|---|---|---|
| ٢٥ | ١٨ | کۆرانی | کوڕانی |
| ٢٧ | ٣ | ژنیی | ژنی |
| ٣٢ | ١ | بوویه | بووبـه |
| ٤١ | ٢١ | بەپیرا | بەبیرا |
| ٤٣ | ١ | شانزهەم | شانزەهەم |
| ٤٣ | ٣ | شانزهەم | شانزەهەم |
| ٤٤ | ١٦ | ئەر | ئـەگەر |
| ٤٦ | ١١ | شانزهەم | شانزەهەم |
| ٤٩ | ٢ | ئەموستیدەی | ئەموستیلەی |
| ٥٠ | ٣ | پەرپـابوو | بەرپـابوو |
| ٥٠ | ١٤ | دەرجێت | دەرچێت |
| ٥١ | ٤ | دەبیێت | دەبێت |
| ٥٣ | ٢ | وکوشتنیمارا | وکوشتنیمارا (١) |
| ٥٩ | ٢٣ | چیرۆندیەکان | جیڕۆندیەکان |
| ٦٠ | ٢٢ | فەرەنسەکان | فەرەنسیەکان |
| ٧٤ | ٩ | گوێ | گۆی |
| ٩١ | ١٣ | تیاینە | تیانیە |
| ٩١ | ١٩ | پیرسیتەوە | بپرسێتەوە |
| ٩٢ | ١١ | تیاخواریەوە | تیاخورایەوە |
| ٩٨ | ٦ | لیپرسی | لێپرسی |
| ١٠١ | ١١ | گیراوە | گیرڕاوە |
| ١٠٥ | ٢ | سوێندخوارەکان | سوێندخۆرەکان |
| ١٠٧ | ١ | محاکمەی | موحاکەمەی |
| ١١٠ | ٦ | پرپروا | پڕبڕوا |
| ١١٤ | ١٨ | ئەویست | ئەیویست |
| ١١٥ | ٦ | بە پەرانقەو زنجیرەوە هیزا | بەزنجیرەوە هێنرا |
| ١١٩ | ١٨ | خۆبەپاك پیشاندان | پاکیپیشاندان |
| ١٢٠ | ١ | محاکمەی | موحاکەمەی |
| ١٢٧ | ١ | محاکمەی | موحاکەمەی |
| ١٢٨ | ٢١ | بایێ | بایی |
| ١٣٥ | ٢ | سوێندخوارن | سوێندخۆران |
| ١٣٧ | ١ | محاکمەی | موحاکەمەی |

| لاپەڕە | دێڕ | هەڵــە | ڕاست |
| --- | --- | --- | --- |
| ١٣٨ | ٢و٣ | لەپەراویز زیادە بیکوژینەوە | **بیکوژینەوە** |
| ١٤٥ | ١ | دانیش | **دانیشن** |
| ١٦١ | پەراویزی ئەم لاپەرەیە لەگەڵ ئەودیوا لەیەکبدە . | | |
| ١٦٢ | ٨ | نی‌بەو | **نی‌یەو** |
| ١٧٢ | ١ | محاکمەی | **موحاکەمەی** |
| ١٩١ | ١ | محاکەمەی | **موحاکەمەی** |
| ١٩٧ | ٢ | پسپۆڕی | **پسپۆڕیی** |
| ٢٠٤ | ١٣ | بەگەورەی | **بەگەورەیی** |
| ٢٠٥ | ٢ | تانکەکنی | **تانکەکانی** |
| ٢٠٨ | ٢ | بەبینراریەکەوە | **بە بێزاریەکەوە** |
| ٢١١ | ١٧ | بلوکی | **بـــاوکی** |
| ٢١٢ | ١٠ | ئامادەکردنێ | **ئامادەکردنێ** |
| ٢١٦ | ٧ | ئەحاکمانە | **ئەو حاکمانە** |
| ٢٢٤ | ١١ | دادگاپێشوی | **دادگای پێشووی** |

★ ★ ★

نرخی ( ٦٠٠ ) فلسە

(٤٠٠٠) دانە لەم کتێبە لەچاپدراوە
دەستپێ‌کردنی لەچاپدان ١/٧/١٩٨١
لێبوونەوە لەچــاپ ١٥/١١/١٩٨١

لە کتێبخانەی نیشتمانیدا ژمارە (١٥١٢)ی ساڵی ١٩٨١